# قازی محەمەد

# زەنگی ئازادی

نیگاری: بەشدار نوری


ڕوڤار

33

ڕوڤار

ڕۆژنامە - گۆڤار

بلاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە و هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوو مانگ جارێك دەریدەکات




ئەمن بە خودا بە کەلامی عەزیمی خودا بە نیشتمان بە شەرافەتی
کورد بە ئالای موقەددەسی کوردستان سویند دەخوم کە تا
ئاخر هەناسەی ژیانم و رژانی ئاخر تنوکی خوینم بە گیان
و مال لە ریی راگرتنی سەربەخویی جمهوری کوردستان
و یەکیتی کورد و ئازەربایجان موتیع و وەفادار بم

دەقی سوێندخواردنەکەی پێشەوا قازی
محەمەد لە ڕۆژی ڕاگەیاندنی کۆماردا

## بەشدار نوری فتح الله



- ساڵی 1980 لەرواندوز لەدایکبووە.
- دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی هەولێر ساڵی (2001-2002)ە.
- بەڕێوبەری بەشی پرۆژەکانە لە ڕێخراوی پیرو بۆ هونەرە جوانەکان.
- ئێستاش لەدوا قۆناغی بەشی وێنەکێشانی کولێجی هونەرە جوانەکانی زانکۆی سلێمانی.
- بەشداری خولی سێیەمی گەلەریی هەولێری کردووە.
- بەشداری لەچەندین پێشەنگای هاوبەشدا کردووە.

## ژمارەکانی ڕابردوو

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارەی ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، موحەڕەم محەمەد ئەمین، دڵدار، مەستوورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، جەلالی میرزا کەریم، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە ساڵح دیلان، هەژار، شاکیر فەتاح، عەلائەدین سەجادی، کاکەی فەلاح


سەرپەرشتی گشتی
شێرکۆ بێکەس

ڕاوێژکار
ئەکرەم قەرەداخی

سکرتێری ڕۆڤار
یاسین عومەر

سەرپەرشتیاری هونەری
قادر میرخان

مۆنتاژی کۆمپیوتەر
یادگار ئەوڕەحمان

(ڕۆڤار) بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوو مانگ جارێك دەریدەکات

سەرپەرشتیاری چاپ
فەرهاد ڕەفیق



ناونیشان
سلێمانی - فولکەی یەکگرتن
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ڕۆڤار
ت: 3120690

لە دەرەوەی وڵات
Tel: 00441628477660
Fax: 00441628486008

Web Site
www.sardam.info

Email
Sardam@sardam.info



چاپخانەی (ڕەنج)

# ژیاننامەی قازی محەمەد

محەمەد بەهادین
مەلا ساحیب



شەهید قازی محمد کوری قازی علی کوڕی میرزا قاسم کوڕی میرزا ئەحمەدە، لە ساڵی(1901)ز لە شاری مەهاباد لە دایکبووە، دایکی لەتیرەی فەیزوڵڵا بەگییە، کە ئەوانیش لە مێژەوە ناو بانگێکی گرنگیان بووە لە وڵاتی موکریاندا.

پێشەوا لە 21مارت1947 بەدەستی کۆنەپەرستانی ئێران لە مەهاباد و لەمەیدانی(چوارچرا) لە سێدارەدرا لەگەڵ هاوڕێکانی لە پێناوی ئەو بیرو باوەڕەی کە لەگەڵ خوێنیا تیکەڵ بوو، و لەسەر ئەو سوێنەی لە کاتی خۆیا خواردی، کەتا دواهەناسەی لەگەڵ خەڵکابێت.

قازی محمد پیاوێکی، کەڵەگەت، چوارشانە، وەبەخووەبوو، ریشێکی تەنکی کارەبایی هێشتبووەوە، هەمیشە زەردەخەنە بەدوو لێویەوە دیاربوو رووخۆش و لەسەرخۆو هێمن بوو، جلوبەرگێکی سادەی مەلایانەی لەبەرئەکرد، کە ئەگەر نابەڵەدێك چاوی پێبکەوتایە وای ئەزانی مەلای لادێیەکی ئەو وڵاتەیە.

هەموو علومی ئایینی تەواو کردبوو، و هەر لەسنوری ئەو علوومانەدا، نەوەستابوو، بەڵکو لەزانیاری نوێدا دەستێکی باڵاو پـــــایەیەکی بەرزی

هەبوو، و لە خوێندنەوەی پەڕاوی بێگانە درێغی نەئەکرد، تەنانەت زمانی رووسی و ئینگلیزی بە گفتوگۆ خوێندنەوە زانیوە.

لەو سەردەمەدا کە بۆ یەکەم جار قوتابخانەی تازە لە مەهاباد کراوەتەوە قازی محمد کراوە بەسەرۆکی فەرهەنگی ئەو ناوچەیە، بێ ئەوەی یارمەتی و مووچە لەمیری وەرگرێت و خەڵکی زۆر هانئەدا بۆ فێربوونی زانیاری و هەموو جۆرە هونەرێك، پیاوێکی پێشکەوتوو و دڵپاکبوو، بەرهەڵستی عەشیرەتگەری زۆر بەتوندی کردووە، بەو بۆنەیەوە زۆرجار دەرەبەگەکان دوژمنایەتیان لەگەڵا کردووە چونکە هەرگیز لایەنی رەنجبەران و جوتیارانی کوردی بەرنەداوە، گیانی دیموکراتی و نیشتمانپەروەری، کارێکی گرنگی کردبووە سەر هەست و بیروباوەڕی.

بەرەوبنەماڵەی قازی محمد هەر لەسەرەتای شەڕی جیهانی یەکەمەوە ناوبانگیان دەرکردووە لە موکریاندا، قازی محمد لەدواییدا بە هۆی چالاکی و وریایی خۆیەوە توانی ئەم دەسەڵاتە مەعنەوییەوە سەرانسەری کوردستانی ئێرانی پێبگرێتەوە، ئەم بنەماڵەیە بەلای زۆربەی کوردەکانەوە بەرێزو خۆشەویست بوون، پیاوی هەڵکەوتوو و ناوداریان زۆربووە، وەك: میرزا فەتاحی قازی کەلەپێناوی هێنانی یاسای دەستووری (مەشروط)دا زۆرتێکۆشاوە بەو بۆنەیەوە ماوەیەکی زۆر لە تاران لە زیندانا بەندکراوە، چونکە لە دژی رژێمی دکتاتۆری ئەو سەردەمە خەباتی کردووە، پێشەوا هەر لەسەر رەویەی باوك و باپیرانی بەردەوام بوو، وە ڕابوردووی خاوێنی ئەوان پاڵی پێوەنا کە زیاتر لەرێی وڵاتی کوردستان تێکوشان بکات. لە ساڵی 1938 کە "قازی عەلی" باوکی کۆچی دوایی کرد ئەرکی سەرشانی زیاتربوو و کرا بە قازی مەهاباد، لەڕاستیدا هەر چەندە بەمیرات بوو، بەڵام خۆی زۆر شایستەی ئەوپایەیە بوو، و توانی بەشێوەیەکی رێك وپێك فەرمانەکانی جێبەجێ بکات.

## نمونەیەك لە تێکۆشانی

لە پێش ئەوەدا کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان بێتە کۆڕی خەباتەوە، قازی محمد لەسییەکانی ئەم سەدەیە (ثلاثینیات)دا پەیوەندی بە (حزبی خۆیبون) ەوە هەبووە کە لەساڵی 1927 ئەم حزبە لە کوردستانی تورکیا بەهاوکاری (احسان نوری پاشا) شۆڕشیان بەرپاکرد.

هەروەها لە کاتێکدا(ژ. ك) ژمارەی ئەندامانی لە(20)کەسێك تێپەڕیان نەئەکرد، پەیوەندیان کرد بەقازی محمدەوە ئەویش بەدڵێکی خاوێن و نیازێکی ڕاستەوە چووە ریزی تێکۆشان لەگەڵیانا، پاش ماوەیەك، زۆر لە ئەندامانی دامەزرێنەرو سەرکردایەتی لە ناوچەکانی کەدا بڵاوبووتەوە، بۆ ئەوەی لەهەموو لایەك ئامانج و بەرنامەی"ژ.ك" بگەێنن بەخەڵك و ڕیشەداکوتێ.

هەروەها پەیوەندیان کرد بەکوردستانی تورکیاو عێراقەوە، بۆ ئەم مەبەستە"محمد ئەمین شەریفی" ئەندامی سەرکردایەتی کەوتە گفتوگۆ کردن لەگەڵ چەند نیشتمانپەروەرێکی کوردستانی عیراق وەکو نەتەوەیەکی سێ قۆڵی لەنێوان مەلا وەهاب نوێنەری کوردەکانی تورکیا، شێخ عەبدوالله نوێنەری کوردەکانی عێراق، قاسم قادری ئەندامی دامەزرێنەری(ژ.ك) لەسەر سنوری هەرسێ بەشی کوردستان، لە ئەنجامدا چەند بریاریارێکی گرنگیان مۆرکرد. کەبریتی بوو لەوەی دەستی یارمەتی بۆ یەکتر درێژبکەن و پەیوەندی تەواویان لەنێواندا بەهێزبێت

لەهەموو بەشەکانی کوردستاندا تا لە پاشەرۆژدا گەلی کورد ڕزگارکەن، و مافی نەتەوایەتی خۆی وەربگرێت.

هەروەها توانیان گۆڤاری(نیشتمان) یەکەم ژمارەی لە حوزیرانی 1943 بەشێوەیەکی جوان و ڕێك و پێك لەچاپ بدەن، وبڵاوی بکەنەوە، بەوجۆرە هەموو مانگێك هەموو بەرنامەو وێژەو مێژووی ڕابوردوی کوردی تیا بنووسن و بەخوێندەواری کوردی بگەێنن.

کۆمەڵی"ژ.ك" لەسەرەتاوە بەنهێنی خەباتی ئەکرد تاتوانی ئەندامانی زۆر بکات وە لەسەر بیرو باوەڕێکی ڕاست و لەپێناوی ڕزگاری کورد تێکۆشانی ئەکرد.

لە کاتێکدا ڕژێمی تاران هێشتا لەگەڵ خۆفرۆشەکان و هەندێ لە خاوەن زەوی وزارە گەورەکان دەسەڵاتیان مابوو لە بەرگریکردنی خەڵکی و قەدەغە کردنیان لە هاوکاری کردن و یارمەتیدانی کۆمەڵی "ژ.ك"، تەنانەت لەناوچەی شاروێران ئاغایەك گوێی پیاوێکی بڕیبوو چونکە وتبوی لەسەر هەموو کوردێك پێویستە بەدڵێکی خاوێنەوە بچێتە ناو کۆمەڵی "ژ.ك" بۆ ڕزگاری کوردستان لەژێر چەپۆکی داگیرکەران و کۆنە پەرستان، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو قەدەغەیە لاوان و خوێندەواران گوێیان کەربوو لە عاستی نۆکەران و دەرەبەگەکان و بەدڵێکی خاوێنەوە ئەهاتنە ڕیزی ئەندامە تێکۆشەرەکانی "ژ.ك" لەوانە دوو هاوڕێ بەناوی (شێرکۆوپیروت)، بەو نیازەوە بەرەو مەهاباد کەوتنە ڕێگا پاش ماوەیەك بەپیاوێك گەیشتن لە کۆمەڵی ژیانەوە بوو بەڕوو خۆشیەوە بەخێرهاتنی کردن، ئەوانیش وەڵامیان دایەوە و لێیان پرسی ئایا ئێمە چۆن ئەتوانین پەیوەندی بە کۆمەڵەوە بکەین تاکو شانبەشانی ئەندامەکانی پێویستی سەرشانی خۆمان جێبەجێ بکەین؟

میرزا قوتیاس وتی من ئەندامێکی کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستانم و، ئەتوانم بەئاسانی ڕێگاو شوێن بۆ ئێوە دابنێم، وائێستە منیش بۆ مەهاباد ئەڕۆم لەگەڵم وەرن، هەرسێکیان بە دڵێکی پڕ لەهیوا و ئاواتەوە کەوتنەڕێ، ئێوارە وەختە نزیکی شاربونەوە، میرزا وتی باوچانێك لەباخی قازی بدەین، تا دنیا تاریك ئەکات، پاش ئەوە ئەچین بۆ ماڵی کاك سوار کە مەردێکی تەواوەو ئەندامێکی بەرزی دڵسۆزە، و من پەیوەندیم لەگەڵ ئەوا هەیە، پاش ئەوەی دنیا تاریك بوو هەرسێکیان ڕووەو ماڵی کاك سوار دەستیـــــــان کرد بەڕۆیین، و میرزا

هەردووکیانی پێشکەش کرد، و چەند گفتوگۆیەکیان دەربارەی ڕێکخستنی ناوی نەهینیەوە درێژەپێدا لە ئەنجامدا کاک سوار وتی سبەی شەو (ئاذەر رو برا) ئەبەین بۆلای (کاک بینایی)، هەندێ لە هەڤاڵەکانی ترمان لەوێ ئەبن تابزانین چیمان بۆ دیاریئەکەن، کۆمیتەی سەرکردایەتی کۆمەڵی (ژ.ک) لە چەند هۆدەیەکی پیاوێکی دەوڵەمەندی نیشتمانپەروەردا کۆبوونەوەیان ئەکرد، کە ئەم پیاوە لە فەرمانڕەوایی ڕەزاشادا زۆرجار تووشی گیروگرفت و چەرمەسەری بووبو، و یارمەتییەکی دڵسۆزانەی کۆمەڵەی ئەداو، کەم کەس گومانی پێئەکرد، بۆسبەی شەو هەرچواریان میرزاو ئازەر وبراو کاک سوار، بەرەو جێگای کۆبوونەوەی نهێنی کاک بینایی ڕۆیشتن.

کاک سوار وتی ئێوە لەم کۆڵانەدا ڕابوەستن تامن ئەڕۆم و ئەگەڕێمەوە بۆلاتان، ئەوسا هەموومان ئەچینە ژوورەوە، پاش ئەوەی کاک سوار گەڕایەوە هەموویان ڕۆیشتن و تەقەیان لە دەرگادا، بۆیان کرایەوە، بەژێر خانێکی تاریکدا چوونە ژوورەوە، سەرکەوتن تا گەیشتنە ژوورێک، چرایەکی کزی تیاداگیرسابوو، کەسی تیانەبوو، پاش ماوەیەکی کەم پیاوێک هاتەلایان وتی شەوتانباش، کاک سواورومیرزا دەست بەجێ هەستانە سەرپێ، ئازەروبرا ئەوانیش بەچاو برین لەوان هەستان، چوونکە قازی محمدیان نەئەناسی هەرچەندە ناو بانگیان بیستبوو، کاک سوار وتی قوربان ئەو دوولاوەی باسم کردن ئەم ناوانەن، ناوی نهێنی و ئاشکرای هەردووکیانی پێووت، کاک بینایی پەردەیەکی هەڵدایەوەو لە ناوتاقێکدا نەخشەیەکی هێنایە خوارەوە و دەستی کرد بە باسکردنی خاکی کورد کە چۆن تائێستا بەبەشکراوی ماوەتەوە؟ و هۆیەکانی چییە؟ و چۆن لەداوارۆژدا ئەتوانین یەکی بخەینەوەو وڵاتێکی سەربەخۆی خاوەن سنوری لێ پێک بهێنرێت.

پاش چەند گفتوگۆیەکی تر کۆبونەوەی ئەوشەوە تەواوبوو و هەموویان هاتنە دەرەوە، هەر لەو ماوەیەدا ڕۆژێک بلاوکرایەوە کە قازی محمد لەمەیدانی چوارچرا وتارێک ئەدا، پاش ئەوەی خەڵکێکی زۆر بۆ گوێ گرتنی کۆبووەوە، کاتێ پێشەوا چووە سەر شوێنێکی بەرز، ئازەرو برا لە پیاوێکیان پرسی کەلە نزیکیانەوە وەستابوو گوێی لە وتار ئەگرت، ئەرێ براگیان وتیان قازی محمد وتار ئەدات، خۆئەوە ئەونیە ئەوە هاوڕێی ئێمەیە، ئەویش کەبۆی دەرکەوت ئەو دوو کەسە خەڵکی مەهاباد نین و نەشارەزان، وتی: بەڵێ ئەوەیە قازی محمد، کە ئەمەیان بیست لەبەر خۆیانەوە شەرم دایگرتن و سەیری یەکتریان ئەکرد، چونکە لە کاتی کۆبوونەوەدا بە گوێرەی پێویست ڕیزیان نەگرتووە بەهەر جۆربوو ئەوانیش گوێیان شلکرد تا وتارە بەنرخەکەی تەواوکرد، دوایی ئەوانیش لەگەڵ هەموو خەڵکی بلاوەیان کرد، بڕیاروابوو کەسبەی شەوێ ئەورۆژە، لەگەڵ کاک بینایی کۆبنەوە وەک جاران، بەڵام بە کاک سواریان وت، ئێمە تائەمرۆ نەمان زانیوە کە ئەوە قازی بووە، کاک سوار هاتە زمان: هەتا خوا حەز بکات خۆی بەسادە ئەگرێ، هەرکاتێ بچنەوەلای نەکەن شەرم بکەن. لەوئێوارەیەدا کەبەیەک گەیشتین لەشوێنی جاراندا، کاک بینایی دانیشتبوو ویستیان دەستی ماچ کەن، بەڵام قەدەغەی کردن وە نەیهێشت، وە فەرمووی دانیشن، کوتوپڕ کاک پیروت خۆی نەگرت وتی قوربان جەنابی قازی لێمان ببورە تا ئەو کاتەی وتارەکە نەمان ناسیویت ئەویش ئەمەی پێ ناخۆشبوو، پێی وتن ئەوە لەکەیەوە بۆ ئێوە بووم بەجەنابی قازی، مەگەر ناوی منتان لەبیرچووەتەوە من لای ئێوە ناوم کاک بیناییە نەک جەنابی قازی و بەس، تەنیا مەبەستم ئێوەنیە بەڵکو هەموو برادەرێک پێویستە ناوی نهینی بەکاربێنێ نەوەک دوژمن شارەزایی پەیداکات بەسەر ناوی ئەندامانی کۆمەڵەی(ژ.ک)، براکانم منیش وەک ئێوەم هیچم لە ئێوە زیاترنیە لەمەولا ئەگەر هەر وەک دەستە برایەکی خۆتان سەیرم نەکەن لێتان دڵگیرئەبم، ئەوسادەیی و گفتوگۆ شیرینانەی کاک بینایی پەردەی شەرمی لەرووی ئازەروبرا لابرد، لەپاشان بە درێژی باسی مێژووی کوردو چەند ئاموژگارییەکی تری بۆ کردن، بۆ بەیانی ڕۆیشتن بۆ ناوچەی"تەرگەوەر" بەفەرمانی کاک بینایی، پاش ماوەیەک ئەندامانی سەرکردایەتی هەموو بڕیاریان لەسەرئەوەدا، کە قازی محمد ببێت بەسەرۆکی کۆمەڵێ (ژ.ک)، هەر چەندە لە ئەندامانی دامەزرێنەر نەبوو، بەڵکو لەبەر دڵسوزی و زیرەکی وزمانزانی ئەویان هەڵبژارد، وەنەبێ بەهەڵەدا چووبن، چوونکە تا دوا هەناسەی لەو ڕێیەدا بە نیازێکی بێگەرد بەردەوام بوو، هەروەها زۆر لەپیاوە ئاینیەکان هاتنە ریزی تێکۆشانی کۆمەڵەوە، و زۆر لەو پیاوە ئاینیانە بەناو خەڵکا بلاویان کردەوە کە ئەوەی یارمەتی کۆمەڵە نەدات تووشی گوناە ئەبێت.

چوونکە بۆ ڕزگاری نیشتمان و کوردستان خەبات ئەکات، بەو جۆرە لە ناو ڕۆشنبیراندا ئەم بیرو باوەڕە تارادەیەک جێگیربوو و ڕیشەی داکوتا، لە تشرینی دووەمی1945ز قازی محمد لەگەڵ چەند کەسێکی تر لە ئەندامە بەرزەکان بانگکران بۆ"باکۆ" لەیەکێتی سۆڤیەت، بۆ گفتوگۆ کردن لەگەڵ نوینەرانی ئەوێ بە سەرۆکایەتی "جعفر باقروف"، پاش چەند کۆبوونەوەیەک لە نێوان هەردوولادا، چەند بڕیارێکیان مۆرکرد، لەو بڕیارانە ئەوەبوو بەپێشنیاری پێشەوا ناوی کۆمەڵی ژیانەوەی کوردستانیان بەکۆمەڵی دیموکراتی کوردستان گۆڕی، چونکە قازی محمد لەو باوەڕەدابوو کە دیموکراتیەت تێکەڵ بەبزوتنەوەو جووڵانەوەی گەلی کورد بکرێت تابەشێوەیەکی فراوان، دەرگا لە جوتیاران و کرێکاران بکرێتەوە بۆ ناو کۆڕی تێکۆشانو خەبات، و هەتا کۆمەڵە پێویستیە مێژووییەکانی سەرشانی بە



پێشەوا قازی لە کاتی وتاری ڕاگەیاندنی کۆماری کوردستان لە ڕۆژی 1945/12/16 لە مەیدانی چوارچرای مهاباد

ێوەیەکی ڕێکوپێک جێبەجێ بکات وە ،رنامەو یاسای نوێ بۆ ئەم مەبەستە ابنێت.

پاش گەڕانەوەیان ئەندامی کۆمەڵی (ژ.ك) و زۆر لە خەڵکی مەهابادو ناوچەکانی تر و هەندێ لەسەرەك هۆزەکان بانگ کران، بەو بۆنەیەوە کۆبوونەوەیەکی گەورە کرا، و هەموویان بڕیاریان لە سەرناوی تازەی کۆمەڵەدا، و قازی محمد بلاوی کردەوە، کە بەرنامەی نوێی کۆمەڵەی دیموکراتی کوردستان بەم جۆرەی خوارەوەیە کە بنچینەی کۆمارێکی دیموکراتین.

1. لەسەر کۆمەڵی دیموکرات پێویستە هەوڵ بدات و تێبکۆشێ بۆپتەوکردنی دۆستایەتی و برایەتی لەگەڵ دانیشتوانی ئازەربایجان و مەسیحەکان، تاکو هەردوولا یارمەتی یەك بدەن بۆبەرگری لەدژی چەوسێنەرانی گیانی نەتەوایەتییان.

2. هەموو توانایەك تەرخان بکەن بۆ بلاوکردنەوەی زانیاری و پارێزگاری باری ئابووری و تەندروستی.

3. پێشخستنی بازرگانی ناوخۆ، ئاڵوگۆڕکردنی لە دەرەوەی وڵات، هەروەها هێنانی کارگە و پێویستییەکانی تری وڵات.

زەویوزار دابەش کردن بەسەر جوتیاران و فێرکردنیان لەسەر تازەترین ڕێگای پەرەسەندنی کشتوکاڵ و زۆر کردنی تراکتۆرو هۆیەکانی تری پێش خستنی هەموو جۆرە چاندنێك.

4. لەسەر هەموو کوردەکانی ئێران پێویستە ئامادەبن بۆ تێکۆشان و خۆیان بخەنە ژێر فەرمانەوە بۆ دامەزراندنی کۆمارێکی خۆیی و دیموکراتی لە کوردستانی ئێراندا، و ئیشوکاری ئەم کۆمارە هەموو بەدەست خۆیانەوە بێت، و هەموو فەرمانبەرانی کوردبن.

5. زمانی کوردی ڕەسمی بێت لە وڵاتاو لە هەموو فەرمانگە و قوتابخانەکاندا و لەهەموو پۆلێکدا.

6. ئەنجوومەنی تازە هەڵبژێرن بەگوێرەی یاسای نوێ لەهەموو هەرێمەکانی کوردستاندا بۆ ئەوەی چاودێری هەموو ئیشوکاری وڵات بکات بە شێوەیەکی ڕێکوپێك.

## هەڵکردنی ئاڵای کوردستان

کۆمەڵی دیموکرات لەفەرمانەکەی خۆی دوانەئەکەوت و بە وردی ئیشوکاری خەڵکی ناوچەی جێبەجێ ئەکرد، ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر پەیوەندیان بە تارانەوە کزتر ئەبوو، لە ڕۆژی(1945/12/16) خەڵکێکی بێشومار لە مەیدانی(چوارچرا) کۆبوەوە و بەو بۆنەیەوە ئاهەنگ و زەماوەندێکی گەورەیان بەرپاکرد، کە هەمووی خۆشیوئاوات و بەختیاری بوو. لەو ڕۆژە مێژووییەدا قازی محمد بلاوی کردەوە کەلەئێستەوە وڵاتی موکریان لە ڕژێمی کۆنەپەرستی تاران جیابووەوە، ئەمەش نموونەیەکە بۆ هەموو بەشەکانی تری کوردستان وە تۆوێکە بۆ یەکگرتنی هەموو کورد بەو جۆرەوە بەدڵێکی پڕ لەهیوای تینوی سەدان ساڵەی ئەم گەلە.

ئالای ڕژێمی تاران لەسەر هەموو فەرمانگەو قوتابخانەکانەوە داگیرایە خوارەوە، و لەجێی ئەودا ئالای کوردستان هەڵکرا، ئالاکە لەسەرەوە سوور، لە ناوەڕاستا سپی لە خوارەوە سەوز لە ناوسپییەکەدا کە چوار ئەوەندەی هەریەکە لە بەشەکانی تر ئەبوو نیوکورە ڕۆژێك کە دووگوڵەگەنم لەم لاولەولایەوە بەرەنگی زەردهەبوون، وەبە سەریەوە پێنوسێك هەبوو لە سەراووردی هەموویانەوە نوسرابوو (دەوڵەتی جمهوری کوردستان)، ئەم ئالایە لەهەموو ئەو ناوچانەدا کەلەژێر دەسەلاتی کۆمەڵەو سوپای شۆڕشگێردابوون هەڵکرا، بە ئاهەنگ و وتارو هەموو خۆشیەکەوە.

لە شاری نەغەدە کاپیتان محمد قودسی لەکاتی هەڵکردنی ئەم ئالایەدا وتارێکی مێژوویی بەنرخی بەم بۆنەیەوە لەناو خەڵکێکی زۆردا خوێندەوەو، وتی گەورەکانم ئەی گەلی بەشەرەف، خۆشەویستان، ئەی کرێکارو جوتیار سەپان و پالەی بەنرخ، ڕۆژ بەسەر شورشی پیرۆزی میللی کوردا هەڵهات، ئەمڕۆ گەورەترین و پیرۆزترین ڕۆژە، بۆیە ئەبینین هەڵۆی بەهێزی کورد بە چنگی ئاسنینی خۆی ئەو ئالا پیرۆزە هەڵدەکات.

برایان پیرۆزبایی خۆم و گەلی کوردستان پێشکەش ئەکەم و پیرۆزبایی لەهەموو میللەتێکی براو ئازادیخوا ئەکەم، هەروەها وتی ئەی گەلی کورد ئەزانی ئەم ئالایە چی ئەڵێت؟

ئەڵێ رەنگی سوورم نیشانەی جەنگاوەری و نەبەزی گەلی کوردو رەنگی سپیم نیشانەی خاوێنی و دڵپاکیەتی کە میللەتێکی نەجیبە و گیانیکی راستی هەیە.

رەنگی سەوزم هاوارئەکات خاکی کوردستان پڕ لەدەغڵ و دان وزێڕو زیوە، هەروەها ئەڵێ وا رۆژی سەربەستیمان هەڵهات، دووبارە ئەی جوتیار ئەو دو گوڵە گەنمە نیشانەی تۆیە تۆش هەوڵ بدە بۆبەرهەم هێنانی بەرو بوومی وڵاتەکەت.

پێنووس هاوارئەکات بۆ پەرەسەندنی زانیاری و هەموو جۆرە خوێندەواریەك لە ناوگەلدا.

## هەڵبژاردنی قازی محمد بەسەرکۆمار

لە رۆژی22ی کانونی دووەمی1946دا، کۆبونەوەیەکی زیاتر لە 20هەزار کەسی پێکهاتبووە، دامەزرانی کوماریکی دیموکراتی لەبەشێکی گرنگی کوردستانا بلاوکرایەوە بە سەرۆکایەتی قازی محەمەد، کۆماریکی پێشکەوتوی ساوا، بۆهێنانەدی پاشەرۆژێکی روون و پڕ لەبەختیاری بۆ گەلی کورد کە ساڵەهای ساڵبوو چاوەڕێی رۆژێکی وابو، بەوجۆرە لە مەیدانی (چوارچرا)دا کە رەنگین کرابو بەئاڵای کوردستان و بەشێوەیەکی جوان رازابووەوە کە شایانی رۆژیکی مێژوویی وابێت، پێشەوا بەجلوبەرگی ژەنەراڵیەوە لە شوێنێکی بەرز کە بە تایبەتی بۆ ئەو رۆژە دروست کرابوو، و لەهەموو خەڵکەوە دیاربوو، تاقێکی رازاوە کە بەگوڵ و ئاڵای وڵاتو وێنەی سەرۆك نەخشین کرابوو، لەو شوێنەدا راوەستابوو فەرمووی (وائەمرۆ گەلی کورد توانی کۆمارێکی خۆیی پێك بهێنێت و بتوانێ وەك گەلێکی سەربەخۆ لە خاکی خۆیا بە ئازادی بژی).

هەروەها فەرمووی: بائێمەش تەکانێك بەخۆمان بدەین و دوای خوێندن و صنعەت کەوین، فەلاحەت و کشتوکاڵی وەك خەڵکی لێبکەین، و میللەتمانی پێ دەوڵەمەندکەین، کارخانان بێنین، ئەو هەموو کانگاو مەعدەنانەمان باوەدەر خەین، و بە صەنعەتی ئەوانە وڵاتی خۆمانی پێ برازێنینەوە، ئێمە چی قازانجی میللەتی کوردەی تێدایە دەبێ بیکەین، و سەعیش بکەین نەتیجەی هەوڵ و تەقەلاکەمان وابێت کەلەپێشدا رەچاومان کردووە، جا ئەگەر وا دەرچوو ئێمە وەزیفەی میللی خۆمان بەجێ گەیاندووە، و نابێ نائومێدیش ببین.) دڵی خەڵکەکە هەموو وەك گوڵ گەشایەوە بەم وتارە بە نرخە لەو رۆژە پیرۆزەدا، ئینجا محمد حسین سەیفی قازی ئەویش بەجلوبەرگی ژەنەراڵیەوە لەتەنیشت پێشەواوە راوەستاو هەڵبژاردنی قازی محمدی بەسەر کۆمار بلاوکردەوە بەرەزامەندی هەموو چینەکانی گەل، دووبارە سەرکۆمار سوپاسی هەموو خەڵکی کرد بۆ ئامادەبوون و هاتنیان بۆ ئەم ئاهەنگەو ئەویان هەڵبژاردو جێی باوەری هەموویانەو لێی دڵنیان، سەر بازانی کوردو قوتابیان نمایشیکی (استعراضی) رێکوپێکیان بەوبۆنەیەوە گێرا، لە دوای کۆتایی ئەم ئاهەنگە مێژووییە، خەڵکەکە هەموو بلاوەیان لێکرد.

پاش ئەوەی قازی محمدیان بەسەر کۆمار هەڵبژارد ئەویش کەوتە راوێژو گفتوگۆ لەناو ئەندامانی کۆمەڵی دیموکرات و هەندێ لەنیشتمانپەروەرەکانی تر، بۆ پێکهێنانی وەزارەت، و لە رۆژی 1946/2/11 وەزارەت بەم جۆرەی خوارەوە دانرا:

1. حاجی بابە شێخ سەرەك وەزیران
2. محمد حسین سیف جێگری سەرەك وەزیری بەرگری
3 مەنافی کەریمی جێگری سەرەك وەزیری پەروەدەو زانیاری.
4. محمد أمین معینی وەزیری ناوخۆ
5. عبدالرحمن ئیلخانی زادە وەزیری دەرەوە
6. محمد ئەیوبیان وەزیری تەندروستی
7. محمود وەلی زادە وەزیری کشتوکاڵ
8. خلیل خەسرەوی وەزیری کاروفەرمان
9. ئەحمد ئیلاهی وەزیری ئابوری
10. ملا حسین مەجدی وەزیری داد
11. موستەفا داودی وەزیری بازرگانی
12. صدیقی حیدری وەزیری رابەری
13. اسماعیل ئیلخانی وەزیری رێگاوبان
14. کریم ئەحمەدی وەزیری پۆستەو تەلەفون

## سوێن خواردنی

وەك لە هەمووو وڵاتیکا باوە سەرۆکی نوێ، یا هەر فەرمانڕەوایەکی بەرز پێویستە سوێن بخوات کە وەك شتێکی قانوونی و دەستوورییە، لەبەرئەوە پێشەوا فەرمانیدا بە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی ئەنجومەنی وەزیران ئەمادەبن بۆ ئەم مەبەستە، قورئانی پیرۆزو ئاڵای کوردستان بەدەست وەزیری داد مەلا حسێن مەجدیەوە بوو، پێشیان کەوت تا ژووری قازی محمد، دەست بەجێ ئەویش هەستایە سەر پێ و بەرگەکەی لابردو هەموو ئەندامان و وەزیران بەپێوە راوەستان، پێشەوا ئەم سوێنەی خوارد:(سوێن ئەخۆم بە خواو قورئانی پیرۆز، وەبە نیشتمان، شەرافەتی قەومی کوردو بە ئاڵای پڕ لە ئیفتخاری کورد، تادوا هەناسەی ژیانم وەتا دوا تنوکی خوێنم بەگیان و بەماڵ لەرێگەی مانەوەی ئازادی کورد و بەرزکردنەوەی ئەوئاڵایە، کەمایەی شانازی هەموو کوردێکە کۆشش بکەم و دوانەکەوم، و بەسەرۆکی کۆماری کوردستان و یەکگرتنی کوردو ئازەربایجان ئیفتخار ئەکەم کۆشش ئەکەم بۆ مانەوەی ئەم ئامانجە).

دوای ئەوە ئەنجومەنی وەزیران و هەموو ئەندامەکانی کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکرات بریاریاندا کە ئەوانیش بە نیازێکی خاوێن و دڵێکی پاکەوە هەموو کۆسپ و گیروگرفتێك چاسەربکەن کە لەکاتی هەڵسورانی ئیشوکاردا دێتەرێیان و هەوڵوتەقەلا بدەن بۆ بەختیاری و ئازادی نەتەوەی کورد کەدەمێکە چاوەڕێی ئەم رۆژەیە.

گرنگترین فەرمان لە سەردەمی کۆماردا


وزارت جنگ

۸۸۹/۱۶

پێکهێنان و دامەزراندنی کۆمارێکی کوردی لە ئێراندا بە سەرۆکایەتی قازی محمد، گەورەترین گۆڕانێك بوو لە مێژووی نوێی گەلی کوردا، هەڵهاتنی ڕۆژێکی روونبوو کە بەتیشکی زێڕینی ڕێگای تاریکی بۆ روون کردینەوە کە هەر چەندە ماوەیەکی زۆری نەخایاند و لە ناوبراو، بەڵام هەموو کاتێ بە یادکردنەوەی سوود وەردەگرین و هانمان ئەدا بۆ تێکۆشان بۆ پێکهێنانی کۆمارێکی دیموکراتی یەکگرتوو کە هەموو بەشەکانی کورد یەك بخات لەپاشە ڕۆژدا.

ئەم کۆمارە دەنگێکی وایدایەوە کەتەختی نۆکەران و ئیمپریالیستەکانی هێنایە لەرزینو لە ماوەیەکی کەمدا توانی بەسەرۆکایەتی قازی محمد و تێکۆشانی کۆمەڵی دیموکرات زۆر لە فەرمانەکانی سەرشانی جێبەجێ بکات وەك:-

1. پەرەدان بە پەروەردە و زانیاری لەهەموو ناوچەکەدا، پێشەوا لە سەرەتای بڵاوکردنەوەی لەدایکبوونی کۆمار قوتابخانەیەکی بەرزی بۆ کچان کردەوە لە ناو کۆڕی زەماوەندێکی گەورەو ئاهەنگێکی پڕ لە شادمانیدا، و دەست کرا بە کردنەوەی قوتابخانەی نوێ لە زۆر شوێندا، بەرنامەوپەڕتوك و پێویستی تر لە چاپدرا بۆ وتنەوەیان لەهەموو پۆلەکان، و کتێبی بێگانەیان وەرگێڕا بۆ کوردی بۆ ئەو مەبەستە، و بڕیاردرا بەنەهێشتنی نەخوێندەواری لەوڵاتا و هەموو کەس فێری خوێندن و نووسین بکرێت، بۆ یەکەم جار(50) قوتابیان نارد بۆ یەکێتی سۆڤیەت بۆ ئەوەی لەدانشگا بەرزەکان بخوێنن هەروەها دەیانی تر لە قوتابیان بۆ تەورێز بۆ خوێندن لە زۆربەی لقەکانی زانیاریدا.

2. چاپخانەیەك دانرا بۆ لە چاپ دانی پەرتوك و ڕۆژنامەو گۆڤارو هۆیەکانیی فراوانکردنی ڕۆشنبیری لەناوگەلدا لەو چاپکراوانە ڕۆژنامەی"کوردستان" بو کە بەناوی کۆمارەوە ئەینوسی، هەروەها لە لێکۆڵینەوە لە مێژوو ئەدەبی کۆنی کورد دریغی نەکرد و هانی نووسەری کوردی ئەدا بۆ لێکۆڵینەوە لەبەشە جۆربەجۆرەکانی فۆلکلۆری کورد و وێژەو زانیاریتر و بڵاوکردنەوەی.

3. ڕێکخستنی سوپای میللی بۆ بەرگری و پاراستنی وڵات لە جێی سوپای ڕژێمی کۆنەپەرست، کە لەپێش دامەزراندنی کۆماردا چەوسانەوەی نەتەوەی کورد ئەوپەڕی هیواو ئاواتی بوو.

4. دانانی حوکمی خۆیی و هەڵسوراندنی ئیشوکار، بەهۆی فەرمانبەرانی کوردەوە، هەروەها ڕەنگڕشتنی وڵات و پێوانی، و پاراستنی ئاسایش لە ناوخەڵکاو دانانی یاسایەکی نوێ بۆ ئەم مەبەستە پیرۆزانە.

5. کردنەوەی خەستەخانەو دەرمانگاو لەزۆر شوێن بەپێی توانا، هێنانی دەرمان و پێویستیەکانی تەندروستی لەدەرەوەی وڵات وەفراوان کردنی هۆیەکانی پاراستنی تەندروستی بۆ هەموو خەڵك.

6. ئێستگەیەکی نوێ بە زەماوەندێکی جەماوەری کرایەوە لە مەهابادەوە بەرنامەی کوردی و بێگانەی تیابڵاوکرایەوە.

7. پێکهێنان و ڕێکخستنی یەکیەتی لاوان و ئافرەتان بۆ ئەوەی وەك وڵاتە پێشکەوتووەکان ئافرەت شانبەشانی پیاو بتوانێ زۆر لە ئیشوکاری وڵات جیبەجێ بکات، مافی خۆی بپاریزێ، هەروەها یەکیەتی کرێکاران و جوتیاران وبنچ بەست کردنی ئیش وکاریان کەبتوانی زەوی و زار بگرنەوە ژێر دەستی خۆیان و لە چنگ دەرەبەگەکانی بسێننەوە هەروەها فراوان کردنی ئیشوکار بۆ زەحمەت کێشان و ڕەنجبەران، ئەم هەموو ڕێکخراوانە تێئەکۆشان بۆ چەسپاندنی دیموکراتیەت و بەختیاری بۆگەلەکەیان.

8. لیژنەیەکی تایبەتی دانرا بۆ چارەسەرکردنی کشتوکاڵ و دابەشکردنی زەویوزار بە جۆرێکی یەکسان لە ناو جوتیاراندا کە لە ئەنجامدا بوو بەهۆی بزوتنەوەیەك لەناو جوتیاراندا، و هەندێ لە خاوەن زەویوزارەکان بەمە دڵگران بوون وە خۆیان خستەباوەشی دوژمنەوەو لە مێژوودا رویان ڕەش بوو، و لە تۆماری خۆفرۆشاندا ناوی خۆیان نوسی.

9. پتەوکردنی پەیوەندی دوستایەتی لەنێوان کۆماری دیموکراتی کوردستان و یەکیەتی سۆڤیەت هەروەها لەگەڵ کۆماری ئازەربایجاندا.

10. هاوبەشی گەشەپێدان (شرکەتی ترقی) مۆرکرا لە نێوان سۆڤیەت و کوردستاندا بۆ ئاڵوگۆڕکردنی کەلوپەل و پێویستی ژیان بۆ یەك، وەك ناردنی تووتن و بەرهەمە دەستیەکانی وڵات بەرامبەر بە تراکتۆرو دەرمان و پێویستی تر، هەروەها کارخانەی سیغاری کوردستان لەمەهاباد دامەزرا.

11. پاراستنی سەربەستی بیروباوەڕ بەبێ گوێدان بەرەگەزو ئایین و زمان لە وڵاتاو، پتەو کردنی برایەتیویەکبوون لە ناویاندا بەهۆی ڕێکخراوە گەلیەکانەوە بۆ پاراستنی دەسکەوتەکانی گەلی کورد.

12. هاوکاری کردن لەگەڵ کۆماری ئازەربایجان بەتایبەتی لەگەڵ سوپاو ریکخراوەکانی هەردووکۆمار.

هەروەها بێگانەکان لە کاتی سەردانیان بۆ ئەم وڵاتە بۆ سەیر کردنی چۆنیەتی کۆماری ساوای کورد، وردئەبوونەوەو سەرنجیان ئەدا کە هەنگاوی پێشکەوتوو ئەنێ بۆ پێشەوە لە هەموو روویەکی ژیان و کۆمەڵایەتییەوە و فەرمانبەرانی کورد ئیشو کاریان بەرێکوپێکی هەڵئەسووڕێنن و بەڕێوەئەبەن.

(ئارفی رۆزفێڵد) لە ژێر ناوی (کۆماری مەهاباد) نوسیویەتی: شاری مەهاباد لە پێشەوە نموونەیەکی دیهاتی هەبوو وەدواکەوتو پەستبوو، بەڵام ئەمرۆ جولآن و پێشکەوتنێکی تری هەیە، کەپڕە لە ژیان و بەختیاری و زۆر بەگەرمی هەوڵ ئەدەن بۆ ئەوەی بنچینەیەکی پەروەردەی بەهێز دابنێن، بە پێچەوانەی بەشەکانی تری ئێران و ئازەربایجان.

کوردستان ڕووسی تیا نییە کە دەستیان لە ئیشو کاردا هەبێت، لە ئازەربایجان حوکمێکی توندوتیژ بەرپایە، لە کوردستان ئەمە نیە، لەم وڵاتەدا بەندکراوی سیاسی نیە تەنیا یەکدوو کەسیك لەناوبرا ئەویش دوورنیە لەسەر سیاسەت بوو بێت، وەچەند کەسێکی کەم حەزیان بەرژێمی تازە نەکردووە پەنایان بەکار بەدەستانی ئێران بردوە و لەتاراندا ئەژین چونکە بەچارەسەر کردنی کشتوکاڵ ودابەش کردنی زەوی وزار، رازی نەبوون.

لەسەر شەقامەکانی(مەهاباد) ئەتوانیت بەسەربەستی گوێ لەرادێوی ئەنقەرەو هەموو شوێنێك بگرێت، بەڵام لە تەورێز کە پایتەختی ئازەربایجانە گوێ گرتن لەمانە ئەبێ بەهۆی توش بونی خاوەنەکەی بۆ ســـزایەکی توند، ئەم ســــەربەستیەش ئەگەڕێتەوە بۆ بیری وردی پێشکەوتووی کورد لەگیانی ئازادی و نیشتمانپەروەری (قازی محمد) و ئەندامانی وەزارەتەکەی، لەمانەوە بۆمان روون ئەبێتەوە کە ئەم کومارە تا چ رادەیەك خۆشەویست بووە لای کوردەکان و، ئەم ماوەیە بەدەورێکی زێڕین دائەنرا چوونکە بێ دادی و ستەمکاری زۆریان چەشتبو لەپێش کۆماردا، قازی محمد لەگەڵ پەیامنێری "ئەی، ئی، پی" لە رۆژی1946/1/16کەوتە گفتوگۆ وتی کوردەکان بەوەش قایل ئەبن ئەگەر کاربەدەستانی ئێران بڕیاری ئەوە بدەن لەسەر دیموکراتی ئازم بڕۆن بەڕێوەو سەربەستی قەدەغەنەکەن، و ئەو دەستورەی بۆ کوردستان دانراوە لەسەری بڕۆن کەئێستا بەرپایە لە کوردستاندا بۆسەربەخۆیی زاتی، و بەڕێوەبردنی کاروباری کوردستان لەلایەن محویانەوە لەگەڵ هێزی سوپای خریان، پەیامنێرەکە لێی پرسی ئایا لەوە سڵ ناکەیت کە ئەم بەرامبەری و ناکۆکییە لە نێوان کوردو کاربەدەستی مەرکەزی ئێران ببێتە هۆی ئەوەی بێگانە دەست بخاتە ئیشوکارتانەوە؟

پێشەوا وەڵامی دایەوە، باری کوردستان زۆر جیاوازی هەیە لەگەڵ باری ئازەربایجاندا چونکە کوردستان لەلایەن هیزی سوپای سۆڤیەتەوە داگیرنەکراوە، هەر لەو کاتەوە ڕەزاخان لە سەر حوکم نەماوە نەژەندرمەو نەئەمنییەو نەهێزی سوپایی نەیتوانیوە بێتە کوردستانەوە و پێ بڕی ئەم ناوە بوە لەبەر ئەوە ئێمە لەم کاتەوە هەر بەسەربەخۆیی ژیاوین، لەگەڵ ئەوەدا نایەڵین بێگانە دەستبخاتە ناونیش و کارمانەوە، لەهیچ روویەکەوە، کەوابو باری ئێستای کوردستان پەیوەندی بەناوخۆی وڵاتەوە هەیە، پێویستە لە ناو کاربەدەستانی کوردستانو ئێراندا جێبەجێ بکرێت و نەمێنێ، چونکە ئەم گیروگرفتە پەیوەندی بە دەرەوە نییە، دوای ئەوە قازی محمد روونی کردەوە بۆ پەیامنێرەکە کە گەلێ کورد لە رابوردووەوە هەتا ئێستە چ خەباتێکی خوێناوی کردووە بۆ رزگاربوونی لەدەست چەوسێنەران وە چەند سزاو ئازاریان لەم رێگەدا چەشتوەو چەند قوربانیان داوە لەم ڕێیەدا، و چۆن لە کۆتایی شەڕی جیهانی یەکەمدا بڕیار درا کە کورد دەوڵەتێك بۆ خۆی پێکبهێنێ و لە پەیمانی"سیڤەردا" بڕیاری لەسەردراو لە ئەنجامدا نەیانهێشت بێتەدی بەهۆی کۆنەپەرستان وداگیرکەرانەوە.

بەڵام ئەمڕۆ ئێمە بەشانازیەوە داوای هەقی خۆمان ئەکەین، و هەموو توانای خۆمان لەم رێگەدا ئەخەینەکار بۆ ئەوەی سەربەخۆییەکی زاتیمان هەبێت لە خاکی خۆماندا، و چەوتیو ئەرکی ئەم گیروگرفتە هەمووی ئەکەوێتە سەرشانی کاربەدەستانی رژێمی ئێران کە تائێستا هیچ هەنگاوێکیان لەم رووەوە بۆ پێشەوە نەناوە و ئاوڕیان لە مافی نەتەوایەتیمان نەداوەتەوە، و ئێمە زۆر بەگەرمی و دڵسۆزیەوە، و بەهیوایەکی بەتینەوە چاومان بڕیوەتە هەموو رێگایەکی پێشکەوتوو بۆ سەرکەوتن لەم مەبەستە پیرۆزەدا، و نامانەوێ لاسایی یەکێتی سۆڤێت یا ئەمەریکا بکەینەوە.

لەگەڵ ئەوەدا دەرگا لەسەر خۆمان داناخەین و پەیوەندیو دۆستایەتیمان لەگەڵ وڵاتە پێشکەوتووەکان بەهێز ئەکەین، بەپێی بەرژەوەندی گەل و نیشتمان، بەبێ جیاوازی تابەم بۆنەیەوە باری ئابووری وڵاتمان پەرەپێ بدەین، بتوانین هەموو ئیشوکارێکی خۆمان بەرێکوپێکی هەڵسوڕێنین.

## سەرچاوە

قازی محەمەد، نووسینی: محەمەد بەهادین مەلا ساحیب، سلێمانی، 1972.

# هۆز یان نەتەوە؟

## کۆماری مەهاباد

دیڤید ماکداول

## مێژووی هاوچەرخی کورد

ئەبوبەکر خۆشناو



بەرگی دووەم

### پێشەکی

هەستی نەتەوایەتی بنیاتنراو لەسەر نەتەوایەتی یەکەمین جار لە ئێران بواری دەرکەوتن و دەربڕینی پەیداکردو ئەوەی مایەی سەرسوڕمانیشە دانیشتوانە کوردەکەی، لەدانیشتوانی کوردی وڵاتانی عێراق و تورکیا لاوازتر بوو، ئەم بۆشاییەی دەسەڵات دەرەنجامی شەڕی جیهانیی دووەم بوو کە هەلومەرجێکی وای خوڵقاند تیایدا ئەم بیرە توانی ڕەگ دابکوتێ. حکومەتی ئێران بەشێوە کۆماری مەهابادی تێکشکاند، بەڵام لەواقیعدا ڕێگری سەرکەوتنی مەهاباد وەک دەرکەوتەی ناسیۆنالیزمی بنیاتنراو لەسەر نەتەوە کە دەرەنجامی کولتووری هۆزایەتی بوو، بەردەوام بەسەر مەسەلەی کورددا زاڵ بوو.

### ڕێگا بەرەو مەهاباد

شەڕی جیهانیی دووەم، هەروەک شەڕی جیهانی یەکەم لەمێژووی کورد دا بەخاڵێکی وەرگۆڕان دەژمێردرێ. ئەم مەسەلەیە، هەندێکی بەهۆی خودی شەڕەوە بوو. بەریتانیا و یەکێتیی سۆڤیەت لە ئابی 1941 ڕۆژئاوای ئێرانیان داگیرکرد و ڕەزاشای هەواداری ئەڵمانیایان ناچارکرد واز لە پاشایەتی بهێنێ و وڵات بەجێ بهێڵێ و کوڕەکەی-محەمەد ڕەزایان لە شوێنی ئەو لەسەر تەخت دانا. ناوەندی ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی بەریتانیا کەدەیویست بەرگری لەلای ڕۆژهەڵاتی عێراق بکا، کرماشان بوو، ڕووسەکان زۆربەی ناوچەکانی ئازەربایجانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایان تاخوارووی ئەوخەتەی لە شنۆوە دەگەیشتە مەهاباد، داگیرکرد، ناوچەی نێوان مەهاباد و سەقز هەرچەندە لە ناو قەڵەمڕەوی سۆڤیەتدا بوو، بەڵام لەدەرەوەی چاودێرییە تایبەتییەکەیدا بوو. لە قەڵەمڕەو و حوکم و نفووزی بەریتانیادا، ناوچەی خوارووی سنە لە دەرەوەی کۆنترۆڵی کاریگەری هێزەکانی دەوڵەتی ئێران بوو کە بەرەزامەندی ئینگلیزەکان، لەوێ مابوونەوە. ئەم(ناوچە چۆڵە)ی کە ببوە ناوچەیەکی ململانێی هێزە ناوخۆییەکان و دەوڵەتی لاوازی ئێران، بواری پێویستی بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی خودموختار دەرەخساند هاوپەیمانان هەریەکەی نیگەرانی و مەیل و پەیوەندی تایبەتی خۆیان هەبوو: یەکێتیی سۆڤیەت کەدەیویست هەردوولای هێزەکانی خۆی لە ئازەربایجان بپارێزێ، پێی خۆش بوو کوردەکان زۆرتر کاروبارەکانی خۆیان بەڕێوە ببەن و کەمتر چاویان لە تاران بێ، بەڵام ئەم ئارەزووە بۆ ڕاکێشانی مەیلی کوردەکان بۆ جێبەجێ کردنی کارێکی‌وا بێگومان بەخراپ لێکدەدرایەوە. ئەم مەسەلەیەش زۆر زوو ڕوویدا. بەریتانیا مامەڵەیەکی جودای کرد. ئەوئاگاداری ئەو گرفتانە بوو کە حکومەت لەگەڵ هۆزەکاندا هەیبوو، بێجگە لە (سنووری ڕۆژئاوا)ی هیندستان، لەمیزۆپۆتۆمیاش ئەزموونگەلێکی زۆری هەبوو. شتێ کە نەیدەویست ئەوە بوو کە هۆزەکانی کورد پێڵەقەیەک لە تابعیەتی ئێران بدەن و شێوەیەک لە خودموختاری یان سەربەخۆیی ڕابگەیەنن وایەستەی عەسکەری بەریتانیا لە تاران دەیگوت: "ئەگەر کوردەکانی ئێران بەپشتگیری ئێمە بگەنە خودموختارییەکی ناوخۆیی، ئەو دەم عەرەبەکانی خوزستان- و خوا دەزانێ چ گرووپێکی دیکەش... هەموو دەیانەوێ" لە هەمووی خراپتر، شتێکی لەم جۆرە دەبووە سەرمەشقێکی کارەساتبار بۆ هۆزەکانی عێراق و نەتەوەپەروەرە ئاژاوەگێڕەکانی سلێمانی و کەرکووک. سەرەنجام، بەریتانیا زۆرباش ئاگاداری ئەم خاڵەش بوو کە تورکیا، بەمەیلی ئەڵمانیا، زۆر لەوە دەترسا کە هاوپەیمانان کوردەکان بۆ خودموختاری هان بدەن و ئەم مەسەلەیە ببێتەهۆی نائارامی و کوردستانی تورکیاش بۆ یاخی بوون بوروژێنێ.

لەبەر هەندێ بەریتانیا دەیویست دەسەڵات و ڕژێمی ئێران بەو شێوەیەی کە هەبوو، بەڵام بێ توندوتیژی ڕەزاشا، بپارێزێ و تارانی ڕاسپارد داخوازییە ڕەواکانی کوردەکان جێبەجێ بکا و موڵکە دەست بەسەرداگیراوەکانی سەرۆک هۆزەکان ئەوانەی تاپۆیان هەیە، بگێڕێتەوە و یارمەتی ئەو هۆزانەش بدا کە حەزدەکەن نیشتەجێ بن و مادام کۆچ و کۆچبار ئارامی ناشێوێنێ، ڕێگایان لێنەگرێ و

ئەولێپرسراو و کارمەندانەی لەدەیەی رابردوودا، دەستەلاتی خۆیان خراپ بەکارهێناوە، بخاتە بەردەم لێپرسینەوەی یاسایی‌یەوە.

نیشاندانی خۆشەویستی بەریتانیا بۆ کوردەکان هەڵبەتەکارێکی زۆرباش بوو، بەلام ئەمە، زەنگی مەترسی لە تاران لێدا. لەبەرئەوەی هاوپەیمانان رایان دەگەیاند کە لەرێگەی دیموکراسی و دژی دیکتاتۆری و لەپێناو داکۆکی لە بێ هێزەکان لەبەرامبەر بەهێزەکان و لەدژی بیرە تێکدەرەکانی دیکە تێدەکۆشن و شەڕدەکەن، بۆیە بۆئەوانەی لەتاران بوون، ئەم گریمانەیە ئاسان بوو کە ئێران جارێکی دیکە دەگەڕێتەوە ناوبارودۆخی(ملوك ئەلتەوایفی) سەردەمی پێشوو. لەواقیعدا، هەر لە یەکەمین حەفتەی وازهێنانی رەزاشا لەشایەتی، ئاژاوە لە ولات دەستی پێکرد. بەلام کاتێ ئاژاوە لە ئازەربایجانی رۆژئاوا بەرپابوو، رووسەکان رێگای هێزەکانی ئێرانیان نەدا بچنە ئەوێ. ئەوجارانەش کە مۆڵەتیان دەدا، واپێدەچێ بەو مەبەستە بووبێ بەکاری ناخۆش ئەمما پێویستی ئەم هێزانە، نەفرەتی خەڵکی ناوچەکە بوروژێنێ.

لەبەشەکانی خواروی ناوچەکە، بارودۆخ باشتربوو، بەلام بوونی ئینگلیزەکان خۆی هۆکارێکی رێگربو. تاران پێشوازی لەو پێشوازیو پشتیوانییە دەکرد کە ئینگلیزەکان لە ناوچەی کرماشان لەحوکمو نفوزی دەوڵەتی ناوەندییان دەکرد، بەلام لەهەمان کاتدا هەستیان دەکرد ئینگلیزەکان بەهەڵە چاوەڕانن و پێشبینی دەکەن دەوڵەت لەگەڵ چەند هۆزێکی سەرکەش و کەللەڕەق لەباتی چەك، بەدەستکێشی سپی ڕووبەڕووبێتەوە. سەربار، بێجگە لە قسەی جوان، خودی بوونی ئینگلیزەکان و بینینی ئەمەی کە ئەوە خودی تاران نییە، بەڵکو ئەوانن سیاسەتی ناوچەکە بەڕێوەدەبەن، یارمەتی‌یەك نەبوو بۆ دەسەلات و حوکمی حکومەت. سەرەنجام، ئەو بیروڕا نارەحەتکەرە، بەلام بەردەوامە لەناو کوردان هەبوو کە بەهەرحاڵ لەوانەیە ئینگلیزەکان یارمەتی وەدیهاتنی ئارەزوە نەتەوایەتی‌یەکانیان بدەن. ژمارەیەك ڕێبەری ناوخۆیی و هۆزایەتی پێوەندیان لەگەڵدا دروست کرد.

تاران ئەوەندە نیگەرانی جودایی کوردستان و ئارەزووی رێگا لێگرتنی بوو، لەتشرینی دووەمی1941دا لیژنەیەکی دەوڵەتی بۆ ناوچەکە نارد. ئەم لیژنەیە لەمەهاباد ژمارەیەك سەرۆك هۆزی ئەوێی کۆکردەوە و گفتی پێدان کە هەرکاتێ قبوول بکەن دەزگای ئیداری دەوڵەت بۆناوچەکە بگەڕێتەوە، دەوڵەت هیچ پێی ناخۆش نیە چەکی خۆیان هەبێ و جل وبەرگی کوردیش بپۆشن. ئەمە ئیمتیازێك نەبوو، لەکەوتنی رەزاشا بەدواوە ئەم خەڵکە هەم چەکدار بوون و هەم جلوبەرگی کوردیشیان دەکردەبەر. لەبەر هەندێ ئەم پێشنیارە رەت کرایەوە. سەرۆکەکان داواکاری ئەمە بوون کە لەمەڕ موڵکە دەست بەسەردا گیراوەکان و لەمەش گرنگتر دامەزراندنی خۆیان یان نوێنەرانیان لە دەزگای دەوڵەتی تاران، چەند زامنێکیان پێ بدرێ. هەشت مانگ دوای ئەوە، لە حوزیرانی1942، کۆمیسۆنێك بۆ لێپرسینەوە لە شکایەت لەمەڕ موڵك و ماڵی کوردەکان و هەڵبژاردنی فەرمانڕەوایانی ناوخۆ لەباتی ئەفسەرانی سوپا، پێکهات لەم میانەدا پێش ئەوەی هاوپەیمانان بواریان بۆهەڵکەوێ سیستمێکی تازە بخولقێنن، سەرۆك هۆزەکان خۆشحاڵ بە ڕزگاربوون لە کۆتی رژێمە سەرسەختەکەی رەزاشا، بڕیاریاندا بارودۆخی بەرلە رەزاشا بگێڕنەوە. هۆزەکان، پێشهاتنی هێزەکانی سوپای سۆڤیەت بۆ ورمێ، جارێکی دیکە شاریان تالان کردبوو، و سوودتاندبویان و بڕێکی زۆری ئەوچەك وتفاقەیان دەست کەوت کە لە سەربازە هەلاتوەکانی سوپا بەجێ مابوو، چوونە شاخ لە خوارو، واتە لە سنە و کرماشان، هۆزەکانی دەوروبەر بەخێرایی ئاگری ئاژاوەیان لەلادێکان هەڵگیرساند و دەستیان کرد بەتالان کردنی خەڵکیو هێرش کردن بۆسەر گوندەکانی(دوژمن)، لە کۆتایی ساڵ، کوردەکانت دەبینی کە هەتا لە تەورێز بە جل وبەرگی نەتەوەیی و تەواو چەکدار لە جادەکانی شاردا خۆیان دەنواند.

لە ورمێ پەیوەندی ئازەرەکان لەگەڵ کورد و مەسیحییەکان گرژبوو، لە کانوونی دووەمی1942دا کۆمەڵێك لە کورد وئەرمەن و ئاشوورییەکان حزبێکیان بەناوی(ئازادی) دامەزراند کە کەوتە تالان کردنی گوندە ئازەرنیشینەکان لەمانگی نیسان بەکاری حکومەت لە چەکدارکردنی گوندە شیعە مەزهەبەکان، ئاژاوەی هۆزایەتی دەستی پێکردەوە زیاتر لە2000 جووتیار ماڵوحاڵی خۆیان بەجێهێشت هۆزەکان ئەو دەمە ئارام بونەوە کاتێ حکومەت بەبردنەدەرەوەی هێزەکانی جەندرمە لە ناوچەی نێوان خوی و مەهاباد، رازیبوو.

لەکوردستانی ناوەندی حەمە رەشید خان، بانەی گرت و دەزگای ئیداری خۆی تێدا جێگیرکرد، حەمەرەشید لەماوەی شەڕی یەکەمی جیهانیدا فەرمانڕەوای بانەبوو، لە کانوونی یەکەمی1941دا هەڕەشەی دەکرد کە سنە داگیردەکا و تەنیا ئاگادارکردنەوەی ئینگلیزەکان لەوەی ئەگەر کارێکی وابکا، رووبەرووی هێزەکانی ئینگلیزدەبێتەوە، ئەو بیرەی لە زەین دەرکرد لە مانگی شوبات تفەنگچییەکانی ئەو، سەقزیان گرت، بەلام لە مانگی نیسان لەشار دەرکران لەگەڵ هەندێش، هەتا دەرگا و پەنجەرە و تێلی کارەباشیان لەگەڵ خۆیان برد.

لە سەرەتای پایزی1943 حەمەرەشید کە سەرەتا هەرجۆرە پەیوەندییەکی بە تاران ڕەتدەکردەوە، قبوڵی کرد وەك کاربەدەست خزمەتی ناوچەکە بکا، بەلام هەروەك (نورکهارت)ی کۆنسوڵی ئینگلیز راپۆرتیدا"ئەگەر هەر لایەنێك لە هەردوولا (دەوڵەتی ئێران یان حەمەرەشید) ئاسۆیەکی سەرنجراکێشتری لەبەردەمی خۆیدا دەبینی، لە پێشێل کردنی ئەم پەیوەندییانە دوودڵی نەدەکرد" لەساڵی دواتردا، واتە لە ساڵی1944 ئەو دەمە هات، مەحمود خانی کانی سانان لە تشرینی یەکەمی1941کرابووە فەرمانڕەوای مەریوان، حەمە ڕەشید دژی بووەو بۆ لەسەرکار لادانی هەڵمەتی کردەسەر مەریوان و هێزەکانی ئێران بە هاواری مەحمود خانەوە هاتن و حەمە ڕەشیدیان بۆ عێراق



ڕاونا، بەڵام حەمەڕەشید پێش ئەوەی بەرەو عێراق ڕابکا، نزیکەی هەر هەزار ماڵەکەی شاری بانەی سووتاند، هێزەکانی دەوڵەت کاتێ دەستیان لە مەسەلەی حەمەڕەشید بەتاڵبوو، یەخەی مەحموود خانیشیان گرت و ئەویشیان بۆ عیراق ڕاونا.

تا تەموزی 1942 تاران بەکردەوە هەموو سەرۆك هۆزە کوردییەکانی لە ئێران ئازاد کردبوو، و ئاساییبوو ئەوانەی لە حکومەتی ڕەزاشادا ستەمیان لێکرابوو داوای قەرەبوو بکەنەوە، ئەم قەرەبووەیان بۆ ئەو موڵکانە بوو کە لێیان وەرگیرابوو، یان بەهۆی ئەو باروپێگەیە بووە کە لەدەستیان دابوو، بەسەرهاتی عەباسی قوبادیان، ئەوەی داودخانی کەڵهوڕ بەباشی وەدەریدەخا کە موڵکدارەکان بە چ شێوەیەك خوویان بەو بارودۆخەوە گرتبوو کە ڕەزاشا خوڵقاندبووی. دوای مردنی داودخان لە ساڵی1912، ململانێ لەسەر جێگاکەی ئەو، لە نێوان سلێمانی کوڕی و عەباسی کوڕەزای (برازای سلێمان) دروست ببوو، هەردووکیان گەنج و بێئەزموون بوون، بەڵام سلێمان لەبەرئەوەی چەند پشتیوانێکی بەهێزی هەبوو، بووە سەرۆك بەڵام ئەو ترسەی لە برازاکەی هەبوو، باروپێگەکەی لەناو کەڵهوڕان لاواز دەکرد.

عەباس وەك ئەوانەی پێشتر ئیدیعای سەرۆکایەتی یان دەکرد لە کرماشان دەژیا و لەوێ ئاژاوەی بۆ مامی دەخوڵقاند، کاتێ سلێمان لە ساڵی1922 لە شەڕێکی ناوخۆی بنەماڵەکەیاندا کوژرا، عەباس خۆی بێگوناح ڕاگەیاند و بەوەش زۆرترین قازانجی کردو بووە ئێلخان و

یەکێك لە گەورەترین موڵکدارانی ناوچەکە. سەرۆکایەتی‌یەکەی زۆری ئەخایاند ئەویش، وەك گەلێ سەرۆکی دیکەی هۆزەکان لە ساڵی 1920 ناچارکرا لە تاران نیشتەجێ بێ و تا ساڵی 1941 نەیتوانی بگەڕێتەوە کرماشان لەو ماوەیەی لەوێ نەبوو، ئەفسەرێکی سوپا بەهاوکاری عەلی ئاغای ئەعزەمی کە خۆی کەڵهوڕبوو، و لەلایەن رەزا شاوە بەناو وەك سەرۆکی کەڵهوڕەکان دانرابوو، کاروباری کەڵهوڕەکانی بەڕێوە دەبرد.

عەباس بە پێشنیارو یارمەتی بۆ گێڕانەوەی حوکمی دەوڵەت و دابین کردنی وەفاداری هۆز و کۆکردنەوەی چەك، مۆڵەتی وەرگرت لە تارانەوە بگەڕێتەوە کرماشان، بەئومێدی ئەوەبوو لەچاکەی ئەم خزمەتانەدا بەرەسمی بەکردەوە بکرێتەوە بەسەرۆکی هۆز، ناچاربوو کەمێك لە چاوەڕوانی‌یەکانی دابشکێنێ، چونکە پێویستی بەهاوکاری لکی رکابەر، واتە داودییەکان (نەوەکانی سلێمان) هەبوو. ساڵی دواتر، کاتێ عەلی ئاغا ئەعزەمی کوژرا، عەباس دیسان خۆی بی گوناح راگەیاند، ئەگەرچی کورەکەی عەلی ئاغا کرایە حوکمرانی گەیلانی رۆژئاوا و عەباسیش کرایە فەرمانڕەوای شائاباد کە گرنگتربوو، هەرزوو کەوتەخۆخزم و کەسەکانی خۆی لە پلە و پێگە گرنگەکان دانا.

لە ساڵی1943 بەیارمەتی ئینگلیزەکان وەك یەکێك لە چوار نوێنەری کرماشان بۆ نوێنەرایەتی ئەنجومەن هەڵبژێردراو، سوودی لەم پلە و پێگەیەی خۆی وەرگرت و بووە ئەندامی کۆمیسیۆنی هۆزەکانی ئەنجومەن کە بەمەبەستی گێڕانەوەی موڵکە دەست بەسەرداگیراوەکان بۆ خاوەنەکانیان دامەزرابوو، شتێکی ئاساییە لە بایەخ بەخۆدان، خۆی دوانەخست، چونکە لەسەر ئەوە سووربوو ئەو موڵك و بار وپێگەیەی پێش ساڵی1926 هەیبوو، وەدەستبخاتەوە ئەم مەسەلەیە، بیانووێکیشی پێدا کەبەو هۆیەوە بتوانێ رکابەرە کەڵهوڕەکانی لە مەیدانی ململانێ وەدەرنێ.

عەباس بەتەنیا نەبوو لەو سەردەمەدا گەلێ سەرۆك هۆز زۆر بەپەرۆشەوە هەوڵیان دەدا دەستەڵات و نفوزی خۆیان بخەنە ناو دەزگاکانی حکومەت و خزم و کەسەکانیان لە پلەوپێگەی گرنگ دامەزرێنن و لەم رێگایەدا بەپێی توانا دەستەڵاتی تەواوی ناوچەکەی خۆیان بەدەستەوە بگرن. عەباس لە بەرامبەر دامەزراندنی خەسرەوی برای بە فەرمانڕەوای شائاباد، ئیمتیازێکی باشی دەستکەوت ئەم پێگەیە پێش ئەوەی بچێتە ناو ئەنجومەن، هی خۆی بوو ئەم مەسەلەیەش چاوەدێری تەواوی ئەوی بەسەر کەڵهوڕەکان و زاڵبوونی بێنەم لاو ئەولای ئەوێ بەسەر ئەعزەمی یە تازە دەرکەوتووەکان، دابین کرد. خەسرەویش سوودی لە ئامادەنەبوونی ئوستاندار وەرگرت و هێزەکانی دەوڵەتی بۆ(چەك کردنی کەڵهوڕەکان) بۆ سەر گوندەکانی ئەعزەمییەکان برد لە مانگی تشرینی یەکەم، عەباس دەیویست(کەریم خانی داودیانی مامی،(برای سلێمان) لە قەسری شیرین بکاتە فەرمانڕەوا و ئەمەش کارێك بوو ئەگەر سەری گرتبا، نیوەی ئوستانی کرماشانی دەخستە ژێر دەسەلات و نفوزی عەباسخان.

تاران کەم کەم ترسی لێنیشت لەگەڵ هاتنە سەرکاری حکومەتی تازە، خەسرەو لە فەرمانڕەوایی شائاباد لادرا کاتێ مەهاباد خودموختاری خۆی راگەیاند، عەباس(یەکێتی هۆزەکانی رۆژئاوا)ی دامەزراند، رەنگە بەو مەبەستەی سەر بەحکومەتی مەهاباد کەچ بکا. بەڵام تاران زۆرتر لەو هێز و دەستەڵاتە دەترسا کە [illegible] یەکێتی‌یە بە عەباس دەبەخشی و دەسبەجێ فەرمانی هەڵوەشانەوەی دەرکرد عەباس لە تارانەوە بانگ کرا و بەتووندی ئاگادارکرایەوە کە دەبێ رادەیەك بۆ بەرزفڕییەکانی خۆی دابنێ.

لەبەشی سەرووتری ناوچەکەش، رووداوی لەم جۆرە دەقەومان ئەو سێ نوێنەرەی بۆ سنە هەڵبژێردران، هەموویان لە موڵکدارەکان و داخوازی دەستەڵات بوون. لەناوچەی نێوان مەهاباد و بۆکان عەلی ئاغا ئەمیر ئەسعەد، رێبەری لاوازی(دەبۆکری)یش هەوڵی دەدا لە لێپرسراوانی حکومەت نزیك بێتەوە ئەویش وەك عەباسی قوبادیان پێشنیاری کرد هێزێکی سوارە بۆ پاراستنی ئاسایش لە ناوچەکە پێك بهێنێ و وەك نوێنەری ناوەند لەگەڵ حەمەرەشید دانوسان بکا. ئەو وەك فەرمانڕەوای مەهابادو مۆڵەتدراوی بەکارهێنانی300چەکدار گەڕایەوە ناوچەکە بەڵام بۆ بەکارهێنانی ئەم بارودۆخە، ئەزموونێکی تەواو و هاوپەیمانێکی واشی نەبوو حەمەرەشید بە توورەییەوە هەڕەشەی کرد کە(سمێڵی دەتاشێ) لەبەرئەوەی عەلی ئاغا نەیتوانی یارمەتی دارایی دەوڵەت بەشێوەیەکی دادپەروەرانە بەسەر سەرۆك هۆزەکاندا دابەش بکات، ئەم مەسەلەیە بووە مایەی دووبەرەکی لەنێوان خۆی و سەرۆکەکانی مامەش و مەنگوڕ و براکانیشی کە پێشتر ساردییەکیان لە نێواندا دروست ببوو، زۆرتری لێدوورکەوتنەوە و سەرەنجام ئەمانە دەستیان خستە ناودەستی یەکتر و لە مەهاباد وەدەریان نا.

جێگای سەرسوورمان نییە، ئەگەر سەرۆکەکان وێڕای ئەوەی بەردەوام لەگەڵ یەکتر لە ململانێ دابوون و بە تاران دڵخۆش نەبوون، بەهەمان تووندی و دڵڕەقی حکومەت خەڵکی هۆزەکانیان دەپلیشاندەوە ئەو سەرۆکانەی گەڕابوونەوە ناوچەکەیان دەبوایە هۆکاری دەستەڵات لە هۆزەکانی خۆیان دابین بکەن، یان دەبوو هۆزە دراوسێکانیان بە تاڵان بردبا، لە روانگەی ئەفسەرێکی سیاسی بەریتانیا تەنیا کوێخاکان بوون کە نرخی پاراستنیان هەبوو، ئەویش بەو بەڵگە سادەیەی کە بەپێچەوانەی سەرۆکەکان کە دەورووپشتیان بە چەکدار گیرابوو، کوێخاکان راستەوخۆ وەرام دەرەوەی گوندنیشینەکانیان بوون.

بە گومانی ئەم ئەفسەرە بەریتانییە لە کەشێکی شایستەی وەك ئەوەی گوندی و خەڵك پێویستیان پێی هەیە، ئەو کارمەندە ناوخۆییانە بوون کە شارەزاییەکی تەواویان لە کاروباری کشتوکاڵ، تەندروستی، باج و پەروەردە و فێرکردن دا هەبێ، ئەمە هەڵبەت خەونێك بوو بواری وەدی هاتنی نەبوو، سەرۆك هۆزەکان هێشتا واقیعێك بوون و هەریەکەیان بەرنامەیەکی سیاسی تایبەتی خۆی هەبوو کە دەبوایە لەناو هۆزەکەدا، لەچوارچێوەیەکی فراوانتری شارو

گوندو لەناو هێزە دەرەکییەکاندا، واتە یەکێتی سۆڤیەتی و بەریتانیا وتاران پێڕەودەکرا.

لە ناوچەی داگیرکراوی ژێر دەستەڵاتی سۆڤیەتیدا، بەتایبەتی لە دەوروبەرەکانی، ڕێبەرانی کورد بەوردی ئەو ئیمتیازاتانەیان کە لەوانەبوو لەوابەستەیی بەدەزگای ئیداری سۆڤیەت یان تاران وەدەستیان دەکەوت، هەڵسەنگاند بۆ نموونە عەلی ئاغای دەبۆکری تەئکیدی لە وەفاداری خۆی بۆ تاران کردەوە، برا نارازییەکانی بەدوای وەدەستخستنی پشتیوانی و چاوەدێری سۆڤیەتەکانەوە بوون ئەوانی دیکە، بەتەگبیر هەوڵیان دەدا پشتگیری هەردوولا (واتە هەم تاران و هەم سۆڤیەتی) یەکان وەدەست بخەن لە بارێکدا کە قازی محەمەد، کەسایەتی بەردڵی خەڵکی مەهاباد، لەپێناوی مەبەستی نەتەوایەتی بەدوای پشتگیری سۆڤیەتی یەکانەوە بوو، سەدری قازیی برای، وەك نوێنەری مەهاباد هەڵبژێردرا و چووەناو ئەنجوومەن، براکانی قازی لەگەڵ پۆکەری سیاسی بێگانە نائاشنا نەبوون، باوکیان (قازی عەلی)یش لەگەڵ سمکۆ دانوسانی کردبوو.

قازی محەمەدیش وەك هەندێ لە سەرۆك هۆزەکان، خۆتێگەیاندنی هاوپەیمانەکانی بەچاوی هەلێك بۆ وەدەست خستنی پلەیەك خودموختاری، بینیووە، ئەویش هەروەك ئەو سەرۆك هۆزانە سەرەتا لە ئەیلوولی1941 بەو ئومێدەی جۆرە ئینتدابێك بۆ کوردستانێکی یەکگرتوو دابین بکا، پەیوەندی بە ئینگلیزەکانەوە کردبوو، لێپرسراوانی سۆڤیەتی بەو باوەڕەی کە ئینگلیزەکان دەیانەوێ کۆبوونەوەیەکی دیکە لەگەڵ کوردەکان ڕێك بخەن، لەناکاو لە مانگی تشرینی دووەم سی ڕێبەری کوردیان بانگی باکۆ کرد، ئەوان و لەناو ئەواندا قازی محەمەدیان بۆ باکۆ نارد، سۆڤیەتی یەکان دەیانویست کوردەکان بەتایبەتی ئەو کوردانەی لەودیوی ناوچەی ژێردەسەڵاتی سۆڤیەت بوون، پشت بەوان ببەستن نە بەئینگلیزەکان.

(نوێنەران) بەجۆش و خرۆشەوە گەڕانەوە کوردستان و کۆمیتەیەکیان بە ناوی(کۆمیتەی باڵای تەندروستی و سەلامەتی) دامەزراند کە دواتربووە(شانەیەك) بۆ قەوارەیەکی خودموختار یان سەربەخۆیی لەورمێ ڕێکخراوی(ئازادی)ئەم دیدارەی بە دانی جۆرە(میهرێکی سپی) لەلایەن سۆڤیەتی یەکان بەکوردەکان، زانی.

دووکەس لەو کەسایەتی یانەی هەوڵیاندا ئومێدێك لەسەر بنەمای ئەم سەفەرەی باکۆ بنیاتبنێن، لەهەمووان دیارترن قازی محەمەد و شیخ عەبدولای گەیلانی(ناسراو بەسەید عەبدولای ئەفەندی و. ف) قازی محەمەد یەکێك لە پیاوە ئایینییەکانی زۆر ناسراوی مەهاباد و نەوەی برای قازی فەتاح بوو کە لە کۆتایی سەدەی ڕابردوودا بەمەبەستی وەدەست خستنی خودموختاری بۆ مەهاباد چەند هەوڵێکی دابوو، سەید عەبدوڵلا(ئال) گەیلانی کوڕی شیخ عەبدولقادربوو، لە ساڵی1941 دوای داگیرکردنی وڵات لەلایەن هاوپەیمانانەوە(لەعێراقەوە) هاتبووە مەرگەوەڕ، پیاوێکی زۆر بەناوبانگ بوو، لە پیرۆزیدا بەناوباگترین شێخی ناوچەکەبوو، ئەم دووانە(قازی محەمەد وسەید عەبدوڵلا) هەوڵیاندا سەرۆکەکانی ناوچەی مەهاباد و ورمێ بەوە رازی بکەن کەجیاوازییەکانی رابردوویان بخەنەلاوە و لایەنگرەکانیان کۆبکەنەوە و یەك بگرن بەلام ئەنجامێکی نەبوو هەندێ لە سەرۆکەکان ئامادەنەبوون ئەم کارەبکەن قازی محەمەد سەرەنجام، بەناچاری پێگەی ئومێدی خۆی لەسەرهاوکاری دوودۆستی خۆی بنیات نا، ئەم دووکەسە قەرەنی ئاغای مامەش و عەبدوڵلائاغای بایەزیدی مەنگوڕ بوو کە هەردووکیان ڕووبەڕووی چەند بەشێکی ناو هۆزەکانی خۆیان بوون.

بەلام لەهەمووی خراپتر، سۆڤیەتی یەکان وادیاربوو حەزیان لێنەبێ ئارەزووی خەڵکی کورد وەدی بێ. دووەمین سەفەر بۆ باکۆ لە مانگی ئایاری1942 ڕێك خرا لەم چاوپێکەوتنەدا سۆڤیەتیەکان بەنوێنەرانی کوردیان گوت کەیەکێتی سۆڤیەت پشتیوانی لە مافی دیاریکردنی چارەنووسی کەمینەکان دەکا، بەلام هێشتا کاتی سەربەخۆیی کوردستان نەهاتووە لەمانگی ئەیلول، کۆبونەوەیەك بەبەشداری سەرۆك هۆزەکانی ورمێ ومەهاباد لەشنۆ ڕێکخرا مەبەست لەم دانیشتنە دابینکردنی یەکێتی‌ی هۆزەکان و هەڵبژاردنی ڕێبەرێك بوو، شێخ عەبدوڵلاو قازی محەمەد چاویان لە قەرەنی ئاغای مامەش بوو کە لەهەموان پیرتربوو، و هاوپەیمانی قازی محەمەد بوو، بەلام لێپرسراوانی سۆڤیەت کە لەدانیشتنەکە ئامادەبوون، کارێکی وایان کرد عومەرخانی شکاك سەرۆکی کەردارەکان وەك ڕێبەر هەڵبژێردرێ و جارێکی دیکەش ئەم دیدەی خۆیان تەئکیدکردەوە کەهێشتا سەردەمی خودموختاری نەگەیشتووە.

قازی محەمەد و شێخ عەبدوڵلا بەئاشکرا بەهۆی هەڵنەبژاردنی کاندیداکەیان نارەحەت بوون و لێپرسراوانی سۆڤیەتیان بەوە تۆمەتبار کرد کە بەو مەبەستە داوای ئەم کۆبوونەوەیان کردووە تا ڕووبەڕووی شکستی بکەنەوە، لەبارێکدا خودی قازی محەمەد داوای کۆبونەوەکەی کردبوو، و سۆڤیەتیەکانی بۆ ئەوە بانگ کردبوو، پشتگیری بڕیارەکانی بکەن یەکێتی سۆڤیەت کە تێگەیشتبوو زۆر ڕێی تێدەچێ جڵەوی بزوتنەوەی کوردی لەدەست دەرچێ، بڕیاری دابوو بەتێکدانی ئەم کۆبونەوەیە کارێك بکا سەرۆکێك هەڵبژێردرێ نەرم و مولایم بێ و خەڵکی ئەم ناوچەیەش بێ کە لە ناو قەڵەمڕەوی ئەودایە ئەم ڕێبەرە عومەرخان بوو.

### سەرچاوە

مێژووی هاوچەرخی کورد، دیڤید ماکداول، وەرگێڕانی ئەبوبەکر خۆشناو، بەرگی دووەم، کتێبی ڕووناکبیری(38 سلێمانی ئایاری(2003)

# کورد لە ئێراندا

**نووسینی : نادر ئینتیسار**

**وەرگێڕانی عەتا قەرەداخی**

بزوتنەوەی هاوچەرخی کورد لە ئێراندا کە لە پێناوی ئۆتۆنۆمیدا خەبات دەکات، دیاردەیەکی مێژوویی نوێیەو سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی سەدەی نۆزدە، هەروەک پێشتر گوتمان کوردەکان لە ململانێی نێوان فارس و عوسمانیەکاندا بوون بە بزوێنەرێکی گرنگی ئەو ململانێیە کە سەرەتای دەستپێکردنی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی شانزەهەم.

هەر لەگەڵ بەدەستگرتنی دەسەڵاتی ئێران لە لایەن سەفەوییەکانەوە، سوڵتانی عوسمانی لە ڕێگای سوود وەرگرتنەوە لە هاومەزهەبێتی(سوننە) لەگەڵ کوردەکاندا هەوڵی داوە بۆ ڕاکێشانی کورد بە لای خۆیداو بەکارهێنانی بە دژی شیعە سەفەوییەکانی ئێران. بە یارمەتیی سوڵتان سولێمانی عوسمانی ژمارەیەک لە سەرۆک خێڵەکانی کورد دژی دەسەڵاتی شا ئیسماعیلی سەفەوی ڕاپەڕین، کاتێک شا ئیسماعیل هەستی کرد کە مەترسی لەسەر ئیمپراتۆرەکەی هەیە لە ناوخودا، بە خێرایی بەرپەرچی ئەو ڕاپەڕینەی کوردەکانی دایەوە سەرۆک خێڵە هەرە دیارەکانی کورد پێکەوە کۆکرانەوە و قەڵەمڕەوی دەسەڵاتیان خرایە ژێر سایەی دەسەڵاتی سەرکردایەتیی تورکە قزڵباشییەکانەوە کە ئەم قزڵباشییانە بڕبڕەی پشتی سوپای عوسمانی بون.

یەکەمین سەرکەوتنی شا ئیسماعیل بەرامبەر ڕاپەڕینەکانی کورد لە ئابی ساڵی 1514دا پێچەوانە بووەوە کاتێک هێزەکانی سوڵتان سلێمان بە پاڵپشتی کوردەکان سوپاکەی شا ئیسماعیلیان لە شەڕی چاڵدێران لە باکووری ڕۆژئاوای ورمێدا شکاند، ئەمەش یەکەمجاربوو کە




بەشێک لە هەرێمی کوردی لە ئێران جیا ببێتەوە و عوسمانییەکان بیخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە.

لە ماوەی سەدەی شانزەدا هەردوو دەسەڵاتی عوسمانی و سەفەوی دەستیان کرد بە دانانی بنیادنانی بەرنامەی دروستکردنی دەوڵەتێکی مەرکەزیی بەهێز، ئەوەش سیاسەتێک بوو بە دژی ئازادیی سنووورداری میرنشینە کوردەکان و، ئاراستەکراو بوو بەهۆی سەرهەڵدانی ڕاپەڕینەکانی کورد، ئەگەرچی ڕاپەڕینەکانی کورد لە لایەن سوپای عوسمانی و ئێرانییەوە تێکشکێنران، بەڵام سەرۆکی دەوڵەتەکان گەیشتنە ئەو بۆچوونەی کە پێویستە ڕێککەوتنێک بکەن بە مەبەستی دەست بەسەراگرتنی کوردەکان ساڵی1639 ڕێککەوتننامەی نێوان ئێران و عوسمانی لەلایەن سوڵتان موراد و شاعەباسەوە ئیمزاکرا، لەم ڕێککەوتنەدا هەردوو لا سەرکەوتووانە ناوچەی کوردستانیان لە نێوان خۆیاندا (عوسمانی و سەفەی) دابەش کرد لەکاتی ئەو ڕێکەوتنەدا حکومەتی مەرکەزیی ئێرانی توانیی خانە کوردەکان ملکەچ بکات و دیفاکتۆی دەسەڵاتی نیمچە سەربەخۆی میرنشینە کوردەکان لە ناو ببات لە پێناوی دەسەڵاتکردن بەسەر ڕاپەڕینەکانی کورددا، ئیمپراتۆری ئێرانی سوودی لە ناکۆکیی خێڵایەتیی نێوان خێڵە کوردەکان وەرگرت و سیاسەتی (گێزەر و عەسا)ی پەیڕەو کرد شان بە شانی سیستەمێکی هەڵبژاردە کە پەیڕەوی سزاو پاداشتی دەکرد لە دەوروبەری ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا هەموو میرنشینە کوردەکان بەجۆرێك کەوتبوونە ژێر سایەی دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی حکومەتی مەرکەزیی ئێرانەوە. میرنشینی ئەردەڵان دوا میرنشین بوو کە ساڵی1865ڕووخا، دواترین و دەشێ گرنگترین ڕاپەڕینی کوردی لە سەدەی نۆزدەدا ئەو ڕاپەڕینە بوو بێت کە ساڵی 1880 سەری هەڵدا کە بە سەرۆکایەتیی شێخ عوبەیدوڵا بوو، ماوەیەکی کورتی خایاند و لەو ماوە کورتەدا شێخ عوبەیدوڵا توانیی ناوچەکانی نێودەریاچەی ورمێ و دەریاچەی وان یەک بخات، ئەمەش بریتی بوو لە یەکخستنی دوو بەشی کوردستان، بەڵام ئەم ڕاپەڕینە لە هێرشێکی دوو سەرەی سوپای فارس و عوسمانیدا تێکشکێنرا.

کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی و هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆری عوسمانی بۆشاییەکی دەسەڵات و ئیدارەی لە ناوچەکەدا دروستکرد و ڕێگای بۆ خێڵە کوردەکان خۆش کرد جارێکی تر لە ڕووی دەسەڵاتی ئێرانییەکان و تورکەکان لە کوردستاندا ڕابووەستن. هەندێ جار ئەم ڕاپەڕینانە زیاتر خاسیەتی شەڕی نێوخۆی خێڵایەتییان وەردەگرت و دەبوونە مایەی پەشێویی، هەندێ جار ڕاپەڕینەکە هەر لە

سنووری تاکە خێڵێکدا دەبوو، دژی بنیادی ئەو دەوڵەتە ئاراستە نەدەکرا، بەڵام هەندێ جاری تر ئەو ململانێیانە هێجگار ئاڵۆزدەبوون و شەڕی نێوخۆی خێڵە کوردەکان و ململانێی نێوان کورد و کەمایەتییە ئایینی و زمانییەکانی تری دەگرتەوە، راپەڕینی سمایل ئاغای سمکۆ یەکەمین نموونەی ئەم جۆرە راپەڕینەیە، سمکۆ سەرۆک خێڵی شکاك بوو کە دەسەڵاتی بەسەر ناوچەی رۆژئاوای دەریاچەی ورمێدا دەکرد و هەوڵی سەربەخۆیی کوردستانیدا، سەرکردایەتی ئەم راپەڕینە سمکۆ دەیکرد، دوای ئەوەی کە سمکۆ دەسەڵاتی خۆی بەسەر خێڵەکانی دراوسێیدا سەپاند، توانیی دەسەڵات بەسەر بەشی زۆری کوردستانی ئێراندا بکات کە ئەوەش لە ماوەی ساڵی 1920 بۆ ساڵی 1924بوو.

لە تێڕوانینی سمکۆوە یەکێك لە گرفتەکانی بەردەم سەربەخۆیی کوردستان بریتی بوو لە دانیشتوانی رۆژئاوای دەریاچەی ورمێ، ئەمەش هەر کوردەکانی نەدەگرتەوە بەڵکو شیعە ئازەرییەکان و ئاسورییە فەلەکانیشی دەگرتەوە کە هەردوو لایان ناکۆکیی درێژخایەنیان لەگەڵ کورددا هەبوو، پێشتر شەڕی تاڵ و پڕ کارەساتیان لەگەڵدا کردبوون. لە راستیدا شارەکانی ورمێ(رەزائیە) سەلماس و خۆیی بەشێوەیەکی سەرەکی لە پێکهاتندا ئازەری بوون و حەزیان نەدەکرد کە ببنە بەشێك لە کوردستانەکەی سمکۆ، لە ئەنجامی ئەوەدا شەڕ لە نێوان ئازەری و کوردەکاندا روویدا.

سمایل ئاغای سمکۆ وای بە پێویست دەزانێ کە دژی هێزەکانی رەزاخان خەبات بکات کە لە کودەتایەکی سەربازیدا لە شوباتی ساڵی 1921 دا فەرمانی گرتە دەست کە پێشتر وەزیری جەنگ و سوپاسالاری سوپای ئێرانی بوو.

رەزاخان کە هێزی ئێرانی سەرلەنوێ رێکخستبووە وەو مەرکەزییەتی بۆ دروست کردبووەوە، دەستی کرد بە رێکخستنی هێرش و شاڵاوبردن بۆ سەر سمکۆو سەرۆك خێڵە راپەڕیوەکانی تر. رەزاخان قەناعەتی وابوو کە کاری رووبەڕووبوونەوەی پێشتری بەرامبەر بە راپەڕینە خێڵایەتییەکان بە هێزێکی چەکداری بێ پشتی بچووکەوە ئەنجامێکی پێچەوانەی هەبوو، بە سوودی هێزە راپەڕیوەکان شکایەوە لە تۆڵەی ئەوەدا رەزاخان فەرمانی بەهێزە رێکخراوەکانی کرد تابە چەکی قورس و هێزی مرۆیی راپەڕینەکان تێکبشکێنن و سوپای ئێرانیی قوناغ بە قوناغ شارە گەورەکانیان لە دەستی راپەڕیوەکانی کورد دەرهێنا، دەوورووبەری ساڵی 1924 هێزە چەکدارەکانی سمکۆ کە دە هەزار چەکدار بوون کەم بوونەوەو هەزار چەکداریان لێ مایەوە کە ئەوانیش ئەندامانی خێڵی شکاك بوون. دوای ئەوەی کە هێزەکانی سمکو ئابلوقە دران، حکومەتی ئێرانی لێبووردنی بۆ سمکۆ دەرکرد.

لە ساڵی1925دا کە رەزاخان بوو بە رەزاشاو یەکەم پاشای بنەماڵەی پەهلەوی، سمکۆ بەڵێنی دڵسۆزیی هەتاهەتایی بەو و بە دەوڵەتی ئێرانیدا بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سمکۆ بەشداریی راپەڕینێکی تری کوردەکانی کرد لە ساڵی1926دا، لەگەڵ دوو سەرۆك خێڵی تری کورددا هاوپەیمانی تیپەکەی پێکهێنا کە ئەوانیش حاجی ئاغای سەرۆك خێڵی هەرکی و بەگزادەی سەرخێڵی مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕبوون، دوای چوونە ناو سەلماس و ئابلوقەدانی شاپور، هێزەکانی ئێران هێرشیان کردە سەر هێزە کوردییەکان، ئەو هێزانەی ئێران لە ورمێو شەرەفخان و خۆیی و ئازربایجانەوە نێردرا بوون و هێزە کوردییەکانیان ناچار کرد کە پاشەکشێ بکەن بۆ سنووری تورکیا، لەوێشدا سمکۆ دەستگیرکراو بەندکرا پاش ئەوەی کە سمکۆ لەو گرتنەی سنووری تورکیای ئازادکرا، جارێکی تر گەڕایەوە بۆ ئێران کە لەوێ لە حوزەیرانی ساڵی1930نزیك شاری شنۆ لە پێکدادانێکی کورتدا لەگەڵ هێزە ئێرانییەکاندا کوژرا. (هەندێ سەرچاوەی کوردی و رۆژئاوایی وایان راگەیاندووە کە سمکۆ لە شەڕی دژی هێزە ئێرانییەکاندا نەکوژراوە بەڵکو لە 21ی حوزەیرانی ساڵی1920دا لە لایەن هێزە ئێرانییەکانەوە لە پشتەوە کوژراوە لە کاتێکدا کە سمکۆ بانگهێشتی ئەو هێزانەی بۆ کۆبوونەوەیەك بە مەبەستی گفتوگۆکردن قبوڵ کردبوو لە پێناوی کۆتایی هێنان بە راپەڕینی کورد)

راپەڕینی سمکۆ یەکەمین هەوڵی گەورەی کورد بوو لە پێناوی دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ لە ئێراندا، هەر چەندە سمکۆ هەندێ سەرکەوتنی سەرەتایی بەدەست هێنا بەڵام شکستی یەکجارەکی ئەم سەرکردەیە لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی راستەقینەی کوردی بەهۆی بێ توانایی خودی سمکۆوە بوو لەوەیدا کە نەیدەتوانی لە تێڕوانینی تەسکبینانە رزگاری ببێت، هەروەك توانای ئەوەشی نەبوو کە دەوڵەتێکی هاوچەرخ بە پێی رێکخستنی ئیداریی نوێ دروست بکات، سمکۆ بە شێوەیەکی گشتی بایەخی بە پەشێویی دەداو کاتێك کە نەیدەتوانی تاڵانی خێڵەکەی خۆی یان خێڵە هاوپەیمانەکانی بکات، هێرشی لەناکاوی دەکرد و هەوڵی دەدا کە ناوچە غەیرە کوردییەکان بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، لەو شوێنانەش سەلماس و رەزایە و دواتریش خۆیی، لە ئەنجامی ئەوەدا دانیشتوانی ئەو ناوچانەی بە جۆرێك کەم کردەوە کە گەیشتە ئاستی بێ ئومێدی و وێرانەیەکی بێ سنوور.

سەرکەوتنی سەربازی رەزاخان بەسەر سمکۆ و سەرۆك خێڵەکانی تردا سەرەتای دەستپێکردنی قۆناغێکی نوێی سەرکەوتوانەی زۆر دەستەی ئیتنیکی بوو لە هەموو وڵاتی ئێراندا، هەوڵ و کۆششی رەزاخان بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی مەرکەزی بە دەسەڵات لەسەر بنەمای یەکێتیی نەتەوەیی هەموو گەلانی ئێران بوو. بەشێوەیەکی ناسروشتیانەش هوشیاری (نەتەوەیی) فارسی دەسەپاند و ئەوەش رێبەرایەتی دەکرا لە لایەن ئەو کۆمەڵەی کە

پێی دەوترا(کۆمەڵەی ڕێ نیشاندەری گەل)، ئەم کۆمەڵەیە هەموو هۆیەکانی پەیوەندیکردنی خستەژێر دەستی خۆیەوە و هەموو ناسنامە ئیتنیکی و سیفاتە کەلتوورییەکانی غەیری کەلتووری فارسی پێشێلکرد لەو هۆکارانەی پەیوەندیکردنیش ئێزگەی رادیۆو کتێب و بلاوکراوەی تریش بەر ئەو شەپۆلی سەرکوتاندنەوەیە کەوتن. خەمی رەزاخان لە پێناوی چاندنی تۆوی هوشیاری نەتەوەیی فارسیدابوو بەهۆی دامەزراندنی ئەکادیمیای ئێرانی کە ئەویش ئامانجی پاکژکردنەوەی زمانی فارسیبوو لەوشەی عەرەبیو تورکی کەدواتر سەلمێنرا ئەوە کارێکی نەشیاوە لە کاتێکدا کە چەندین سەدەیە کەلتووری فارس و تورک و عەرەب تێکەڵاوی یەکتربون، بەکارهێنانی دایەلێکتەکانی زمانی کوردی لەخوێندندا، لەبلاوکردنەوە و قسەی رەسمیدا قەدەغە بوون، زۆر قوتابخانەی کوردی ناچارکران کە دابخرێن، هەروەك پەروەردە و فێرکردن تێکوپێك دراو یارمەتیی دارایییان لێبڕا یاسای لەبەرکردنی جلوبەرگی شێواز ئەورووپی بەسەر کوردە ئێرانییەکاندا سەپێنرا، هەمان شێوەی ئەتاتورك لە تورکیادا رەزاشا لە ئێراندا، تەنانەت جەختی لەسەر بەکارهێنانی زاراوەی (ئێرانیی چیایی) کرد بۆ ناوهێنانی دانیشتوانی کوردی وڵاتەکەی، سەرباری ئەوەش بەکارهێنانی گشتیی وشەی (کورد) قەدەغەکرا بەو شێوەیەی تورکیا.

رەزاشا دەزگاکانی حکومەتی لە ناوچە کوردییەکەدا بە کاربەدەستی فارس و ئازەری پڕ کردەوە، رەزاشا مێژووی ناکۆکیی نێوان ئازەری و کورد پشێویی نێوان کورد و فارسی لە سەدەی بیستدا بە هێند گرت و ئەم سیاسەتە بوو بەهۆی بێبەشکردنی کورد لە هەموو مافێك و کردنی بە پاشکۆ، سەرباری ئەوەش لە ئەنجامی پێداگرتنی کۆمەڵەی رێنومایی گەلدا هەندێ ناوچە کەهەر لەدێرزەمانەوە کوردنیشین بوون راگەیەندرا کە بەشێکن لە هەرێمی نوێی ئازربایجانی رۆژئاوا، ئەمەش ناکۆکیی نێوان کورد و ئازەری بەرەو خراپتر برد.

ئابووریی کوردی کە بەشێوەیەکی سەرەکی لەسەر بەرهەمی تووتن بوو کە شێوەی بەرهەمێکی (نەقدی) هەبوو بە شێوەیەکی ترسناك بەهۆی هێنانی مۆنۆپۆلی دەوڵەتەوە لەسەر تووتن ئەو ئابوورییە تێکشکا، بەهۆی ئەوەی کە رەزاشا یارمەتییەکی دارایی گەورەی حکومەتیدا بۆ خاوەندارێتی تایبەتی خۆی لەسەر حسابی خاوەندارێتی کوردی، بەڵام لەلایەکی ترەوە سیاسەتی هاوچەرخکردنی ئابووریانەی رەزاشا بە شێوەیەکی گشتی نەگەیشتە کوردستانی ئێران، رێگای نوێ و کارگەی نوێ لە کوردستان نەکرانەوە باری تەندروستی بە شێوەیەکی گشتی لە حاڵەتی سەرەتاییدا ماوەتەوە و لەو بارەیەوە کوردستان خراپترین شوێنی ئێرانە، شێوازی خاوەندارێتی زەوی بە شێوەیەکی گشتی دەستکاری نەکراوە، خاوەن زەوییە گەورەکان و لە نێویشیاندا خاوەن زەوی نەناسراو رێگایان پێ درا کە ملکەکانیان وەکو خۆی بمێنێتەوە تەنانەت ئەو ملکانەی کە کرابوون بە(وەقف) یان(وەقف)ە ئایینییەکان بە شێوەیەکی سەرەکی بێ هیچ دەستکاریکردنێك مانەوە، ئەمە سەرباری ئەو راستییەی کە ملکە زەوییە(وەقف)کراوەکان لە شوێنەکانی تری وڵات لە ژێر دەستی پیاوانی ئایینی دەرهێنراون و خراونەتە ژێر دەسەڵاتی وەزارەتی پەروەردە یان لایەنێکی تری حکومییەوە ئەمەش مانای وایە کە خاوەن هێز و دەسەڵاتە کۆنەکان لە کوردستاندا کە بریتی بوون لە سەرۆك خێڵ و شێخە ئایینییەکان توانیویانە لەسەر بەکارهێنانی میللەتی خۆیان بەردەوام بن، کوردستان وەکو هەرێمێکی دواکەوتوو ماوەتەوە، نەیتوانیووە یەکێتییەکی ئابووری لەگەڵ ئابووریی نیشتمانیدا پێك بهێنێت.

بۆرژوای بچووکی (سەرەتایی) کورد مۆنۆپۆلی دەوڵەتی رەت کردەوە و لە هەمان کاتدا حکومەت بە تەواوی ناوچەی کوردستانی پشتگوێ خست.

جەنگی دووەمی جیهانی سیاسەتی ئێرانی گۆڕی و دەسەڵاتی حکومەتی مەرکەزی لەناوچە دوورەکان و هەرێمە خێڵایەتییەکاندا لاوازکرد، لەگەڵ داگیرکردنی ئێراندا لە لایەن ئەنگلۆسۆڤێتەوە لە 25ی ئابی ساڵی1941دا هێزەکانی ئێران پشتیان لە رەزاشا و لە دەسەڵاتی لاوازی محەمەد رەزای کوڕی و جێنشینی کرد و رێکخستنی سیستەمی کۆمەڵایەتی- سیاسی خێڵایەتی دەستی کردەوە بە خۆدەرخستن، بەریتانیاو سۆڤیەت فەرمانڕەوای ئەمری واقیع بوون لەو ناوچانەی کە لە رووی سەربازییەوە داگیریان کردبون. ئاشکراکردنی تیاچوونی دەسەڵاتی حکومەتی ئێرانی لەو ناوچانەدا بەگشتیو لە ئازەربایجان و کوردستان بە تایبەتی کە سوپای سۆڤێتی تیایاندا باڵادەستبوو، بوو بە هۆی ئەوەی کە هەزاران کارمەندی سوپای ئێرانی بەرەو تاران رابکەن و لەوێ ناویان تۆمار بکەن، لەو بارودۆخەدا بوو کە بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردی لە مەیداندا خۆی سەلماند.

## کۆماری مهاباد

بەهێزترین لە رووداوەستانی کورد لە سەدەی بیستدا دژی دەسەڵاتی ئێرانی لە ساڵی1945دا بوو، کاتێك کۆماری سەربەخۆی مهاباد دامەزرا، دروستبوون و رووخاندنی کۆماری مهاباد دەبێت لە سنووری سیاسەتی فراوانخوازیی سۆڤێتی لە ئازربایجاندا لێك بدرێتەوە کە لەو ناوچەیە سۆڤێتییەکان بە هیوای ئەوە بوون چاودێریی بزوتنەوەی جیاخوازی کۆمۆنیستی بکەن کە لەلایەن خۆیانەوە ئاراستە دەکرا، فشاریان خستە سەر حکومەتی ئێرانی هەتا ئیمتیازاتی ئابوورییان پێ ببەخشێت بە تایبەتی لە دەروازەی کەنداودا کە زۆر بەلایانەوە گرنگبوو، لەپێناوی چەسپاندنی سیاسەتەکانیان، سۆڤێتییەکان بە تەواوی ئاگاداری ناکۆکیی مێژوویی نێوان کورد و

ئازەری بوون و لەگەڵ ئەوەشدا دەعوەتی سەرۆك خێڵە جیاوازەكانی كوردیان كرد هەتا سەردانی ئازربایجانی سۆڤێتی بكەن ئەوەش لە ساڵی1944 و سەرەتای ساڵی1945 ز، جەعفەر باقرۆف سەرۆك وەزیری كۆماری ئازربایجانی سۆڤێتی سەرگەرمی قایلكردنی سەرۆك خێڵە كوردەكان بوو بۆ پێویستبوونی دروستكردنی بەرەیەكی كوردی- ئازەری بە مەبەستی ئەوەی كورد ئوتۆنۆمی بەدەست بهێنێت سەرباری ئەوەی كە سۆڤێت ئاگاداری بنیادە خێڵایەتی و كۆمەڵایەتییەكانی كۆمەڵگای كوردی بوو، بەڵام لەو بارەیەوە دەلیل و ئاماژەیەكی كەمی هەبوو.

لە ڕاستیدا گەلێك ماركسیی تەقلیدیی ئێرانی لە ناو ئەوانەشدا حیزبی تودەی سەر بە سۆڤێت كە ساڵی1941 پێكهات، تێڕوانینەكانی فارس یان ڕۆشنبیرە بە فارسبووەكانیان نیشان دەداو تێی نەدەگەیشتن كە چۆن جۆراوجۆرێتی زمانی و هەرێمی كاری لە ڕەفتاری سیاسی و خێڵایەتی و دەستە ئیتنیكییە غەیرە فارسەكان كردوە، بەپێچەوانەوە زۆر ماركسیی ئێرانی غەیرە فارس لە گرنگێتی كەلتووری و جۆراوجۆرێتی ناوچەیی لەسەر دامەزراوەكەیان تێگەیشتن، ئەم جیاوازییە گرنگە لە نێوان فارس و غەیری فارسدابوو بە هۆی جیابوونەوە (دابەشبوون) لە نێوان سەركردایەتی تودە و هاوشێوەكانیاندا. لە ئازەربایجان ئەم جیابوونەوەیە بوو بە هۆی ئەوەی كە جەعفەر پیشەوەری چەپی ناسراو وا لێ بكات بكەوێتە بنەمادانان بۆ دامەزراندنی (فیرقەی دیموكراتی ئازەری) كە وەكو حیزبێكی ماركسی نوێنەرایەتی بەرژەوەندییەكانی ئازەری بكات ئەم فیرقەیە بە شێوەیەكی ڕەسمی لە ڕۆژی3ی ئەیلوولی1945دا پێكهات و هەر لەگەڵ دامەزراندنیشیدا لە لایەن ئێرانەوە بەوە تاوانباركرا كە پاشكۆی حیزبی تودەیە، ئەویش لە ئەنجامی خۆتێهەڵقورتاندنی سۆڤێت لە كاروباری ئازەربایجانی ئێرانیدا، لە ڕاستیدا تودە و فیرقە دووڕووی یەك دراو بوون، بەڵام بەهۆی جیاوازیی بنەمای كۆمەڵایەتیو ململانێ لەسەر بەرژەوەندییەكانیانو ناڕێكی سیاسیی نێوانیانەوە لە یەكتر جیابوونەوە.

لە كاتێكدا تودە گرنگیی تەواوی بە بنەما مەئلوفەكانی ماركسییەت دەدا لە ململانێی چینایەتی و دیموكراتیی مەركەزیدا، فیرقە لایەنگری ئۆتۆنۆمی بوو بۆ كەمایەتییەكان و پاڵپشتی بەكارهێنانی زمانی ئازەری دەكرد وەكو بنەمایەكی سەرەكی بۆ داننان بەمافەكانی ئازەردا، پیشەوەری لە وەڵامی ڕەخنەی تودەدا لە سیاسەتی سیكتاریزمانەی حیزبەكەی گوتی: هەڵێكی باش لە بەردەستدابوو بۆ ڕۆشنبیرانی فارس هەتا هەست بە شۆڤینیەتی خۆیان بكەن و درك بەو جیاوازییانە بكەن كە لە نێوان زمانی خۆیان(فارسی) و زمانی ئێرانییەكانی تردا هەیە... پیشەوەری لەسەر ڕادیۆی تەورێزەوە ڕایگەیاند كە حیزبەكەی مافی بەكارهێنانی زمانی دایك لە ئازەربایجاندا وەكو خاڵێك سەیر دەكات كە شایەنی سەوداگەری لەسەركردن نییە.

مەسەلەی سەربەخۆیی زمان سیاسەتی تودەو سۆڤێتی لە كوردستاندا ئاڵۆز كرد هەروەك ئەرڤاند ئیبراهیمی تێبینی كردووە سیاسەتی تودە بەرامبەر بە كەمایەتییە زمانییەكان بە تەمومژاوی ماوەتەوە حیزبی تودە لە بارەی كەمایەتییە زمانییەكانەوە هەتا كۆنگرەی دووەمی ساڵی1948هیچ بەرنامەیەكی نەبوو لەو كۆنگرەیەدا كە دوای ڕووخاندنی كۆمارە ئۆتۆنۆمییەكانی كورد و ئازەری بوو حیزبی تودە بەیانێكی تایبەت بە مەسەلەی ئیتنیكی دەركرد، لە نامیلكەیەكدا كە لە ئەیلوولی ساڵی1949دا بەناونیشانی(میللەت و میللیەت- نەتەوە ونەتەوایەتی) بڵاوی كردەوە، تودە لە ئێراندا بۆچوونەكانی لینین و ستالینی دەربارەی مەسەلەی نەتەوایەتی لەو نامیلكەیەدا پێشكەش كرد، ئەم نامیلكەیە بەو دەرەنجامە كۆتایی هاتبوو كە ئێران لە كۆمەڵە نەتەوەیەكی جیاواز پێكهاتووە كە هەریەكەیان خاوەنی زمان وداب و نەریتی خۆیەتی، بەشدارییان لە بنیادنان و كەلتووری دەوڵەمەندی ئێراندا هەیە و خەباتی پێكەوەییان دژی فیودیالیزم و حوكمی ئیستیبدادی و ئیمپریالیزم بووە بە هۆی دروستكردنی پەیوەندییەكی بەهێز لە نێوانیاندا، ئەم پەیوەندییە دۆستایەتییە بەهێزە دەتوانرێت بە باشترین شێوە بپارێزرێت ئەگەر كەمایەتییە زمانییەكان پارێزراو بوونایە و مافی بڕیاردانی چارەنووسیان ڕێزلێ بگیرایە.

سەرباری ئەوەی نفوزی سۆڤێت لە دروستكردنی ڕووداوەكانی كوردستاندا گرنگ بوو، بەڵام جیاوازیی تەواو لە نێوان داواكارییەكانی ئازربایجان بۆ ئۆتۆنۆمی و داواكاریی كورددا هەبوو لە ئێراندا. لە ئازربایجان، یەكێتی سۆڤێت بەرژەوەندیی خۆی لەسەر ئەوە بنیاد نابوو كە پشت ببەستێت بە گەنجینەی دەوڵەمەندیی ئازەرییە ماركسییەكانی كۆماری ئازربایجانی سۆڤێتی، بەشی زۆری فیرقە بە تایبەتی دامەزرێنەرو تیۆرییەكانی (خاوەن فیكر) ساڵانێكی زۆریان لە یەكێتیی سۆڤێت بەسەر بردبوو و پەیوەندیی پتەوو بەهێزیان لەگەڵ ماركسییە ئازەرییەكانی سۆڤێت لە باكۆ دروست كردبوو، سەرەڕای ئەوەش سیاسەتی ستالین دەربارەی باشووری سۆڤێت بریتی بوو لە خەباتكردن لە پێناوی یەكخستنی ئازربایجانی ئێرانی و یەكگرتنەوەی لەگەڵ ئازربایجانی سۆڤێتدا لە ژێر سایەی سەركردایەتی مۆسكۆدا.

هیچ بەڵگەیەكی قایلكەر لە ئارادانەبوو پێشنیاری ئەوە بكات كە سیاسەتی سۆڤێتی بەرامبەر بە كورد هەمان شێوەی سیاسەتی سۆڤێتی بێت بەرامبەر بە ئازەرییەكان، لە ڕاستیدا حكومەتی سۆڤێتی یارمەتیی دروستكردنی دەوڵەتێكی كوردیدا لە ئێراندا، لەوانەیشە سۆڤێت حەزی كردبێت دەوڵەتێكی سەربەخۆی كوردی لە ئێران

وعێراق و تورکیادا دابمەزرێت و توانای ئەوەشی هەبووبێت کە ئەو دەوڵەتە کوردییە بەلای سۆڤێتدا رابکێشێت و دڵسۆزی و وەلائی بۆ سۆڤێت هەبێت، بەلام ستالین سیاسەتی پشتگیریکردنی دروستکردنی کوردستانێکی یەکگرتووی پیادە نەکرد، لەترسی ئەوەی نەوەکو لەم دەوڵەتە نوێیەدا رۆحی سەربەخۆیی لەگەڵ سیاسەتی سۆڤێتیدا یەك نەگرێتەوە، لە ئەنجامدا ئەم دەوڵەتە بکەوێتە ژێر دەستی رۆژئاواوە، چونکە هێزی سیاسی لە هەموو ناوچە کوردییەکاندا لە ژێر دەستی خاوەن زەوی و سەرۆك خێڵ و رابەرانی ئاییندا کۆببووبووەوە کە ئەمانەش هەموویان خۆپارێزو بگرە کۆنەپەرستیش بوون و زۆریش بە گومان بوون لە ئامانجەکانی سۆڤێت و بە گومانیشەوە سەیری بڵاوبوونەوەی کۆمۆنیستیان دەکرد و دژیشی بوون، لە راستیدا دامەزراندن و ر ووخاندنی کۆماری مهاباد تێروانینی کاتی و پڕ لە دژایەتیی یەکێتیی سۆڤێتی لەسەر مەسەلەی ئۆتۆنۆمی کورد ئاشکراکرد.

## دروستبوونی کۆمەڵە

تەنانەت پێش داگیرکردنی باکووری ئێران لە جەنگی دووەمی جیهانیدا لە لایەن سۆڤێتەوە، شاری مهاباد ناوەندی سەرەکیی هەوێنی هەستی نەتەوایەتی کوردی بوو لە مهاباددا، چینی کۆمەلایەتی ناجێگیر هەبوو، دانیشتوانی ئەم شارە لەگەڵ هەوێنی رۆشنبیری ئەو سەردەمەدا کۆك و تەبابوون دوای دروستکردنی ناوچەی دەسەلاتی سۆڤێتی لە ئێراندا (پاش داگیرکردنی ئەو ناوچانە لە لایەن سۆڤێتەوە...) کە شاری مهابادیشی تێدابوو، شوێنی کارمەندە حکومییەکان بە شێوەیەکی رێکوپێك بە کوردەکان پرکرایەوە، ئەویش بە رەزامەندیی سۆڤێت، زۆرێك لە کوردەکانی ئەو ناوچانە حەزیان لەوە نەبوو کە بنیادێکی بەڕێوەبردنی چالاك و کاریگەر لە نێو کۆمەڵگای کوردیدا هەبێت، بۆ نموونە ئەمیر ئەسعەد کە بە ناو سەرۆکی خێڵی دیهبۆرکی بوو کرا بە پارێزگاری سنووری مهاباد، ئەسعەد پیرەمێردێك بوو، بە ئاشکراش پیاوێکی لاوازبوو، توانای فەرمانکردنی بەسەر زۆرێك لەتیرەکانی خێڵەکەی خۆیدا نەبوو و رێزو شوێنی خێڵەکانی تری ناوچەکەشی بەلاوە دەنا، لە ئەنجامی ئەوەدا دەستەیەك لە کوردی مهاباد حیزبی سیاسی خۆیانیان بۆ بەدەستگرتنی چارەنووسی خۆیان بە شێوازێکی زۆر سەربەخۆو کاریگەرانە دامەزراند.

لە رۆژی16ی ئەیلوولی1942 هەندێ لە کوردەکانی مهاباد کۆبوونەوەکیان کرد بە مەبەستی پێکهێنانی لیژنەیەك بە ناوی (کۆمەڵە کورد) بۆ نەخشەدانانی کارکردنی بۆ پشتگیریکردنی مافی بڕیاردانی چارەنووس لە لایەن کوردەوە، ئەم لیژنەیە ناوی خۆی نا(کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد) یان(کۆمەڵە) لە ماوەی چەند هەفتەیەکی دروستبوونیدا، کۆمەڵە ژمارەی ئەندامانی خۆی زیاد کردبوو و گەیشتبووە نزیکەی سەد ئەندام لە مهاباددا، لەبەر مەترسیی پشکنین لە لایەن دەسەڵاتدارانی دوژمنەوە، کۆمەڵە لەسەر بنەمای نهێنی و رێکخستنی شانەی تایبەتی وەکو بنەمای یەکەی ریکخستن کاری دەکرد. ئەندامانی کۆمەڵە تەنیا ئەندامانی شانەکەی خۆیانیان دەناسی ئەندامیتی تا رادەیەکی بەرچاو بە سنوورداری مایەوە و تایبەت بوو بۆ ئەو کەسانەی کە لە دایك و باوکەوە کورد بوون، ئازەری کە لە نیو کۆمەلانی خەلکی کورددا دەژیان و بە کوردی قسەیان دەکرد بەزوویی لە ئەندامێتی کۆمەڵە دوور دەخرانەوە وەکو ئەوەی کە ئەو ئازەرییانە کوردبن بەلام نەوە یان(بەرهەمی) نا شەرعیی کوردبن. لەبەرئەو شێوە هەڵبژاردنەی ئەندام لە لایەن کۆمەڵەوە وبنەمای تەسکی پشتگیری و لایەنگری لە دەرەوەی مهاباد، کۆمەڵە توانای گەیاندنی دەنگی خۆی بە سەرجەم کوردی کوردستانی گەورە نەبوو.

کۆمەڵە سەرەڕای ئەوەی کە مافی رەوای خۆی بوو ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمی دروست بکات هەموو کوردستانی ئێران بگرێتەوە و ئامانجیشی ئەوە بێت کە لە ئاکامدا ئەم ناوچە ئۆتۆنۆمییە لەگەڵ خاکی کورددا لە دەرەوەی ئێراندا یەکپێ بگرێتەوە، بەلام کۆمەڵە سەرکەوتوو نەبوو گەیاندنی چالاکییەکانی خۆی بۆ شارە گرنگە کوردییەکانی وەکو سنە و ناوچەی کرماشان، ئەم ناوچانە هەر ئەوە نەبوو لە لایەن سوپای ئێرانەوە کۆنترۆڵ کرابێتن، بەڵکو لە پاڵ ئەوەشدا پێگەی بنەماڵە دیارەکانی شیعەش بوو کە چەندین نەوەبوو پەیوەندیی توند و تۆڵیان لەگەڵ فارس و حکومەتی ئێرانیدا دروست کردبوو، لەبەرئەوە ئەم بنەماڵانە خۆیان وا نیشان داوە کە بەشێکی نەپچڕاوبن لە نەتەوەی ئێران. بانگەوازەکانی کۆمەڵە بۆ جیابوونەوە لە زۆربەی ناوچە گەورە کوردنشینەکانی دەرەوەی مهاباددا بەرگوێی کەڕ دەکەوت، لەبەر ئەوە کۆمەڵە بڕیاریدا کە پشت بەیەکێتیی سۆڤێت ببەستێت بۆ ئامادەکردنی هەلومەرج بۆ پشتگیریکردنی بیانووی داواکردنی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد.

شتێکی سەیریشە لە ماوەی دوو ساڵی یەکەمی کۆمەڵەدا هیچ مارکسییەکی ناسراو یان هیچ ئەندامێکی کۆمۆنیست بەشداریی کۆمەڵەی نەکرد.

گوتاری مارکسی و چەپ کە دەستی کرد بە چوونە ناو بڕیارەکانی کۆمەڵەوە، زیاتر لە رێگای چالاکییە پڕ لە گۆڕانکارییەکانی سۆڤێتەوە نەبوو، وەکو ئەوەی لە رێگای چڕبوونەوەی پەیوەندییەکانی کۆمەڵەوە لەگەڵ گروپە کوردییەکانی عێراقدا ئەو گوتارە هاتە ناوەوە، بە تایبەتی دوای ئەوەی کە کۆمەڵە هاریکاریی خۆی لەگەڵ رێکخراوی (رزگاری کورد)دا پەرەپێدا کە رێکخراوێکی نەتەوەیی کوردی بوو لە کوردستانی عێراقدا و مارکسی و چەپەکان دەسەلاتیان بەسەرداکردبوو، بڕیارەکانی رزگاری لەوەدا کۆدەبووەوە کە سنوورێك بۆ ئیمپریالیزمی رۆژئاواو پاشکۆکانیان دابنرێت، لەهەمان کاتدا کۆمەڵە کەوتە سەر

سیاسەتی دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ بزوتنەوەکانی کوردی دەرەوەی ئێران. لەئابی 1944دا نوێنەرانی کۆمەڵە لەگەڵ نوێنەرانی کوردی عێراق و تورکیادا لە چیای دالانپەڕ لەو شوێنەی کە سنورەکانی ئێران و عێراق و کوردستان یەکتردەبڕن کۆ بوونەوە و ڕێککەوتننامەیەکیان بە ناوی(پەیماننامەی سەر سێ سنوور) ئیمزا کرد، بەڵام ئەم ڕێککەوتننامەیە زیاتر هێمای دڵنیابوون بوو لە یەکێتیی خاکی کوردستانی گەورە زیاترلەوەی کە نەخشەیەکی چەسپاوبێت بۆ کارپێکردن. ئەم نەخشەیە دەرەنجامی ئەو نەخشە جوگرافییە بوو کە هەندێ لەنەتەوەییەکانی کورد بۆ نیشتمانی کوردیان کێشاوە.

ناوچەی کوردستان بەو شێوەیەی لە لایەن ئەم سەرکردانەی کوردەوە نەخشەکێشرابوو هەندێ شتی تێدابوو کە جێگای قسە لەسەرکردن بو، چونکە دووربوو لە وردەکاری، بۆ نموونە سەرۆکەکان هەرێمی کوردییان لە ئێراندا درێژکردۆتەوە بۆ پشتی کرماشان و بۆ ئەو ناوچانەی کە خێڵەکانی لوڕو بەختیاری لێ نیشتەجێن کە ئەو خێڵانەش کورد نین، بە هەمان شێوە درێژکردنەوەی ناوچەی کوردی بۆ ئازربایجانی ئێرانی سەرچاوەی کێشەو ناکۆکیی نێوان نەتەوەییەکانی کورد و ئازەری بووە بۆ ماوەی دەیان ساڵە ناوچەیەکی تر کە جێگای قسە لەسەرکردنە شاری کەرکوکە هەروەك ولیەم ئیگڵتن گوتوویەتی دانیشتوانی ئەم شارە نەوتییە دەوڵەمەندە بە شێوەیەکی یەکسان لە نێوان کورد و تورکماندا دابەش بووبوو، سنووری شارەکەش جێگای لادێ نشینەکانی کورد و تورکمان وعەرەب بوو سەرباری هەندێ گرفتی ناجۆر دەربارەی سنووری نیشتمانی کورد، ئەم نیشتمانە گەوهەری نەتەوایەتیی کوردی هێماکردووە و بۆتە هۆی سەرهەڵدان و جووڵاندنی بزوتنەوە نەتەوایەتییەکانی کورد لە سەدەی بیستدا.

بنیادی کۆمەڵە ئارەزووی سەرەتایی ئەم حیزبەی بۆ دامەزراندنی ڕێکخراوێکی ناهەرەمی نیشان دەدا کە دووربێت لەوەی کە تاکە کەسێك یان دەستەیەك لە لوتکەدابن و دەسەڵاتی بەسەردا بکەن، لەماوەی دوو ساڵی یەکەمی مێژووی دروستبوونی کۆمەڵەدا، مەسەلەی ئەندامێتی، بە تایبەتیش ئەندامێتی لە لیژنەی ناوەندیدا بە گەرمی گفتوگۆی لە سەر دەکرا هەندێ لە ئەندامانی لیژنەی ناوەندی حەزیان دەکرد کە ڕێگا بۆ قازی محەمەد خۆش بکەن کە بێتە ناو لیژنەی ناوەندییەوە، قازی محەمەد ڕابەری هاووڵاتییانی مهاباد بوو، هەندێکی تر لە ئەندامانی لیژنەی ناوەندیی کۆمەڵە لەوەو ترسان کە کەسێتی دەسەڵاتدار و بەهێزی قازی محەمەد ببێتە هۆی لاوازکردنی بنیادی دیموکراتی بۆ دروستکردنی بڕیار لە کۆمەڵەدا سەرەڕای ئەوەش ئاشکرا نەبوو ئایا قازی محەمەد چۆن وبە چ مەرجێك ڕازی دەبێت ببێت بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی لە کاتێکدا ئەگەر داوای ئەوەی لێبکرێت.

قازی محەمەد ڕابەرێکی ئایینی سوننە مەزهەب ببوو، کوڕی قازی عەلی بوو کە هاوکاریی سمایل ئاغای سمکۆی کردبوو کاتێك لە ساڵانی سەرەتای بیستدا هێزەکانی سمکۆ دەسەڵاتیان بەسەر مهاباددا کرد لە ڕێگای سەدری قازییەوە کە برای بوو، ئەندامی پەرلەمانی ئێرانی بوو، قازی محەمەد لەگەڵ ئەندامێکی ئەنجومەنی حکومەت کۆبووبووەوە هەتا داواکانی کوردی پێ بگەیەنێت وەکو ڕابەرێکی ئایینی کە مەیلێکی سیاسیی کۆمەڵایەتیی پارێزگارانەی هەبوو، قازی محەمەد بەگومانەوە سەیری عەقڵی نەتەوەییە ڕادیکاڵەکان و چەپەکانی ناو کۆمەڵەی دەکرد، سەرەڕای ئەوەش چی نەتەوەییەکانی کۆمەڵەو چی یەکێتیی سۆڤێتەیش تێگەیشتن بەبێ بەشداریکردنی کەسێکی خاوەن ڕێز و مەقام و بەدەسەڵاتی وەکو قازی محەمەد ناشێ کۆمەڵە بتوانێت دەسەڵات بەسەر ناکۆکییە خێڵایەتییەکاندا بکات لە ئەنجامی ئەوەدا لە تشرینی یەکەمی ساڵی 1944دا قازی محەمەد بانگهێشت کرا بۆ ئەوەی بێتە ناو کۆمەڵەوەو وەکو ڕابەری ڕۆحی و چرای ڕێنیشاندەر و دەنگی ڕێکخراوەکە بەڵام هەرگیز لە شێوەی ڕەسمی و ڕەسمیاتدا بۆ ئەندامی لیژنەی ناوەندی هەڵنەبژێردرا.

لە سەرەتای ساڵی1945دا دەرکەوت کە بۆ ئەوەی کۆمەڵە لە جێبەجێکردنی ئامانجە فراوانەکانیدا سەرکەوتن بەدەستبهێنێت پێویستیی بە یارمەتیدانی سەربازیی دەرەوە هەیە، لەبەرئەوەی کە یەکێتی سۆڤێت باکووری ئێرانی داگیرکردبوو و، خۆیشی لە بوونی کۆمەڵەدا هەڵقورتاندبوو بۆیە شتێکی سروشتی بوو ئەگەر لە لایەن یەکێتیی سۆڤێتەوە یارمەتی بدرایە، ئەگەرچی دەسەڵاتدارانی سۆڤێت ئاراستەی نەتەوایەتی کۆمەڵەیان بەدڵنەبوو و ڕازی نەدەبوون بۆ دروستکردنی پەیوەندیی بەهێزو پتەو لەگەڵ فیرقەی ئازربایجانی ئێرانیدا کە سۆڤێت پشتگیریی دەکرد، سۆڤێت بە فشار خستنەسەر کۆمەڵە مەبەستی ئەوەبوو ڕێگا بۆ یەکگرتنی بزوتنەوە جیاخوازییەکانی کورد و ئازەر خۆش بکات و هەردوو بزوتنەوەکەش بهێنێتەوە سەرهێڵی سیاسەتی ستالین و ئامانجەکانی لە ئێراندا بە مەبەستی دروستکردنی یەکێتیی نێوان کورد و ئازەر، حکومەتی سۆڤێتی جارێکی تر بانگهێشتی وەفدی باڵای کوردی کرد بۆ سەردانی باکۆو کۆبوونەوە لەگەڵ سەرۆك وەزیرانی ئازربایجانی سۆڤێتی جەعفەر باقرۆفدا، وەفدە کوردییەکە لە ئەیلوولی ساڵی1945دا بە سەرۆکایەتی قازی محەمەد و بە نوێنەرایەتی ئەندامانی بەرزی تری کۆمەڵە لەوانەش عەلی ڕەیحانی کە ئامۆزای قازی بوو هەروەها سەیفی قازیشی تێدابوو گەیشتە باکۆ، باقرۆف بەڵێنی یارمەتیی دارایی و سەربازی بە کورد دابو بۆ درێژەدان بە ڕۆیشتن لەسەر داواکارییەکانیان هەروەها باقرۆف سیاسەتی نەتەوایەتیی سۆڤێتی ڕوون کردەوە و باسی ئەوەشی کرد کە چۆن کورد ئارەزوومەندی سەربەخۆییە، بەڵام ئەو سەربەخۆییە دەبێت لەگەڵ سیاسەتی سۆڤێتیدا بگونجێت: (ئەو گەلانەی کە

خاوەنی زمان و کەلتووری جیاوازی خۆیانن، پێویستە حکومەتی سەربەخۆیان هەبێت) ئێران چوار نەتەوەی لەم جۆرەی تێدایە کە ئەوانیش بریتین لە نەتەوەی فارس کە خاوەنی زمانی فارسین و گەلی قسەکەر بە زمانی جیلاکی کە لە باشووری لیتۆرلی کاسپەین(بەلوچ) دەژین و ئازەربایجانییەکان کە بە تورکی دەدوێن و گەلی کوردی خاوەن زمانی کوردی لە کوردستاندا. هەریەکە لە مانە ئارەزووی بوونی ئۆتۆنۆمیی ناوخۆی هەیە، یەکەمیشیان کە زیاتر ئەو ئارەزووەی هەیە تورکی ئازەربایجانە.. پێویست نەبوو کورد ئەوەندە پەلە بکەن لە دامەزراندنی دەوڵەتی خۆیاندا، سەربەستی کورد پێویستە پشت ببەستێت بە سەرکەوتنی هێزە میللییەکان لە عیراق و تورکیادا نەک تەنیا بووەستێتە سەر سەرکەوتنی ئەو هێزانە لە ئێراندا دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیی جێگای حەزو ئارەزوو بوو کە لە داهاتوودا دروست ببێت، بەڵام کاتێك کە هەموو نەتەوەی (کورد) بتوانێت یەك بگرێتەوە لە هەمان کاتدا ویستەکانی کورد ئێستا پێویستە لە سنووری ئۆتۆنۆمیی ئازەربایجاندا جێبەجێ بکرێت.

قازی محەمەد وەڵامی ئەوەی دایەوە کە کورد پێویستیی بە دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی بووە لەو کاتەداو نەیانوویستووە چارەنووسی خۆیان ببەستن بە چارەنووسی ئازربایجانەوە سەرباری هەموو شتێك، دەبێت یەکێتی کوردی بگاتە ئەنجام و بەدی بێت لەگەڵ براکانی تریدا لە عێراق و تورکیادا، باقرۆف وەڵامی دایەوە کە پێویستبوو کۆمەڵە خۆی بگۆڕێت بۆ حیزبێکی سیاسیی دیسپلینکراو وسوپای خۆیی هەبێت هەتا ئامانجی کوردستانێکی سەربەخۆ درك پێ بکات و هەروەها کۆمەڵە پێویستیی بە دەربازبوونە لە تێڕوانینی تەسکی بۆ ئەوەی سۆڤێت پاڵپشتی بکات. لە ئاکامی ئەوەدا لە ئەیلوولی ساڵی1945دا حیزبێکی نوێی سیاسی دامەزرا کە ئەویش پارتی دیموکراتی کورد بوو، قازی محەمەد هانی هەموو کوردیدا تەنانەت ئەندامانی کۆمەڵەش کە بچنە ریزی ئەو حیزبە نوێیەوە وەکو کۆبوونەوە لە ژێر سایەی ئەو دەستەیەدا لە پێناوی بەدەستهێنانی سەربەخۆیی کورددا.

هەر زوو ئاشکرابوو کە پارتی دیموکراتی کورد کە سۆڤێت نەخشەی دانابوو لەگەڵ بنیادی دیموکراتی بڕیاردەری کۆمەڵەدا ناتەبا بوو، لە کاتێکدا کۆمەڵە لەسەر شێوازی دیموکراتیی لیبراڵ ی دەڕۆیشت، پارتی دیموکراتی کورد خۆی وەکو حیزبێك ناساند کە یەك کەس دەسەڵاتدارە تیایدا ئەویش قازی محەمەدە. پارمەتیدەرە کوردەکانی قازی وایان کرد کە ئەو قسانەی بەرامبەر تاك دەسەڵاتیی قازی دەکرا نەمێنێت ئەورەحمانی قاسملۆ کە دواتر بوو بە سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران مەدحی قازی محەمەدی کردووە بۆ رابەرایەتیی ئەزموونگەرانەیی و توانای بێ وێنەی بۆ چەسپاندن و پێداگرتنی لەسەر دۆزی کورد لە پشتگوێ خستنی ژیانی تایبەتی خۆی (واتە بەخۆبەختکردنی لەو پێناوەدا).

بەرنامەی پارتی دیموکراتی کوردستان لە رەشنووسی بەیانێکدا لە ژێر سەرپەرشتیی سەفارەتی سۆڤێتدا لە ورمیە نەخشەی بۆ دانراو لە لایەن قازی محەمەد و 105ئەندامی ئەم حیزبە نوێیەوە ئیمزاکرا بە کورتی بەرنامەکە ئەم داواکارییانەی خوارەوەی تێدابوو:

1. گەلی کورد لە ئێراندا دەبێت ئازاد بێت و حکومەتی خۆیی هەبێت بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ناوخۆیی خۆیان و لە سنووری دەوڵەتی ئێراندا کورد ئۆتۆنۆمی بەدەست بهێنێت.

2. زمانی کوردی دەبێت لە پەروەردە و فێرکردندا بەکار بهێنرێت و ببێتە زمانی رەسمی لە کاروباری بەڕێوەبردندا.

3. ئەنجومەنی هەرێمایەتیی کوردستان دەبێت بە زوویی بە پێی یاسایەکی دەستووری هەڵبژێردرێت و پێویستە سەرپەرشتیی هەموو کاروبارەکانی دەوڵەت و مەسەلە کۆمەڵایەتییەکان بکات و بیان پشکنێت.

4. دەبێت هەموو کاربەدەستانی دەوڵەت لە کوردستاندا خەڵکی کوردستان و ئەسڵ کوردبن.

5. پێویستە یاسایەك بۆ جوتیار و خاوەن مڵك دەربچێت و داهاتووی هەردووکیان پارێزراوبێت.

6. پارتی دیموکراتی کوردستان هەوڵێکی تایبەتی دەدات بۆ بنیادنانی یەکێتی و برایەتییەکی پتەو لەگەڵ گەلی ئاربایجان و ئەو گەلانەی تر کە لە ئازربایجان دەژین وەکو(ئاسوری‌و ئەرمەنی‌و.... تاد) لە خەبات و تێکۆشاندا.

7. پارتی دیموکراتی کوردستان خەبات دەکات بۆ چاککردنی باری ئەخلاقی و ئابووریی گەلی کورد لە رێگای ئیستیسمارکردنی سەرچاوە سروشتییە زۆر و زەبەندەکانی کوردستانەوە و لە برەوپێدانی کشتوکاڵ و بازرگانی و پێشخستنی باری تەندروستی و پەروەردەوە.

8. ئێمە خوازیاری ئەوەین کە ئەو گەلانەی لە ئێراندا دەژین بتوانن بە ئازادی خەبات بکەن بۆ بەختیاری و پێشکەوتنی وڵات.

مەرجێکی تر لە داواکارییەکان ئەوە بوو کە هەموو ئەو داهاتە حکومییەی لەکوردستاندا کۆ دەکرێتەوە بە شێوەیەکی چاك لە هەرێمی کوردستاندا خەرج بکرێت.

حکومەتی ئێرانی ئەو بەیانەی بە جۆرێك لە تەحەددا بۆ دەسەڵاتی خۆی دانا لە کوردستاندا، هەروەك ئەو بەیانە یەکەمین هەوڵی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو بۆ بە هێزکردنی خۆی، سەرباری ئەو ئاماژانەی کە لە بەیانەکەدا بۆ یاسای دەستووریی ئێران کرابوو، لە راستیشدا ئەو ترسەی دەسەڵاتدارانی ئێران بوو بە واقیع کاتێك پارتی دیموکراتی کوردستان کۆمارێکی رەسمی لە22ی کانوونی دووەمی ساڵی1946دا راگەیند، لە کۆبوونەوەیەکدا کە سەرکردەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و ژمارەیەك لە سەرۆك خێڵ و مەلا مستەفای بەرزانی (سەرۆکی پایەبەرزی

کوردی عێراق) کە هێزەکانی هاتبوونە سنووری ئێرانەوە بۆ پێشکەشکردنی یارمەتیی سەربازی بۆ راپەڕینی کورد لە ئێراندا. کاتێك کۆمەڵە پێکهات لەگەڵ سێ ئەفسەری سوپای سووری سۆڤێتدا، لەم کۆبوونەوەیەدا قازی حەمەد بە سەرۆکی کۆمارە نوێیەکە هەڵبژێردرا و کابینەیەکی نوێ پێکهێنرا کە ئەوکابینەیەش بە شێوەیەکی سەرەتایی لە سەرکردەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لە مهاباد پێکهات جەنگاوەرەکانی مەلا مستەفا هاریکاریی هێزی خێڵەکانی ئەو ناوچەیەیان کرد بە مەبەستی پێکهێنانی بڕبڕەی پشتی سوپای کۆمارە نوێیەکە کەجێگای بایەخە ئەگەر تێبینیی ئەوە بکرێت کە قازی محەمەد و سەیفی قازیش کە وەزیری جەنگی کۆمارە نوێیەکە بو هەردووکیان جلوبەرگی رەسمیی جەنەراڵی سۆڤێتییان لەبەرکرد، لەگەڵ ئەوەشدا قازی محەمەد لە سەر داوای هاوەڵەکانی تەربووشە سپێیەکەی لەسەرکرد بۆ ئەوەی مەکانەتی ئایینی دەربخات.

لەو کاتەوە کە کۆماری مهاباد دامەزرابوو، سۆڤێتییەکان لە یارمەتیدانی هاوپەیمانەکانیان لە فیرقە سەرکەوتوو بوون بۆ دامەزراندنی کۆماری سەربەخۆی خۆیان لە ئازەربایجان بە ناوی کۆماری دیموکراتی ئازربایجان لە وتەیەکی کورتدا کە قازی محەمەد دوای دروستبوونی کۆمار ئاراستەی خەڵکی کرد و زیاتر بۆ قایلکردنی سۆڤێتی پارێزەری بوو، پیرۆزبایی لە(ئازربایجانییەکان) کرد بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی و هێوای ئەوەی دەربڕی کە ببنە یارمەتیدەری چەسپاندنی کۆمارە دامەزراوەکەی ئەمان و ئەمەش ببێتە هۆی درێژەپێدانی هاورێیەتیی نێوان ئەم دوو کۆمارە سەربەخۆیەی کە سۆڤێت پاڵپشتیان بوو، هەروەك ولیەم ئیگڵتن گوتوویەتی لە مەراسیمەکەدا هیچ کەس نەیوویست ئەو موناسەبەتە خۆشە تێك بدات بە پرسیارکردنی لە رادەی دڵسۆزێتی بۆ ئەو برایەتییەی کورد و ئازەرییەکان کە قازی محەمەد رایگەیاند سۆڤێتییەکان ئاگاداری جیاوازییە گرنگەکانی نێوان مەسەلەکانی کورد و ئازەری بوون، هەر لەو روانگەیەشەوە بە تەواوی ئاگاداری پێویستی گەیشتن بە رێککەوتنی عەمەلیی نێوان کۆمارەکانی کورد و ئازەربایجان بوون بە مەبەستی پارێزگاریکردن لە نفوزی تەواوەتی خۆیان لە باکووری ئێراندا. ئەویش لە رێگای بوارپێدانیانەوە بۆ بەدەستهێنانی زیاترین ئیمتیاز لە حکومەتی ئێرانی.

لەم چوارچێوەیەدا بوو کە وەفدێك بە سەرۆکایەتی قازی محەمەد کە نوێنەرەکانی سۆڤێتیشی تێدابوو چوو بۆ تەورێز لە ئازربایجان و لەگەڵ نوێنەرانی کۆماری ئازربایجان کۆبوونەوە بە مەبەستی پێکهێنانی بەرەیەکی یەکگرتوو دژی حکومەتی ناوەندی لە تاران، قازی محەمەدو سەرۆك کۆماری ئازربایجان جەعفەر پیشەوەری بە هاندانی سۆڤێتی لە23ی نیسانی 1946 رێکەوتننامەیەکی هاورێیانەیان بۆ هاریکاریکردن ئیمزاکرد رێککەوتننامەکە گەلێك سەرچاوەی برایەتی کورد و ئازەری خستبووە روو، لەوانەش کە پانتایی هاریکاریکردنی لە نێوان ئەو دوو کۆمارە تازە دامەزراوەدا نەخشە کێشابوو زمانی رێککەوتنامەکە سەرباری هەندێ پڕوپاگەندەی دژ هیچ گومانێکی لای تاران نەهێشتبووەوە و تاران دڵنیابوو لەوەی کە ئەو دوو کۆمارە بەرەو سەربەخۆیی تەواو لە ئێراندا هەنگاودەنێن، بۆ نموونە رێککەوتننامەکەداوای ئاڵوگۆڕکردنی نوێنەرایەتیی دەکرد لە دیوانی هەردوو کۆماردا (کە ئەوەش نزیك بوو لە گۆڕینەوەی کاربەدەستانی دیبلۆماسی لە نێوان ئەو دوو دەسەڵاتەی دەوڵەتی دوو نەتەوەدا، هەروەها پێکەوەبەستنی نەخشەو پلانی سەربازی و ئابووری و بازرگانی و رێککەوتنی رۆشنبیری لە نێوان دوو کۆمارەکەدا، لە خاڵەکانی نێو ئەو رێککەوتننامەیە بوون. رێککەوتننامەکە زیاتر گفتوگۆکانی داهاتووی لەگەڵ حکومەتی ئێرانیدا دەبەستەوە بەو بنەمایەوە کە دەبێت لە هەر گفتوگۆیەکدا بەرژەوەندییە هاوبەشەکانی کۆماری کورد و کۆماری ئازربایجان بەهێند بگیرێت.

رێککەوتننامەی نێوان کورد و ئازربایجان لە ساڵی1946دا شێوازو ئاراستەی گیروگرفتی سەختی نێوان داواکانی ئەو دوو نەتەوەیە و ململانێ ئیتنیکییەکانی گۆڕی، بەندی دووی رێککەوتننامەکە دەڵێت لەو ناوچانەی ئازربایجان کە کەمایەتیی کوردی لێیە، لە دامەزراوەکانی حکومەتدا کوردەکان دادەمەزرێن و لەو ناوچانەی کوردستانیش کە کەمایەتیی ئازەری لێیە، ئازربایجانییەکان لە دامودەزگاکانی حکومەتدا دادەمەزرێن، بە هەمان شێوە بەندی شەشی رێککەوتننامەکە دەڵێت حکومەتی نەتەوەیی ئازربایجان هەنگاوی پێویست دەنێت بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی بەکارهێنانی زمانی کوردی و پێشخستنی کەلتووری کوردی لە نێو کوردەکانی ئازربایجاندا، حکومەتی نەتەوەیی کوردیش هەنگاوی هاوشێوە دەنێت بە گوێرەی ئەو ئازربایجانییانەی لە کوردستان دەژین.

نە کۆماری کوردیی مهاباد و نە کۆماری دیموکراتی ئازربایجان هەنگاوی جیدییان نەنا بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکانی رێککەوتننامەکەیان لە ئاکام بزوتنەوەی نەتەوایەتی و پێداویستییە لە رادەبەردەرە ناوخۆییەکان سەلماندیان کە ئەو مەسەلەی یەکگرتنە(هاریکارییە) مەسەلەیەکی پڕ تەنگ و چەڵەمەیەو پەیوەندی و پێکەوە پەیوەستبوونی ئەو دوو کۆمارە کە لە ئامۆژگاری و لە بەرژەوەندیی هێزێکی بێگانەدا بوو شکستی هێنا، سەرەرای ئەوەش کۆمارەکانی کورد و ئازربایجان وا حساب دەکران کە دەسکەوتی سۆڤێتن و بە مەبەستی ئیفلیجکردنی باری سەربازیی ئێران، بەڵام یەکێتیی سۆڤێت و ئێران دەستیان کرد بە زنجیرەیەك چالاکیی دیبلۆماسی بە مەبەستی چاککردنی پەیوەندییەکانی نێوانیان.

سۆڤێتییەکان لە گفتوگۆکانیاندا لەگەڵ ئەحمەد قەوامومولسەڵتەنە سەرۆك وەزیرانی ئێراندا بەڵێنی کشانەوەی هێزەکانی سۆڤێتییان لە ئی ّران دا بەرامبەر بەوەی کە ئێران ئیمتیازی دەرهێنانی نەوت لە بیرە نەوتییەکانی باکوور بدات بە سۆڤێت، ئەحمەد قەوامولسەڵتەنە سەرۆك وەزیران بیری سۆڤێتییەکانی خستەوە کە دەبوو پەرلەمانی ئێرانی دان بە بەخشینی ئیمتیازی نەوتدا بنێت، بەڵام لەبەر ئەوەی کاتی پەرلەمان لە هەڵبژاردنەوە بۆ ئێستا بەسەر چووە، هەڵبژاردن پێویست بوو بۆ پەرلەمانێکی نوێ هەر چەندە هەڵبژاردنی پەرلەمان بە پێی دەستووری

ئێرانی بواری پێ نەدەدرا لە کاتێکدا هێزەکانی بێگانە بەشێک لە وڵاتیان داگیر کردبوو، لە ڕێککەوتننامەی نیسانی 1946دا یەکێتیی سۆڤێت بەڵێنی کێشانەوەی هێزەکانی خۆی لە ناوچەکانی ئێران داو، هەروەها بەڵێنیشیدا کە مامەڵەی کێشەو گۆڕانکارییە خێراکەی ئازربایجان وەکو مەسەلەیەکی تەواو ناوخۆی ئێران بکات، ڕێککەوتننامەکە لە لایەکی ترەوە داوای دامەزراندنی کۆمپانیای نەوتی هاوبەشی ئێران و سۆڤێتی دەکرد، لە 9ی مایسی ساڵی 1946دا سۆڤێت لە ئێران کشایەوە بەڵام پەرلەمانی ئێرانی نە دانی بە ئیمتیازی نەوتدا نا، نە بە دامەزراندنی کۆمپانیای هاوبەشی نەوتدا.

لە ئەنجامی هەستکردنی ئازربایجانییەکان بە کشانەوەی سوپای سوور لە ئێران و لە ئەنجامی جێبەجێکردنی کشانەوەی ئەو سوپایەدا ئازەربایجانییەکان کەوتنە گفتوگۆکردن لەگەڵ قەوامی سەرۆک وەزیران و لە ئاکامی ئەو گفتوگۆیەشدا رازی بوون کە ئازربایجان بەشێکی جیانەکراوە بێت لە ئێران، لە بەرامبەردا قەوام ژمارەیەک ئیمتیازاتی سیاسی و ئابووری پێدان، ئەوانەش دان نان بە قەوارەی یاسایی و تەنفیزیی کۆماری ئازربایجاندا وەکو حکومەتێکی یاسایی ناوخۆیی، هەروەها بەڵێندان بە زیادکردنی قەوارەی نوێنەرایەتیی ئازربایجان لە پەرلەمانی ئێرانیدا بواردان بە کۆماری ئازربایجان بۆ پاراستنی ئاسایشی ناوخۆیی لە ڕێگای هێزەکانی ئاسایشی خۆیەوە هەروەها بواردان بە بەکارهێنانی دوو لەسێی داهاتی کۆکراوە لە ئازربایجان بۆ پێشخستنی پرۆژەی ئابووری ناوخۆیی ئەو هەرێمە، ئازربایجانییەکان بۆ ئەوەی وا خۆیان نیشان نەدەن کە ناپاکییان لە ڕۆحی ئەو ڕێککەوتننامەیە کردووە کە لەگەڵ کۆماری مهابادا ئیمزایان کردبوو، وەفدەکەیان قاوامیان ناچارکرد کە سیستەمی پەروەردە و فێرکردن چاک بکات و بواری منداڵانی ئازەری و کورد بدات کە بە شێوەیەکی سەرەکی بە زمانی نەتەوەیی خۆیان بخوێنن لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا.

تەنانەت کۆماری مهابادیش جارجار لە گفتوگۆی نێوان ئێران و ئازەربدا لە لایەن سەدری قازییەوە نوێنەرایەتی دەکرا، بەڵام کوردەکان گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە ئەو ڕێککەوتننە شتێکی زۆر کەمی لە داواکانی کورد جێبەجێ دەکرد، لەبەرئەوە وەفدی کوردی لە مهابادەوە بردرا بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ قەوامدا، بە پێچەوانەی هاوشێوە ئازەربییەکانیانەوە وەفدی کوردی نەیتوانی هیچ ئیمتیازێک لە سەرۆک وەزیرانی ئێران بەدەست بهێنێت ئەوەش بۆ کوردەکان بێ ئومێدییەکی تەواو بوو، قەوام پێی گووتن کوردستان بەشێکە لە ئازربایجان ئەگەر کورد ناوچەی خۆیان بویستایە لە ئێراندا، دەبووا لەگەڵ کۆماری ئازربایجان گفتوگۆیان بکردایەو ڕەزامەندیی ئەویان بۆ داواکارییەکانیان بەدەست بهێنایە، چونکە بەپێی بۆچوونی قەوام کۆماری مهاباد بنەمایەکی یاسایی(شەرعی)نەبوو لە لایەک وەکو کەمایەتییەکی ئێتنیکی لە سنووری دەوڵەتی ئێراندا، لە لایەکی تریشەوە وەکو کەمایەتییەک لە حکومەتی ئازربایجاندا.

ئەم گفتوگۆیانە پە یوەندییەکانی ئازەری و کوردیان ئاڵۆزکردو بووە هۆی پێکدادان و ئەو پێکدادانەش زیاتر پەرەی سەند کاتێک سوپای سوور دەستی کرد بە گواستنەوەی هێزەکانی لە ئێران، لە کاتێکدا سوپای سووری سۆڤێتی لە ئازربایجان و کوردستان دەکشایەوە، سوپای ئێرانی وردەوردەکەوتە چەکداماڵینی هێزە ئازەری و کوردەکان و لەگەڵ کۆتایی هاتنی پاراستنی سۆڤێتدا سوپای ئێران دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندیی(تاران)دامەزراندەوە کۆمارە سەربەخۆکەی ئازربایجان بوونی کەوتە بەردەم مەترسیی کۆتایی هاتنێکی بە پەلەوە و لە سەرەتای کانونی یەکەمی ساڵی 1946دا هەرەسی هێنا.

کۆماری مهابادیش ڕووبەڕووی هەمان چارەنووس بووەوە کاتێک هێزی سوپای چوارەمی ئێران بە فەرماندەیی جەنەراڵ هۆمایۆن کە تازە سەرۆکایەتیی شاڵاوێکی سەرکەوتووی بۆ پووچکردنەوەی ڕاپەڕینی خێڵەکان لە ناوچەی باشووری خوزستان کردبوو ئابلوقەی مهابادیدا سوپای ئێران لە ڕۆژی 17ی کانونی یەکەمی ساڵی 1946دا چووە ناو مهابادەوە و کۆماری مهاباد کە هێشتا ساڵێکی تەواو نەکردبوو رووخێنرا دادگای سەربازیی قازی محەمەد و سەدری قازی و سەیفی قازی بە خیانەت تاوانبار کرد و بە ئاشکرا لە گۆڕەپانی سەرەکیی مهابادا لە رۆژی 31ی ئازاری ساڵی 1947دا هەڵواسران، بنەما و بەشە پێکهێنەرەکانی کۆمارەکە رووخێنران و ئەو دیاردانەی کە مەسەلەی نەتەوایەتیی کوردیان نیشان دەدا وەکو فێربوونی زمانی کوردی قەدەغە کران.

سەرباری ئەو ڕاستییەی کە کۆماری مهاباد پیادەی دەسەڵاتی بەسەر کەمتر لە سێیەکی کوردی ئێراندا کرد و بۆ ماوەی کەمتر لە ساڵێکیش بەردەوام بوو بەڵام وەکو خاڵێکی سەرچاوەی بزوتنەوەی کوردایەتی ماوەتەوە لە هەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، لە سەردەمی فەرمانڕەوایی کۆماری مهابادا زۆرێک لە داخوازییەکانی کورد بەدی هاتن، زمانی کوردی بوو بە زمانێکی ڕەسمی، گۆڤار و ڕۆژنامە بە زمانی کوردی دەرچوون وبڵاوکراوەی ئەدەبی پەرەی سەند، پێشمەرگەی کورد جێگای یەکەکانی پۆلیسی ئێرانیی گرتەوە و دامودەزگای حکومەتی کوردی پێکهات و... هەوڵ و کوشش خرایە کار بۆ هاندانی پێکهێنانی هەرێمی تری ئۆتۆنۆمی لە وڵاتدا هەروەها هەوڵدرا هەتا کوردستان بکرێت بە زەمینە بۆ(هەموو هێزە دیموکراتەکانی ئێران)، لەو کاتەوە تاکو ئێستا هیچ بزوتنەوەیەکی کوردی لە وێنەکردنەوەی دەستکەوتەکانی کۆماری مهابادا سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە.

### سەرچاوە

ئیتنۆ نەتەوایەتی کوردیی، نادر ئینتیسار، وەرگێرانی عەتا قەرەداغی، چاپی یەکەم- سلێمانی 2004: لە چاپکراوەکانی خانەی وەرگێرانی سەربە وەزارەتی ڕۆشنبیری سلێمانی.

# تایبەتمەندیەکانی قازی محمد و کۆمارە کوردییەکە

نوسینی : ئارچی روزڤلت

وەرگێڕانی : ئەکرەم قەرەداخی




دوای ماوەیەک پێکدادان، قازی محمد بڕیاریدا، پەردە ئاسنینەکە لە سەر خۆی لا بدات، دەرفەتی رەخسان بۆ چاودێرانی دیکەی جگە لە سۆڤیەتیەکان بۆ ئەوەی سەیری وولاتەکەی بکەن. بەڵام دەرفەتی بە بەریتانیەکان نەدا، سەیری وولاتەکە بکەن، چونکە هەستی خەڵک بەرامبەریان خراپ بوو، بە هۆی دەرکەوتنی بارزانیەکان لە عێراقدا و بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی زۆری سۆڤیەت دژی بەریتانیا، رووداوەکانی لەوەپێشیش کە کوردەکان هەستیان دەکرد خۆیان قوربانی هەلپەرستی بەریتانیایی بوون.

لە چەند رێکەوتنێکدا، چوار ئەمەریکی و ئەفسەرێک دەبوونە میوانی قازی محمد، رای ئەو چاودێرانە ئەوە بوو کە چارەنووسی کۆمارە کوردی‌یەکە هەر رووخانە.

لەگەڵ ئەوەی ئەم کۆمارە هیچ بنەمایەکی یاسایی نەبوو، بەڵام کۆمارە دیفاکتۆکە (Defacto)ی قازی محمد هەر بەردەوام بوو، تەنها گۆڕان ئەوە بوو، کە ناوی وەزیرەکان کرابووە (رەئیس)، سەرۆک، قازی محمد خۆشی بووە پێشەوای حزبی دیموکراتی کورد.

لادێکانیش لەلایەن خاوەن زەوی و دەرەبەگەکانی پێشووەوە بە یارمەتی بەڕێوەبەرێتی ژەندرمەی خۆیەتیەوە، دەبرا بە ڕێوە، کە بەرگی کوردیان لە بەردا بوو، و لە ژێر فەرماندەی ئەفسەرانی مەهاباد دا بوون، ئەوانیش لەسەر شێوەی سۆڤیەتی رێک خرابوون.

مەهاباد، خۆشی لە شارۆچکەیەکی ناخۆشی ئێرانیەوە، بوبوە شارێکی رەنگاورەنگ شایانی وێنە گرتن بوو، شەقامەکانی پڕ بوو لە خەڵک کە بە جلی نەتەوەیی کوردی یەوە ئازاد بوون، ئەگەر بۆ ماوەیەکیش بێت. لە ژێر دەستی ژەندرمەو سەربازە ئێرانی یە حەز لێ نەکراوەکان رزگاریان بوبو.

ئەو کەسانەی بەختیان هەبوو، دیدەنی قازی محمدیان کردبوو، سەریان لە کەسایەتیەکەی سووڕ مابوو، و بە ئاسانی لەو راستی‌یە گەیشتبوون کە بۆچی ئەم پیاوە لە هەموو شوێنێک بوبوە سمبولی نەتەوەی کورد.

پیاوێکی باڵا کورت، لە سەرەتای تەمەنی پەنجا ساڵی دا بوو، پاڵتۆیەکی سەربازی کۆنی لە بەردا، و ریشێکی تەنک و دەموچاوێکی زاهدی مەیلەو زەردباو بە هۆی نەخۆشیەکی گەدەیی یەوە، جگەرە ناکێشێت، دەنگی ئاوازێکی هێمنی تێدایە، دەنگێکی خۆشی هەبوو، کە هەموو ووشەیەک پێش دەربڕینی دانی پیا دەنرا، جوڵانەوە و بزاوتی لە کاتی گفتوگۆدا زۆر بە تەواوی نیشانەی لە خۆ دڵنیا بوون و وقاری دەنواند، جوان پەرست و هەموو گەلانی دنیای خۆش دەویست، گەلێک زمانی دەزانی لە ناویاندا رووسی، و هەندێک ئینگلیزی و و ئیسپیرانتۆ Espiranto. بە ئاسایی دەزانی لە سەر مێزەکەی کتێبی رێزمانی زمانەکان وچیرۆک و کارە ئەدەبیەکانی بە زمانە بێگانەکان لەسەربوو.... وادەردەکەوێت وەک پیاوێک بێت بڕوایەکی پتەوی هەبێت و ئازایەتیەکی دەگمەن و گیانی لە خۆ بوردن و قوربانی دانی تێدابێت.

بەڵام ئەو گیانە دەوڵەمەند کرابێت بە ئەقڵێکی فراوان و هاوچەرخەوە. لە کاتی بوونی کێشەیەک دا، بە لای کەمەوە داواکانی هاوچەرخ بوون. خودموختاری (ئۆتۆنۆمی) بۆ کورد، لە چوارچێوەی دەوڵەتی ئێراندا. هەروەها ئەویش وەکو زۆر کوردی

دیکە، هەر ئەو بیرەی هەبوو کە مادام ئەمانیش، سەر بە هەمان خیزانی ئیرانین وەکو فارسەکان، کەواتە هیچ جۆرە ریگریك نی یە لە دروست کردنی یەکیتی تەواو لە نیوان کورد و فارسدا، هەروەك لە کۆندا، میدیەکان و فارسەکان کردبوویان. قازی خۆشی لەو بروایەدا بوو، کە کورد لە نەوەی میدیایە. هەر لە بەر ئەوەش بوو حەزی دەکرد ئیتمۆلۆژی (میدئاباد) یان (میدئاوا) بە شاری مهاباد ببەخشیت.

شتیکی زۆر ئاشکراو نەشاراوەیە، کە خۆی و پالپشتەکانی هەولیان بۆ بەدی هینانی خەونی دوا رۆژی هەموو کورد دەدا (یان کوردیزم Pan Kurdism)، ئاواتیان بوو، کە مهاباد ببیتە سەنتەری رۆشنبیری کوردیو بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد بە شیوەیەك کە جیگەی سەنتەرەکانی سوریاو سلیمانی ئەو کاتە بگریتەوە. هەولی بیشومار دەدرا بۆ ئەوەی پەروەردەو فیرکردنی کوردی لە سەر بناغەیەکی پتەو داریژریت. لە سەرەتادا مامۆستا کوردەکان، تیکستە فارسیەکانیان تەنها زارەکی لە پۆلەکانی خویندندا دەکرد بە کوردی بەلام پیش کەوتنی دەولەتە کوردی‌یەکە بە ماوەیەکی کەم، کتیبەکانی قوتابخانەی قۆناغی سەرەتایی چاپ کرا.

جگە لە رۆژنامەیەکی رۆژانەو گۆڤاریکی مانگانەی رامیاری، هەردووکیشیان ناویان (کوردستان) بوو، دووبارە، دوو گۆڤاری ئەدەبیش هەبوون بە ناوی (هاوار) و (هەلالە) (10) ئەم چاپکراوانە لە چاپخانەیەکەوە دەردەچوون کە سوپای سوور پیشکەشی پارتی دیموکراتی کوردستانی کردبوو.

بایەخ و گرنگ پیدانی قازی محمد بە ئەدەب و زمانی کوردی، رەنگە بە هۆی بوونی دوو شاعیری لاوەوە بوبی کە لە نووسینگەی دیوانی سەرۆکایەتی دا کاریان دەکرد، ئەوانیش (هەژار) و (هیمن) بوون، لەگەل نەبوونی و کەمی کاغەزیشدا، شیعرەکانیان چاپ دەکرا.

هەر چەندە، ئەم جۆرە هەولانە، ئەوەندە نەبوون کە کاتی تەمەنە کورتەکەی گۆڤارەکە بتوانیت بیگەیەنیتە رادەی ئەو دوو سەنتەرە رەسەنەی دیکە ی کەلتوری کوردی، کە زمانی کوردی بیست و پینج سالیك دەبوو تیایاندا بە ئازادی دەنوسران و دەخویندرایەوە. بەلام هەر چۆنیك بیت لە بارەی سیاسی یەوە، مەهاباد بوبوە خالیکی تیشکۆ Focal point کە هەموو کوردان چاویان تی بریبوو.

بازنە ئەقلانیە کوردیەکانی بەیروت، ئەستەمبول و بەغدا، هەروەها لە ناو شاخە سەرکەشەکانی خۆرئاوای ئاسیادا، ئەمانە هەموو بە یەك چاو دەیانروانیە ئەو کۆمارە، بزانن قازی محمد، سەر دەکەویت، یان ژیر.

چەندەها لە جاسوسەکانی قازی محمد، هەوال و پەیوەندیان لە کۆمەلە کوردە دامەزراوەکانەوە بۆ دەهینا، نەك تەنها لە عیراق بەلکو لە سوریاو لە تورکیاش. بزوتنەوەکەی زۆر جیگای رەزامەندی بوو بە تایبەتی بۆ لاوەکان، کەوا هەستیان دەکرد، پارتیە کۆنەکان شتیکی ئەوتۆیان بە دەست نەهیناوە، لەو کاتەدا، لە عیراقدا، پارتیکی نهینی چەپرەوی نوی لەم دەستە لاوانە بە ناوی (رزگاری) یەوە دروست بوبو.

## هەستی دژایەتی کردنی سۆڤیەت

پارتە نەتەوەیی یە کۆنەکانی (هیوا) لە عیراق و (خۆیبون) لە سوریا، زۆر بە پەرۆش نەبوون بۆ قازی محمد بە هۆی ئەو پەیوەندی یەی لەگەل سۆڤیەتیەکاندا هەیبو، لە بەر زۆر هۆ، ترس و بگرە رق لیهاتن لە سۆڤیەت لە ناو کورداندا زۆر بە توندی بلاو ببوەوە لە پلەی یەکەمدا، زوربەی کوردان، ئاینین، و گومانیان لە نیاز باشی سۆڤیەت بۆ ئاین هەبوو. و زۆر لە کوردان ئاوارەییان دیبوو، کە لە یەکیتی سۆڤیەتەوە رایان کردبوو، یان کوردەکان قسەیان لەگەل ئەو مسولمانانە کردبو کە لە ناو سوپای سوور و سۆڤیەتیدا بوون، کەمیکیان، وینەیەکی خراپیان دابوونێ دەربارەی بەشی زۆری خەلکی ناوچە خۆرهەلاتیەکانی ژیر دەسەلاتی سۆڤیەت، هەروەها پیویستە لە یادمان بیت، کەهەمیشە رووسەکان دوژمنیکی تەقلیدی کوردان بوون لە سەردەمی قەیسەرەکانەوە.

لە شەری یەکەمدا، هیزە روسەکان لە سەر رووبەریکی فراوانی کوردستان شەریان کردو لە دوای خۆیانەوە کاولیان کرد، و لە ویران کردن و روخان زیاتریان بە جی نەهیشت، پاشماوەکانی لە زۆربەی گوندو دەشتاییە کوردەکاندا دیارە.

لە شاری مهاباد خۆیدا، هیزی سۆڤیەتی بۆ چەند رۆژیك فەرمانی دابوو بە تەقە لی کردنی هەر کەسیك لە شەقامەکاندا دەردەکەویت و شارەکەش بەر تالانی و سوتان کەوتبو، ئەم وینانە، هەرگیز لە میشکی خۆرهەلاتیەکی کوردا دەرناچیت.

کە تا ئیستاش مندالەکانیان بە ووشەی (رووسی) دەترسینن، کاتیك دەیانەویت لە گریان بیان وەستیننەوە.

سۆڤیەتیەکان بە پەرۆشەوە، ویستیان ئەم هەستە خراپەی کورد بەرامبەریان بگۆرن، و بیسرنەوە، دەستیان کرد بە قسەکردن دەربارەی (ئۆتۆنۆمی کورد) لە یەکیتی سۆڤیەت و پالەوانیەتی (سەمەندسیامندۆڤ) کە کۆلۆنۆلیکی کورد نەژاد بوو لە سوپای سووردا و ناسرابوو بە پالەوانی لینینگراد. گرانە بزانریت سۆڤیەت تا چ رادەیەك توانی ئەم ئامانجە بهینیتە دی، بەلام گومان لەوەدا نی یە کە ژمارەیەکی زۆری خەلك لە ناویاندا، خاوەن زەویەکان و بازرگان و سەرانی ئاینی، بەردەوام بوون لە بی بروایییاندا، تەنانەت گەیشتە قازی محمد خۆشی، کە پەیوەندی بە سۆڤیەتەوە ئەوەندە زۆر بوو ناتوانریت نکولی لی بکریت.

دیوارەکانی ئەو بینایەی کە فەرمانرەوای حکومەتەکەی تیادا دەکرد بە پۆستەری پروپاگەندەی سۆڤیەتی رازابوەوە، گۆڤار و رۆژنامەکان پر بوون لەو مادە سۆڤیەتانەی کە ووشە بە ووشە

دەگۆڕانە سەر کوردی، و شاعیرەکانیش کەوتبونە پیا هەڵدان و وەسف کردنی ستالین و سوپای سوور.

لەگەڵ ئەمەشدا، بە پێچەوانەی ناوچەکانی دی ئازربایجانەوە کوردستان بە کرێ گیراوانی روسی تێدا نەبوو، جگە لە چەند شۆفێرێکی ئەڵانی کامیونە روسەکان، ئەمانە وەك بەکرێگیراوی فەرمانڕەوایەتی سۆڤیەت، یان وەك باوەڕ پێ کراوی بوون. بوونی هاوولاتی سۆڤیەتی لە ناویاندا، نە دەبینرا نۆکەرەکانی سۆڤیەتیش بە پەنهانی کاریان دەکرد و دەردەکەوتن. نوێنەرێکی سۆڤیەتی لە مەهاباد دادەنیشت بەلام دەسەلاتدارە کوردیەکان ئەمە بە درۆ دەخەنەوە[11]. هەریەك لە هاشمۆڤ، قونسولی سۆڤیەتی لە رەزائیە یاریدەدەرەکەی علی ئەکبەرۆڤ (Ali Akbarov) لە بۆنەکاندا دەردەکەوتن و دیدەنی مهابادیان دەکرد، لەگەڵ ئەوەی تیرۆر لە ئازربایجانی خۆرهەلاتدا بلاو بووەوە، بەلام لە کوردستاندا ژمارەیەکی کەم گیراوی سیاسی هەبوو، تەنها رووداوێکیش یان دوان تۆمار دەکرا، کە گومانی کوشتنی سیاسیان لێ بکرێت. هەندێك کوردی نەیاریش رایان کردبوو، مرۆڤ لە شەقامەکانی مهاباددا بە ئاسانی گوێی لە ئێستگەی رادیۆکانی ئەنقەرەو لەندەن دەبوو، لە کاتێکدا لە تەورێز گوێ گرتن لەو ئیستگانە سزاکەی مردن بوو. هەر چۆنێك بێت، هۆی ئەم ئازادیەیە لە بیروڕای قازی محمد و ئەندامانی وەزارەتە هاوچەرخە لیبرالی یەکەوە هەڵقوڵابێت یان بە هۆی بوونی سەرانی هۆزەکانەوە بێت کە رێگایان نەدەدا تیرۆر لە ریزی هۆزەکانیاندا بەرامبەر بە خەڵکی رووبدات. بەرئەنجامی ئەمەش ئەوە بوو کە رژێمەکە جۆرە میلیەتێکی لە ناو خەڵکی مەهابادا پەیدا کردبوو، چونکە بەوە بەختیار بوون کەلە دەست درێژی و چەوساندنەوە رزگاری کردبوون کە لە لایەن حکومەتی ناوەندەوە بە سەریاندا سەپێنرا بوو.

## دەست بە سەراگرتنەوەی دەسەڵاتی ئێرانی

لەم کاتەدا، رووداوەکان زۆر بە خێرایی تێپەڕ دەبوون، حکومەتی تاران داوای لە دیموکراتەکان کرد دەست لە ناوچەی زینجان (ZenJan) هەڵبگرن، کە بەشێك نییە لە هەرێمی ئازربایجان. کاتێك کە ئێرانیەکان زانیان کە دەبێت بەزۆر بیسەننەوە دیموکراتەکان رازی بوون کە ناوچەکە چۆڵ بکەن، لە دوای تشرینی دووەمەوە بە تەواوەتی لە ژێر دەستی سوپای ئێرانی دا بوون.

کەمێك لە دوای نیوە شەوی 10 ی کانونی یەکەم ئێرانیەکان هەڵیان کوتایە سەر بارەگای دیموکراتەکان لە قافلانك (Qaflankuh) لە باشووری میانە، لە دوای بیست و چوار کاتژمێر لە خۆڕاگراتن، پێشەوا دیموکراتیەکان لە هەڵهاتندا بوون بۆ یەکێتی سۆڤیەت، کە سالێك بە سەر ئەو رۆژە تێپەڕ بوبو کە دەستیان بەسەر تەورێزدا گرتبوو.

پارێزگاری دیموکراتەکان لە بروسکەیەکی خۆ تەسلیم کردندا بە قەوامی سەرەك وەزیرانی ئێرانی ووتبوو وا سەرۆکی کوردیەو سەیفی قازی، ئاگاداری ئەم بڕیارەیە و پێی راگەیەنراوە وا چاوەڕوان دەکرێت، ئەویش فەرمان بەهێزەکانی بدات، کۆتایی بە شەڕ و کینەیە بهێنێ.

لە 13ی تشرینی یەکەمدا، براکەی قازی محمد سەدری قازی کە ئەندامی پەرلەمانی ئێرانی و کاروباری نێوان براکەی و ئێرانیەکانی لە مەهاباد رێك دەخست لە (میاندواو) دەرکەوت، لەوێ چاوی بە ژەنەراڵ همایۆن کەوت و پێی ووت، کوردان ئامادەن بە ئاشتی بەخێرهاتنی سوپای ئێرانی بکەن، ژەنەراڵ همایۆنی ووتی کە ئەو داوای چۆڵ کردنی مەهاباد دەکات، لە لایەن بەرزانیەکانەوە، سوپاکەی خۆی بە زوترین کات دەجولێنێت.

پیاوانی چەند هۆزێکی سەر بە دەسەلاتی ئێرانی لە لایەن خۆیەوە نارد لەوانە هەندێك دیبوکری مامش و مەنگور کە بە سەرکردایەتی کولونیلی رکن غەفاری کە لە عێراقەوە گەڕابوونەوە، ئەمانە کە نزیك مەهاباد بوونەوە لە لایەن نوێنەری قازی محمدەوە بینران و پێی ووتن کە رێکەوتنەکەیان لەگەڵ جەنەراڵ همایۆنی دەربارەی داگیرکردنی شارەکە لە لایەن هێزی لەشکرەوە دەبێت نەك لە لایەن هێزەکان کە لە وانەیە کێشە دروست بکەن. لەدوایدا پیاوانی هێزەکە بێ شەڕ وازیان هێنا.

لە 15ی دیسەمبەری 1946 دا پاش ئەوەی بەرزانیەکان چوون بۆ نەغەدە، سوپای ئێرانی چووە مهابادەوە ئەمە سەرەتای کۆتایی هاتن بوو بۆ سالێکی تەمەنی کۆمارە کوردیەکە.

سوپای ئێرانی، بەخێرهاتنێکی گەرم و گوڕ کرا، قازی محمد و سەرانی لەشکری ئێرانی دیدەنی یەکتریان کرد بەلام لە رۆژی 17ی دیسەمبەر )کانونی یەکەم(، ژمارەیەك لە کورد گیران، لە رۆژی دواتریشدا، قازی محمد و سەیفی قازی و چەندەهایەکی دیکە گیران، تەنها ئەندامێکی حکومەتەکەی قازی محمد کە نەگیرا بوو حاجی بابا شێخ بوو، هۆی نەگرتنەکەشی، بە هۆی پایەی ئاینی یەوە بوو هەروەها ژمارەیەك لەو کوردانەی رایان کردبوو بۆ عێراق یان لە گوندەکاندا خۆیان شاردبۆوە، نەگیران.

سەرەڕای گرتنیش سەرانی کورد، سزای زیاتر دران بەوەی منداڵەکانی شێخ خرانە ژێر دەستی هۆزەوە بۆ ئەوەی تیایدا نیشتە جێ بن، بە خۆڕایی بخۆن، ئەم رێگایەش بە سزا دادەنرێ بێ ئەوەی دادگایی کرا بن.

لە 30 ی کانونی یەکەمیشدا سەدری قازی و براکەی لە ماڵەوە دەرهێنان و، گیران، کە تازە لە تارانەوە گەڕابوەوە لەگەڵ ئەوەی سالێکی تەواو بوو تارانی بە جێ نەهێشتبوو تەنها بۆ کاری نێوانی Mediator نەبێت کە حکومەتی ئێران پێی دەسپێردرا کەچی هەر گیراش.

لەشکری ئێرانی داوای لە خەڵك کرد کە هەر کەسێك داوایەك یان شەهادەیەکی هەیە دژی گیراوەکان با بچێت پێشکەشی بکات،

لە پاش دادگاییەکی سەربازی فەرمانی خنکاندن بە سەر هەریەکێك لە قازی محمد و سەدری قازی و سەیفی قازیدا درا و لە 31ی مارتی 1947 دا حوکمەکەیان بە سەردا جێبەجێ کردن و لاشەکانیان لە گۆڕەپانێکی مەهاباددا هەڵواسین[12].

حکومەتی سەربازی ئێرانی، پرۆگرامێکی بۆ نەهێشتنی هەموو ئاسەوارێکی حکومەتەکەی قازی محمد دانابوو هەموو رۆژنامە کوردیەکانی داخست، خوێندنی کوردی لە قوتابخانەکاندا قەدەغەکرد و هەموو کتێبە کوردیەکانی بە ئاشکرا سوتاند.

بۆ پیشاندانی هێزیش لە بەردەم هۆزەکاندا، سوپای ئێرانی، پانزە لە سەرانی هۆزەکانی فەیزولا بەگی و گەورەیی لە سەقز خنکان.

پێویستە باسی لایەنێکی دیکەی گەڕانەوەی شاری مهاباد بکرێت، ئەوە بوو کە لە دەوروبەری ئازربایجان کرێکار و جوتیار و دوکاندارەکان، هەر لە یەکەم دەرکەوتنی حکومەتی تارانەوە، هەرچی دیموکراتیەکانی ناوچەکە هەبوو، سەریانبڕی، ئەم بەرپەرچ دانەوە خێرایی یەی خەڵکی، نیشانەیەکی ئاشکرا بوو بۆ رژێم، کە خەڵك رقێکی زۆریان لە دیموکراتەکان بوو.

بەڵام لە مەهاباددا، کاروبارەکان زۆر بە هێمنی بە ڕێوە دەچوون لەگەڵ ئەوەی پۆلیسی نهێنی بەسەر هەموو ناوچەکانی ئازربایجاندا زاڵ بوو کەچی حکومەتی قازی محمد ئەم دەزگایەی نەبوو، نووسینی ئەم راستیە، ئەو راپۆرتانە دەسەلمێنێت کە حکومەتی قازی محمد، حکومەتێکی میللی بوو، لە باکوریشەوە عومەر خان و ئەو هۆزانەی لە ژێر دەستیدا بوون هیچ بەشداریەکیان لەم چالاکیانەدا نەکرد.

سوپای ئێرانی، حەزی نەکرد بە زۆر ناچاریان بکات لە بەر ئەوە هیچ هەواڵی جوڵەکەی بەرەو ئازربایجان بە عومەر خان نەوت، لە بەر ئەوە کاتێك عومەر خان هێزەکەی خۆی کۆکردەوە بۆ ئەوەی هێرش بکاتە سەر دیموکراتەکان، شەڕەکە کۆتایی هاتبوو.

عومەر خان و هۆزەکانی دیکە بە خێرایی بروسکەی دڵسۆزیان بۆ سەرانی ئێرانی نارد و هەمویان وەرگیرانەوە، تەنها زیرو بەگ نەبێت کە خۆی زۆر پڕکاری دانوسان بوو لەگەڵ جەنەراڵ همایۆنی، بەڵام پیاوەکانی بۆسەیەکیان بۆ سەربازە ئێرانیەکان لە بالانش balanesh نزیك رەزائیە نایەوە، لە پاشدا زیرۆ بەگ ناچار بوو کە لەگەڵ کۆمەڵە پیاوێکی و ژمارەیەك لە ئاشووریەکاندا بەرەو شنروێ را بکات لەوێ گەیشتنە مەلا مستەفاو بەرزانیەکان. کە لە حاڵەتی ئاگر بەستێکی گومان لێ کراو Precarious truce دابوو لەگەڵ حکومەتی ناوەندی، مەلا مستەفا، بڕیاری حکومەتی ئێرانی، بۆ دانان و فڕێ دانی چەکەکانیان، یان بۆ گەڕانەوەیان بۆ عێراق رەت کردەوە، سەر لەنوێ جارێکی دی شەڕ دەستی پێ کردەوە بەرەو ماکۆ، بۆ هەوڵێك بوو بۆ بڕینی سنووری سۆڤیەت.


**سەرچاوە**

کۆمارە کوردییەکەی مەهاباد

نوسینی: ئارچی روزڤلت

وەرگیری : ئەکرەم قەرەداخی

سلیمانی 2002




حزب دیموکرات کوردستان

جناب ژنرال ماجور محمد رشید خان



کوردستان

# کۆماری یانزەمانگە

## نەوت و جەنگی سارد

## خەونی سەربەخۆیی کورد لە باردەبەن

د. گرینتەر دێشنەر

و: حەمە کەریم عارف

دیمەنەکە هەر لەو تابلۆ بەنێوبانگە دەچوو کە(لینین)ی تێدایە و شۆڕشی ئوکتوبەری ساڵی1917رادەگەیەنێت، کرێکاران ڕۆژی پێشوتر لە مەیدانی چوارچرادا سەکۆیەکی دارینی گەورەیان دروستکردبوو، سەکۆکە بە هەر سێ ڕەنگی سووروسپی و کەسك، کە ڕەنگەکانی ئاڵای کوردبوون، رازێنرابوەوە، ئاڵای حیزبی دیموکراتی کوردستان(کۆمەڵەی جاران) بە هەر چوار دەوری مەیدانەکەدا هەڵکرابوو، شنەبایەکی هێدی ئەم ئاڵایانەی دەشەکاندەوەو لە هەموو لایەکەوە سێبەریان بەسەر مەیدانەکەدا



بڵاو دەکردەوە، ئەو بەفرەی کە دوێنێ باری بوو، هێشتا لەسەر شەقام و بەسەربانیماڵانەوە مابوو.

ئەو رۆژە، رۆژی1946/1/23بوو، واتە دووەم رۆژی مانگی رێبەندانی کوردی بوو. بەڵام لە رۆژژمێری مێژوودا، ئەو رۆژە یەکەمرۆژی تەمەنی یەکەم کۆمار و دوا کۆماری تا ئێستای کوردە. هەزاران کەس هەر لە نیوەڕۆوە ڕویان کردە ئەوێندەر: ئیدی لە خاوەن پیشەو فەرمانبەر وکاسبکارانی شاری مهابادەوە بیگرە تا دەگاتە میران و جەنگاوەرانی هۆزو تیرەکانی دەوروبەری مهاباد وەکو(گەورك)، (مامەش)، (مەنگوڕ)، (هەرکی) و(بەگزادە). هەر هەموو بە کورتەك و شەڕواڵ و مێزەرو دەرسۆکی خۆماڵی کوردییەوە هاتبوون.

بەڵام نوێنەرانی هەردوو هۆزی (شکاك) و(جەلالی) کە لە باکورەوە هاتبوون، جلەکانیان لە جلی قوقازییەکان دەچوو، بە قاپوتی لبادو سەرکڵاوی لبادەوە دیمەنێکی غەمگینیان هەبوو لە چاو دیمەنی رەنگاو رەنگی جلوبەرگی نوێنەرانی تیرە و هۆزەکانی دیدا، زۆربەی خەڵکی شار قاتی مەدەنی ئەوروپاییان لەبەردابوو، کە بۆ بۆنە گرینگەکان لە بەریاندەکرد، زۆربەیان لەگەڵ چاکەتو پانتۆڵدا دەرسۆك و مێزەری کوردیان لەسەرکردبوو، تا دیمەنێکی کوردی-ئیسلامی وەربگرن.

شاندێك لە ئەندامانی کۆمەڵە چوون بۆماڵی سەرۆکەکەیان و لەوێوە لەگەڵیدا بۆ مەیدانی چوارچرا هاتنەوە. قازی محمد جل و بەرگی تایبەتی بەم بۆنەیەوە لەبەرکرد بوو، لە تەورێز خەیاتێکی تایبەتی جلوبەرگی سەربازی راسپاردبوو کە قاتی ژەنەراڵێکی روسی بۆ بدروێ تا لەم رۆژەدا بۆ یەکەمجار لەبەریبکات، هەندێ لە هاور ێکانی، ئەوانەی زۆر مەیلیان بەلای روسیدا نەبوو، داوایان لێکرد کە کڵاوی روسی لەسەر نەنێ، بۆیە لەگەڵ جلە رووسییەکاندا عەمامە سپییەکەی خۆی لە سەرنا، وەکو رەمز و هێمایەك بۆ پایە ئاینییەکەی، ئەوجا بەرلەوەی سەربکەوێتە سەر سەکۆیەکە، پاڵتۆ ناڕێکەکەی داکەند. کەسەرۆکی حیزب کەوتە نوتق دان، ئاپورای خەڵکەکە کڕو بێدەنگ بوون.

قازی محمد، لە نێو ئاپورای خەڵکەکەدا هەستی بەبوونی تاقە یەك روسیکرد. ئەو پیاوە ئەفسەرێك بوو کە راسپێردرابوو، موتابەعەی مەسەلە کوردییەکان بکات. ئەم ئەفسەرە لەسەرجێبێکی ئەمریکییەوە چاودێری ئاهەنگەکەی دەکرد. گوتەکەی قازی محمد لە چارەکە سەعاتێك پتری نەخایاند بە کورتی و بە روونی بۆ ئامادەبووانی ئاشکراکرد کە کورد گەلێکە مێژوو، و زمان و رۆشنبیری تایبەتی خۆی هەیەو لەسەر خاکی خۆی لە کوردستاندا دەژی و مافی خۆیەتی دەوڵەتی تایبەتی خۆی هەبێ. بۆیە ئالێرەوە دامەزراندنی کۆماری مهابادی کوردی رادەگەیەنێت. سوپاسی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی کرد کە وەکو نوێنەری گەلی کورد و لە بری گەلی کورد، ئەویان(قازی محمد) بە سەرۆکی ئەم کۆمارە هەڵبژاردووە.

هەرچەندە وتەکە کورت بوو، بەڵام قازی محمد ئەوەندەی دەرفەت هێنا کە سوپاسی یەکێتی سۆڤیەت بکات بۆ ئەو کۆمەکە مەعنەوی و مادییانەی پێشکەشی کردوون، ئیدی چ ئەو کۆمەکەی کە وەریان گرتبوو، چ ئەوەش کە هێشتا وەریان نەگرتبوو، هەروەها پیرۆزبایی لە برا ئازەرییەکانیش کرد بە بۆنەی سەربەخۆییانەوە، چونکە ئەوانیش کۆمەکی چاکیان پێشکەش بەگەلی کورد کردبوو، هەروەها چاوەڕوانی ئەوەشیان لێدەکرا لە هەر دەرفەتێکدا کۆمەکی پێویست پێشکەش بە کورد بکەن کە قازی محمدی سەرەك کۆمار دامەزراندنی کۆمارەکەی راگەیاند و ویستی لە نێو چەپڵە رێزانی حەشاماتی خەڵکەکەوە بێتە خوارێ، ئیدی بوو بە تەقەی خۆشی و نزیکەی سێ سەد جەنگاوەری کورد بە جارێ تەقەیان بە ئاسماندا دەکرد.

**هەمیشە لە ماڵەوە بەشی میوانە رووسەکان، ڤۆدگا وەلاوە نرابوو؛**

پاش ماوەیەکی کورت ئەوە دەرکەوت کە راگەیاندنی کۆماری کوردی و گفت و بەڵێنی پێشکەشکردنی یارمەتی بە برا ئازربایجانییەکان، هێشتا زووبووە.. وا دیارە قازی محمد، مەوعیدی راگەیاندنی کۆمارەکەی بە سۆڤیەتەکان نەگوتبوو، و بۆیە ئەوانیش(سۆڤیەتەکان) لەلای خۆیانەوە نەیانتوانی بوو هاور ێکانیان لە تەورێزدا بۆ ئەم هەواڵە ئامادە بکەن، چونکە ئەم هەواڵە بەلای ئەوانەوە(ئازربایجانییەکان) بریتی بوو لەوەی بەشێك لە خاکی کۆماری ئازربایجانی خودموختاربێتە دابڕین و دەوڵەتێکی کوردی لە سەر بێتە دامەزراندن.

نیشانەکانی نارەزایی و واتەوات دەربارەی ئەم رەفتارو کارە کوردییە بە ئاشکرا لە رووداوێکی بچکۆلەدا دەرکەوت، کە دوو هەفتە پاش ئەو کۆبوونەوە مێژووییەی مەیدانی چوارچرا روویدا، دوو ئەندامی گەورەی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە تەورێزبوون بۆ ئەنجامدانی هەندێ کاروباریان، دکتۆر سەمەدۆڤ، کە ئەفسەرێکی گەورەی سۆڤیەتی بوو، سۆڤیەت بۆ مەبەستی خۆیان لە خەستەخانەی تەورێز وەکو پزیشك دایان نابوو، جا ئەم ئەفسەرە لێی پرسی بون کە بۆچی کوردان بێ ئەوەی دوارەزامەندی سۆڤیەتی وەربگرن، سەربەخۆیی خۆیان راگەیاندووە و دەوڵەتیان دامەزراندووە؟ دیارە کە قسەکانیان درێژە دەکێشێت، قسەیان لێکدی هەڵدەبەزێتەوە.

دوای چەند رۆژێك کە قازی محمد رێی دەکەوێتە تەورێز هەمان پرسیاری لێدەکەن قازی محمد وەڵامی دابوەوە کە (پری‌ماکۆڤ) ئاگاداری تەدارەك دیتنی کوردان بووە بە چاوی خۆی و لەسەر ئوتومبیلەکەیەوە لە دایکبوونی کۆمارەکەی دیتوە، بەوە خۆی پەڕاندەوە کە گوایە وێڕای هەموو ئەوەش چرای کەسکی بۆ راگەیاندنی کۆماری نێوبراو هەڵنەکردووە، بەڵام پێدەچێت جەنەڕاڵ(سالم ئاتاکیخوف) کە راسپێردرابوو سەرپەرشتی کاروباران لە کوردستاندا بکات، قەناعەتی بە بۆچونەکانی قازی محمد کردبێ یان لە مۆسکۆ و باکۆوە ئامۆژگاری بۆ نێردرابێ بۆیە

کەوتە بەر پەرچدانەوەی سەرۆکی تورەی ئازربایجانی و هێدی کردنەوەی و کەوتە ستایشی هەنگاوەکانی کوردان. (دیریك کینان) کە وەکو دیپلوماتێك لە(UN) کاری دەکرد و لە پەنجاکاندا بایەخێکی تایبەتی بەدۆزی کورد دەدا، ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە گوایە(سالا ...اکیخوف) بەر لەو گفتوگۆیە و وەرگرتنی ئەو هەڵوێستە، لە مۆسکۆوە بە تەلەفون ڕەزامەندی وەرگرتووە ئیدی لەو دیمانەو دیدارەدا سەرۆکی تازەکورەی کورد تێگەیەنرا کەحکومەتی مهاباد ناتوانێت روو بەرووی تاران و ئازربایجان و رەنگە ولاتانی تریش بوەستێ، ئەگەر پشتیوانی زلهێزێکی نەبێ ئاشکرایە مەبەست لەو زلهێزە یەکیەتی سۆڤیەت بوو. کە سروشتی روداوەکانی ئەو وەختانە وایان لێدەکرد کە ببێ بە تاقە زلهێزێك بتوانێ ئەو دەورە بدینێ.




قازی محمد توانی رووبەرووی ئەوبۆچونەی سۆڤیەت ببێتەوە کە دەیویست ناوچەی کوردستان بخرێتە ژێر دەسەلاتی ئازربایجانی، قازی محمد بۆ ئەم مەبەستە سیاسەتێکی ئاقلانە و هێمنی گرتەبەر، لە لایەکەوە نەیدەویست پشتیوانی سۆڤیەتی بدۆڕێنێ و لەلایەکی ترەوە پشت بەستوو بەهەستی نەتەوەیی خرۆشاوی مهابادی ئەو رۆژگارە، هەڵوێستی توندی نەتەوەیی دەنواندو سازشی لەسەر مەسەلە نەتەوەییەکان نەدەکرد.

تابەمجۆرە توانی لە ئەنجامدا رەزامەندی سۆڤیەت بە دەست بێنێ بۆ راگەیاندنی کۆماری کوردی لە مهاباد، بەلام لەگەڵ ئەمەشدا پەیوەندی نێوان سەرکردایەتی کۆماری کورد و پشتیوانە سۆڤیەتەکانی هەر رواڵەتی بوو، چونکە بۆچونی قازی محمد لەمەڕ باروودۆخ و رەوشی کۆمارەکەی زۆر دوور بوو لە بۆچوونی سۆڤیەتەکان و هەڵوێستی گشتی یەکێتی سۆڤیەت.

کوڕەکەی قازی محمد، کە لە باسی سەفەری یەکەمی کوردەکان بۆ باکۆ ئاماژەمان بۆ کرد، لە ساڵی 1979دا کە دیمانەیەکم لەگەڵدا سازدا، ئەوەی بۆ دوپات کردمەوە کە سۆڤیەتەکان میوانی نیمچە دایمی بوون لە ماڵە گەورەکەیاندا لە مهاباد: "لە وەخت و ناوەختی رۆژدا و هەندێ جاران لە نیوە شەویشدا دەهاتن و لەو ناوچەیەدا دەیانکرد بە رۆژی خۆیان، سەردەکەوتنە سەربانی خانوەکە و بەپێ دەیانکێشا بەسەربانەکەدا و بەدەنگی بەرز داوای خواردنەوەیان دەکرد. هەر چەندە بابم مەیی نەدەخواردووە، بەلام هەمیشە ڤۆدگای لە ماڵەوە هەڵگرتبوو بۆ میوانە رووسەکان".

لە شوباتی1946دا یەکەم وەجبەی کۆمەکی سۆڤیەت گەیی. کوردەکان پاش ئەوەی ئەو چەکانەیان وەرگرت کە لە جەندرمەی ئێرانی گیرابوون، پێنج سەد پارچە چەکیان بەدوو وەجبە لە سوپای سۆڤیەتی وەرگرت. چەکەکان بریتیبوون لە تفەنگ و دەمانچەی سوپایی چیکی و ئەمریکی و تفەنگی رەشاش هەروەها رادیۆیەك دانرا، لە سەعات چوارەوە تا سەعات دەی شەوێ بەزمانی کوردی بەرنامەی بلاودەکردەوە، ئەمە یەکەمین ر ادیۆ بوو کە بە زمانی کوردی پەخشی دەکرد، رادیۆی دەنگی کوردستان لە شەستەکان و هەفتاکاندا لاسایی ئەو رادیۆیەی دەکردەوە.. هەروەها سۆڤیەتەکان کەرەستەو تفاقی تەواوەتی تیپێکی موسیقایی سوپاییشیان نارد، ئەم تیپە مارشی سوپایی و سروودی شۆڕشگێڕی کوردی لێدەدا، بە تایبەتی سروودی نەتەوەیی(ئەی رەقیب) کە یونس رەوف دلداری شاعیر لە مهابادا داینابوو.. هەروەها ئامێرە موسیقییە سۆڤیەتییەکان، ئاوازی خۆیان لە رادیۆ و بۆنە رەسمییەکان و نمایشەکانی سوپای کوردی تازە دامەزراودا لێدەدا.

**نەقیب سەلاحەدین قاسموف مەشق بە سوپای کورد دەکات:**

قازی محمد، لەو ماوەیەدا لە دامەزراندنی وەزارەتەکەی بووەوە(سیف الدین)ی برای کرا بەوەزیری بەرگری بە حوکمی ئەوەی کە تا ئاخرو ئۆخری دووەم جەنگی جیهانیش ئەفسەرێکی گەورەبوو لە(دەرەك)ی ئێرانیدا، هەر چەندە مەبەست لە دامەزراندنی ئەم وەزارەتە تەنیا ئەوە نەبوو کە ببێ بە دەزگایەکی سوپایی چالاکی ئەوتۆ کەبەرگری لە سنووری کۆمارەکە بکات دژی زێدەگاڤیە چاوەڕوانکراوەکانی ئێران، بەڵکو بە شێوەیەکی سەرەکی بۆ ئەوەبوو کەببێ بە بناغەی دەزگایەکی کارگێڕی(اداری) ئەوتۆ کە پشتی پێ ببەسترێ بۆ دابین کردنی هاوسەنگی ناوخۆ، و بریکاری ئەو هێزەبێ کە خێڵە جەنگاوەرەکان هەیانبوو، و پشتیان پێنەدەبەسترا. لەبەر ئەم هۆیە قازی محمد، (سیف الدین)ی برای خۆی کرد بە وەزیری بەرگری و بەخۆیشی بەشداری لە هەڵبژاردنی

فەرماندە و ئەفسەرەکانی سوپای کوردیدا کرد، ئەوە بوو تێکەڵەیەکی سەیر لە حەفتا ئەفسەرو دەرەجەدار دامەزرێنران تا ناوەندی سەرکردایەتی سوپا پێک بهێنن ئەرکی ئەم سەرکردایەتی‌یە ئەوە بوو کە ڕێبەرایەتی ئەو هێزە سوپاییە بکات کە قەرار بوو وەکو سەرەتا لە(1200)سەرباز پێک بێت، کۆماری مهاباد لە مەسەلەی ئەفسەراندا دەیتوانی پشت بەو دە ئەفسەرە گەنجە ببەستێ کە بە هۆی هەڵوێستی نەتەوەییانەوە لە سوپای عێراقی هەڵاتبوون و تازە پەیوەندییان بە کۆمارە ساواکەی مهابادەوە کردبوو، ئەمانە ئەفسەری راستەقینەبوون لە سوپای عێراقیدا، بەڵام قازی محمد و دەوروبەرەکەی لەبری ئەوە هەستان زۆربەی ئەفسەرەکانیان لە کەسانی باوەڕپێکراوی بنەماڵەکانی مهاباد دامەزراند.

لە مانگی ئازاردا راوێژکاری سوپایی سۆڤیەتی، نەقیب (سەلاحەدین قاسموف) گەیشتە مهاباد، تا کادری پێویست بۆ سوپای کوردی مەشق دابدات و پێبگەیەنێت. ئەم ئەفسەرە گەنجە لە کوردەکانی یەکێتی‌ی سۆڤیەت بوو. کۆماری کوردی پلەی سەرهەنگی دایێ، کەچی پێیان دەگوت کاک ئاغا. دامەزراندنی ئەو سوپا بچکۆلەیە هەر هەموو وەرزی بەهاری خایاند، لەو ماوەیەدا مەشقێکی یەکجار بەزەبرو توندیان پێکرا کە بریتی بوو لە مەشقی دونێل (مبارزە) و بەکارهێنانی تفەنگ و چەکی رەشاش و نارنجۆکی دەستی... هەروەها ژمارەیەک سەرباز مەشقی شۆفێرییان پێکرا بۆ هاژۆتنی ئەو ئۆتومبیل و زرێپۆشانەی کە سۆڤیەت ناردبوویان.

مرۆڤ زۆر بە ئاسانی و هەر بەتەمەشاکردنێکی ڕوتەنی ئەو کۆمەکانەی کە سۆڤیەت پێشکەش بە کۆمارەکەیان کردبوو، دەیتوانی دیدو بۆ چوونی سۆڤیەت سەبارەت بەو کۆمارەی کە بە رەزامەندی خۆیان هاتە دامەزراندن، بزانێت، بۆ وێنە کۆمەکەکە بریتی بوولە، دە ئۆتومبیلی سۆڤیەتی، دە ئۆتومبیلی ئەمریکی، دەجیّب قیادە، کە ئەمە بە هەمووی نەیدەکردە تاقە دڵۆپێک لەو دەریا کۆمەکەی کە ئەمریکا لە ماوەی دووەم جەنگی جیهانیدا بۆ سۆڤیەتی هەڵڕشت، کوردەکان لە سەفەری دووەمیاندا بۆ باکۆ لیستێکی چەکی قورسیان پێشکەش کرد، وەلێ ئەو چەکە قورسانە ئێستاشی لەگەڵ بێ نەگەییشتنە دەستی کوردان، نە ئەو تانکانەی کە(باقروف)ی سەرەک وەزیران گفتیدا بوو بۆ مهابادیان بنێرێ و نەتۆپەکان تەنانەت ئەو چەکە دژە تانکانەش کە سۆڤیەتەکان دەیانگوت ناردویانن، وەختێ گەییشتنەجێ، بریتی بوون لە قونبەلەی مولەتوف نەک چەکی دژە تانک، دیارە سوپاییە کوردەکان بەمە زۆر تورەو نائومێد بوون، سۆڤێتیی‌ەکانیش، هەر چەندە کوردەکان داوای کۆمەکی سوپایی زیاتریان دەکرد یان داوایان لێدەکرد بەلای کەمەوە بەڵێنەکانی پێشویان بێننەدی، ئەوا بەڵێنی چەوری تازەیان دەدا و هیچی دی.

هیچ جۆرە کۆمەکێکی دارایی نەنێردرا، ئەو داوایەش جێبەجێ نەکرا، کە کوردەکان لێکدا لێکدا داوایان دەکرد رادیۆیەکی بەهێزی ئەوتۆیان بۆ بنێرن کە کوردی عێراق و تورکیاش بتوانن بەرنامەکانی وەربگرن و گوێیان لێ ببێ، ئەم هێمایانە ئەوە دەگەیەنن کە سۆڤیەتەکان ئەو گەرم و گوڕییەی جارانیان لەمەڕ ئەزموونی کوردی نەماو ئەو جۆشو خرۆشەی هەوڵیان دامرکایەوەو وەستا، هەر چەندە ئەوە شتێکی ئاشکراو دیاربوو، بەڵام قازی محمد و ئەندامانی حکومەتەکەی ئەمەیان بە هەند وەرنەگرت و بەو ئاماژەیەیان ئەزانی کە ئایندە و چارەنوسی کۆماری کورد دیاری دەکات.

## کاریگەرییەکی ناخۆش و وەرەڕوخێن

ئیدی مهاباد بەرە بەرە بوو بە مەڵبەندی سەرلەبەری بزاڤی رزگاریخوازی کوردی، بوو بەو مەڵبەندەی زۆرهێز و رێبازی فیکری کوردی رووی تێبکەن، لە چیاکانەوە میرو سەرەک خێڵەکان بەخۆو جەنگاوەرانیانەوە پەیوەندییان پێوەکرد زۆری نەبرد دوانزە هەزار جەنگاوەر لە دەوری مهاباد خڕکرایەوە، بە تایبەتی لە باشوری شاردا و لە نزیکی سنوری ئێرانی خەنیمدا، هێزەکەی هۆزی شکاک بە سەرکردایەتی تاهیرخانی کوڕی سەرکردەی ئەفسانەیی، سمکۆ لە هەزار و سێ سەد سوارە پێک هاتبوو لقە جیاوازەکانی هۆزی هەرکیش هەزار سوارەو حەوت سەد پیادەیان ناردبوو حەمە ڕەشیدی جەنگاوەری دەوراندیدەش کە چەند ساڵێک پێشتر لە ناوچەکانی سەقز وبانەدا شەڕی ئێرانییەکانی کردبوو، بەخۆ وسێسەد جەنگاوەرەوە پەیوەندی بە کۆماری کوردەوە کرد. ئیدی کۆمار لە نێوان خۆی و هێزی هەر خێڵێکدا ئەفسەرێکی پەیوەندی دامەزراند، مهاباد ئازوقە و خۆراکی هەموو ئەو جەنگاوەر وخێڵەکیانەی دابین دەکرد.

توانای شەڕکردنی ئەم هێزانە لە هۆزێکەوە بۆ هۆزێکی دی جیاوازبوو، لەکاتێکدا کە هەندێ لەم خێڵانە شێوازی شەڕی خۆی بە جۆرێك گۆڕی بوو کە دەیتوانی زیانی گەورە بە دوژمن بگەیەنێ، هەندێ خێڵی دی لەسەر هەمان شێوازی شەڕی سوارچاکی کە زۆر جاران گەڕیدە رۆژاواییەکان ستایشیان بەسەردا نەهاتبوو دیارە سوارە و سوارچاکانی کورد بە نێوبانگ بوون لەم جۆرە شەڕانەداو زۆر بە توانا بوون لە بەکار هێنانی ڕم و سەرەنێزاندا بە رادەیەک کە زۆرجاران سەرکەوتنی گەورەیان بەسەر سوپای نیزامیدا بەدەست هێنابوو، بەڵام داهاتنی تفەنگی ئۆتوماتیکی و دەوری گرینگی لە پاراستنی هێزەکانی پیادە لە ساڵانی دوایی سەدەی رابردوودا، وایکرد کە سوارەی کورد ئەو باڵادەستییەی جارانیان بەسەر دوژمنی خۆدا نەمێنێ لەبەرئەوەی هەندێ هۆزو خێڵ هێشتا تازە لە هەوڵی فێربوونی شێوازی تازەی شەڕدابوون یان هێشتا بە شێوەی پراتیکی مومارەسەیان نەکردبوو، بۆیە کۆمارە ساواکەی کورد لە سەری بوو بایەخی زۆر بە دامەزراندنی سوپایەکی هاوچەرخ بدات

کە زەبت وڕەبتی تێدابێت و سەرکردایەتییەکی کارامەی وەهای هەبێ کە بتوانێت سەرکەوتن بە دەست بێنێ، پاش ئەوەی ئەو سەردەمە بەسەرچوو تەنیا سوارچاکی و ئازایەتی بتوانن سەرکەوتن و باڵادەستی سوپایی مسۆگەر بکەن مێژوونوسی ئێرانی(حسن ارفع) کە بەخۆی سەرکردایەتی چەندین هێرشی سەرکوتکاری شۆڕشەکانی کردووە لە ساڵانی 1920و1940دا، لە یاداشتنامەکانیدا زۆر بە دورودرێژی و بەستایشەوە باسی چۆنیەتی شەڕی کوردی کرووەو نوسیویەتی: "هەرچەندە زۆربەی جەنگاوەرانی کورد بەسواری ئەسپی کوردی توندو تۆڵ هێرش دەکەن، بەڵام شێوازیان یەکجار دورە لە شێوازی ئاسایی سوارچاکان کە بە پلەی یەکەم پشت بەڕم و نێزە و شمشێر دەبەستێت، چونکە سوارەی کورد هەوڵدەدەن بە چەکی سپییەوە بێنە مەیدان و بە خەنجەران کە زۆر لێهاتوانە بەعەمەلی دێنن بە خێراییەکی سەرسوڕهێنەری وەها کە تەواو لە دوژمنیان نزیکدەکاتەوە هێرشی دێنن، ئەوسا لە ئەسپەکانیان دادەبەزن و بە دەمانچەو تفەنگەکانیان دەکەونە شەڕ".

زۆرجار، دوو سوار سواری یەك ئەسپ دەبن، یەکێکیان لە ڕێگە دادەبەزێ و دەکەوێتە ئەم سەنگەرو ئەو سەنگەرو بەو شێوەیە دەکەوێتە مژولکرنی هێزەکانمان، بەمجۆرە سوارچاکی دووەم دەپارێزێ کە بەپەلە دەگەڕێتەوە بۆ دواوە تا سوارچاکێکی دی لەگەڵ خۆیدا بێنێ کە ئەویش هەمان کاری سوارچاکی یەکەم دووبارە دەکاتەوە ئەوانەی بەو جۆرە بۆ نزیکترین شوێنی سەنگەرەکانی ئێمە دەگوازرانەوە، کوێرانە دەکەوتنە تەقە کردن لە ئێمەو سەنگەر گۆڕکێیان دەکرد و بەمەش ترسییان دەخستە دڵی سەربازەکانمانەوە ئەم تاکتیکەیان بریتی بوو لەگرتنی هەموو گردو بەرزاییەکانی دەوروبەری سەنگەرەکانی دژمنەکەیان ئەوجا بازنەی گەمارۆکەیان بەرە بەرە تەنگ دەکردەوە تا رادەیەك کە بتوانن دژمنەکەیان لە نێوبەرن ناچاری بکەن کە خۆبەدەستەوەبدەن."

"هەرچەندە من لە ساڵانی 1921دا و1922دا شەڕی(شکاك)م کردووە، لە ساڵی 1947دا شەڕی(مریغای)م کردووە لە ساڵی1945دا شەڕی(حەمە رشید)م کردووە، بەڵام یەکەمجار کە لە ناوجەرگەی هێرشێکی کوردیدا خۆم بینی یەوە، رۆژی1922/7/24بوو، ئەویش لە کاتی هێرشێکی نائومێدانەدا بوو بۆ سەر کەتیبەیەکی پیادەی پەهلەوی، کوردەکان بەدەم هێرشەوە هاوارێکیان دەکرد کە هەر لە هاواری عەرەبەکانی جەزایر دەچوو کاتێ کە هێرشیان بۆ فەرەنسییەکان دەبرد، خۆکەشەڕ لە گوندو بارەگاکان نزیك دەبوەوە، ژنانیش هەمان هاواریان دەکرد(هۆی هۆی) ئەلهەقی ئەم هاوارانە زۆر ناخۆش و ورە روخێن بوون".

## کۆمەك لە عێراقی دراوسێوە

سوپای کورد لە دوانزە هەزارکەس پێك هاتبوو، هێزەکەی مەلا مستەفای بارزانی لە هەموو هێزەکانی دی بەزەبت و ڕەبت ترو پڕ ئەزمون و خۆڕاگرتربوو لە مەیدانی شەڕدا، ڕووداوەکانی دواتریش دروستی ئەم بۆ چونەیان سەلماند، مەلا مستەفا بارزانی کەبەڕاستی بە چاکترین سەرکردەی سوپای کوردو بلیمەتی ئەو مەیدانە دێتە ژماردن، یەکێك بوو لە سیاسیە زیرەك و لێهاتووەکانی نێو کوردی عێراق، ئەم پیاوە لە ناوچەی بارزانی نزیکی ئێران شۆڕشی دژی حکومەتی عێراقی کردبوو، بەمەش شارەزاییەکی باشی لە شەڕدا پەیدا کردبوو. دوا شۆڕشی ئەوەبوو کە لە مانگی1945/4دا هەڵایسا و تا مانگی ئەیلولی خایاند و ناچاربوو پاشەکشە بکات و لە بەردەم هێزی عێراقی باڵا دەست بەسەر جەنگاوەرانی دلێری بارزانیدا، بگەڕێتەوە چونکە هێزی عێراق لەروی تەکنەلوژیاوە زۆر باڵا دەستتر بوو لە جەنگاوەرانی دلێری بارزانی، بەتایبەتی دوای بەشداریکردنی فڕۆکەکانی هێزی ئاسمانی بەریتانیا لە شەڕەکانداو بۆردومانکردنی دڕندانەی سەنگەرو گوندی کوردەکان.

بارزانی، لەو پاشەکشەی یەدا، خۆی لە ناوچە کوردییەکانی تورکیا نەدا، چونکە شارەزای سوپای تورك بوو، و ئاگاداری ئەو هەموو رق و کەرب و کینەش بوو کە ئەم سوپایە لە کوردی هەڵگرتبوو و چاوەڕوانی دەرفەتێك بوو بۆ لێدانی کورد، هەروەها بڵاوبوونەوەی هەواڵی دامەزراندنی کۆمارێکی کوردی لە مهاباداو رزگاربوونی ناوچەکە لە دەسەڵاتی ئێرانی و بریتانی لە کوردستانی ئێراندا، مەلا مستەفای بۆ ئەوێندەر راکێشا، بارزانی تامەزرۆی هەر دەرفەتێك بوو تالە رووی سیاسییەوە بە دیار بکەوێ و توانای سوپایی و فەرماندەیی خۆی بنوێنێ، ئەمەش هۆیەك بوو بۆ بڕیاردانی یەکجارەکی بارزانی، بڕیاریدا لە سنووری ئێران بپەڕێتەوە، سێ هەزار جەنگاوەری لەگەڵدابوو، پتر لە هەزار و دووسەد کەس لەوانە شەڕکەرو جەنگاوەری یەکجار بەتوانا و گوێ رایەڵی شەخسی فەرمانەکانی بارزانی بوون ژمارەی یاوەرانی بارزانی گەییە پتر لە دوانزە هەزار کەس.

زۆربەی جەنگاوەرەکان ماڵ و منداڵی خۆیان لەگەڵ خۆدا هێنابوو، لە کاتێکی باشدا واتا بەر لە دەستپێکردنی وەرزی زستان کە ئیدی چ حەرەکەیەك لەو ناوچە شاخاویی‌یە سەختەدا نامێنێ، پەڕی بوونەوە. گەلێك لەو ئەفسەرانەش کەپەیوەندییان بە بارزانییەوە کردبوو، بەگەڵی کەوتن و هاتنە ئێرانەوە دیارترینیان نەقیب عەبدولعەزیز گەیلانی بوو، کە کوڕی گەورەی میری کورد شێخ عبداللابوو، شێخ عەبدولڵا یەکێك بوو لەدیارترین و بەدەسەڵاتترین سەرانی کوردی عێراق، بگرە بنەماڵەی عەبدوڵلا سەرکردەی راستەقینەی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد بوون بەر لە دەرکەوتنی قازی محمد لە شانۆی روداوەکان، لە ترسی ئەوەی نەبادا کێشەی ڕێبەرایەتی بکەوێتە نێوان ئەم دوو بنەماڵە هەڤڕکەوە، سۆڤێەتەکان چارەسەرێکی زیرەکانەیان بۆ ئەم مەسەلەیە دۆزییەوە ئەوە بوو هەرکە نەقیب عبدالعزیز لەگەڵ بارزانیدا گەییە مهاباد، رووسەکان ناردیان بۆ خوێندنی سوپایی لە یەکێك لە ئەکادیمییا سوپاییەکانی سۆڤیەت، بەمە ئەو پیاوەیان لە ناوەندی روداوەکان دورخستەوە و(قازی محمد) یان لە گیروگرفتی ئەو رزگار کرد.

سۆڤیەتەکان لە لایەکی ترەوە بە وەرگرتنی ئەم خوێندکارە سوپاییە نێودارە، ئەوەیان بۆ خۆ مسۆگەرکرد ئەگەر زروف بخوازێ لە کاتێ پێویست داو لە رێگەی ئەوەوە گوشار بخەنە سەربابی. سۆڤیەتەکان لە هەمان کاتدا هەوڵیان دەدا کە بارزانی بە خێرایی دەسەڵاتی سیاسی پەیدا نەکات، چونکە چاک دەیانزانێ کە کەسایەتییەکی بە هێزە وکەڵکەڵەی رێبەرایەتی لە سەردایە. تەنانەت (باقروف)ش لە دوا سەفەری سەرانی کوردا بۆ باکۆ، بە خەباسەتەوە ئاماژە بۆ ئەم مەسەلەیە دەکات و دەڵێ ئەگەری ئەوە هەیە کە بارزانی لە سەر داوای بەریتانییەکان بۆ ئێران هاتبێ و بیەوێ ئەزمونی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردان تێکبدات، ویستی بەریتانییەکان بەجێ بێنێ، لەم دوو نموونەیەوە ئەوەمان بۆ دیار دەکەوێ کە سۆڤیەتەکان لەم بۆنەیەدا هەمان شێوازی ئامەردانەو نەرم و زیرەکانەیان بەکارهێناوە کە دەوڵەتە گەورەکان لە مامەڵە کردنیاندا لەگەڵ ئەو بابەتانەدا کە پەیوەستە بە بەرژەوەندی زیندوی گەلانی بچوکەوە، پەیرەوی دەکەن، واتا هەر لە هەوەڵەوە جموجۆڵی هەر هەموو سەربازەکانی شەترەنجی ئەم گەمە پەیوەستەیان بە ئەزموونی کوردەوە لەمهابادا، دیاری کردبوو.

بەڵام یەکێك لەو سەربازە کوردانە، کەسایەتییەکی بەزکماك زیرەك و سەرناس بوو، توانایەکی زۆر گەورەی هەبوو لە دەرك کردنی رەوتی کاروباران و شیکردنەوەیان و وەرگرتنی هەڵوێستی راست و دروست دەربارەیان، هەر هەموو ئەوانەی لەم قۆناغە کۆڵیونەتەوە و واقیعیانە هەڵیانسەنگاندوە هەستیان بەوە کردووە کە ئەو کەسایەتی‌یە دەیروانییە روداوەکان و چاوەنۆڕی دەرفەتی گونجاوی کردووە تا دەسەڵات و توانای رێبەرایەتی خۆی بنوێنێ ئاشکراشە بارزانی لەم رووەوە گرەوی لەسەر دەوری سۆڤیەتەکانیش کردووە هەر کە گەییوەتە مهاباد، بە بەردەوامی هاتوچۆی ئەفسەرو راوێژکارە سۆڤیەتەکانی کردووە، لە چەندین دیداردا لەگەڵ ئەفسەرانی سۆڤیەتیدا، هەوڵی داوە ئەوەیان بۆ بسەلمێنێ کە هەر ئەو کوڕی رۆژە و پێویستە پشتیوانی لێ بێتەکرن و متمانەی پێبکرێ و چاوەنۆڕی دەستکەوتی لێبکرێ، بارزانی زۆربە توندی لە رووی هەموو ئەو کەسانە وەستایەوە کە ئاقاییل بوون بەوەی پەیمانێکی توندو تۆڵ لەگەڵ سۆڤیەتدا هەبێ، بەڵگەشی بۆ ئەمە ئەوە بوو کە تەنێ سۆڤیەت دەتوانن مانەوەی کۆمارەکە دابین بکەن یان هەوڵی پەیوەندی لەنێوان کورد و سۆڤیەتدا، ئەمریکاو ئینگلتەرا دەستەو ئەژنۆ دانانیشن.. بەڵام دوای چەند مانگێك پاش لە دەستچوونی دەرفەتان ماهیەتی ئەو یاسایانەی دەرك کرد کە بوون و مانەوەی کۆماری(کوردی)یان دیاریدەکرد.

بارزانی یەکێك بوو لەو چوار کەسەی کە کۆماری کوردی لە سوپای خۆیدا، پلەی ژەنەراڵی دانێ لە ناوەندی شاردا خانویەکیان بۆ کرد بە بارەگا تا رۆژگاری ئەمرۆش ماوە و لەم دواییانەدا کرا بە ئوتێل لە ساڵی1997دا رێزدار(جعفر عبدالجواد)ی خاوەنی ئەم خانووەم بینی و بەدەم گێرانەوەی بیرەوەرییانی خۆی سەبارەت بەو رۆژانە گوتی: " دیمەن و رواڵەتی بارزانییەکان زۆر جیاوازبوو لە دیمەن و رواڵەتی کوردی مهاباد زۆر متمانەیان بەخۆ هەبوو، زۆر متمانەیان بە سەرکەوتن هەبوو، چ ترسێکیان لەمەڕ ئەوە نەبوو کە ئایندە چی پێیەو چی پێدەبێ هەرچەندە زۆرچاك دەیانزانی کە هەڵبژاردەی سوپای کۆمارن و لە هەموو هێزەکانی دی بە تواناتر و پڕ ئەزموتترن، بەڵام ئێمە هیچ جۆرە لە خۆبایی بوونێکمان لێ نەدەبینین".

بارزانی، رەزامەندی قازی محمدی وەرگرت تا بەشێك لە هێزەکەی لە نزیکی مهابادا بهێڵێتەوە، نزیکەی هەزار جەنگاوەری گوێرایەڵی فەرمانەکانی خودی بارزانی لە ناو مهاباد جێگیربوون، ئیدی باقی هێزەکەو خێزانەکانیان دابەشکران بە سەرگوندەکانی باشوورو رۆژاوای مەهابادا بنەماڵەی بارزانی لە شارۆچکەی نەغەدەدا جێگیربوون کە ئەوسا کە چ بایەخێکی نەبوو کەشی رۆژگار وای هانی کە ئەم شاروچکەیە دەورێکی دی لە مێژووی بنەماڵەی بارزانیدا بدێنێ، ئەویش ئەوە بوو بارزانی ناچاربوو پاش سی ساڵ لەو مێژووە، خۆی و خێزانەکەی و ژمارەیەك لە یاوەرانی لە ساڵی1975دا و پاش داروخانی شۆڕشی975/974لەو شارۆچکەیەدا نیشتەجێ ببن.. پاش ئەوەی هنری کسینجر و ریچارد نیکسون بە شێوەیەکی حەیابەرانە لە بەڵێنە درۆکانی خۆیان ژێوان بوونەوەو پشتیان کردە برآکی کوردی لە ساڵی1975لە نەغەدە دیمانەیەکی رۆژنامەوانیم لەگەڵ بارزانیدا کرد، رەنگە ئەم دیمانەیەی من دوا دیمانەی رۆژنامەوانێکی بێگانە بووبێ لەگەڵیداو بەر لەوەی بە نەخۆشی شێرپەنجە بمرێ هەستم کرد هەموو ئاواتێکی ئەوەیە، پاش پتر لە نیو سەدە رێبەریکردنی شەڕی پارتیزانی دژی عێراقییەکان و تورکەکان، کە بتوانێ لە نوژەن دەست بەشۆرش بکاتەوە.

## پسپۆرانی شەڕی شاخ

لە ئەنجامی مەشقی بەردەوام و چڕوپڕو هەنگاونانی گورجوگۆڵ لە باری رێکخستنەوەو لە مانگی ئازاری1946دا سوپای کۆماری کوردی بەیەکجارەکی هاتە دامەزراندن و لەدایکبوو، زۆربەی سەرانی کورد لەو رۆژانەدا لە مهاباد خڕبوو بوونەوە بارزانی لە هەر هەموویان بەجۆشتر بوو بۆ شەڕ، حەجمانی لەبەر برابوو، و دەرفەتێك دەگەڕا کە توانای سوپایی خۆی بنوێنێ.

بارزانی‌یەکانیش تینوی پێکدادان بوون لەگەڵ سوپای ئێرانیدا کە هێزەکانی لەسەر سنوری باشووری دەوڵەتی کوردی، لە سەقزو سەردەشت و بانەدا خڕکردبووە و دەیویست لەوێوە لە شکرو قۆشەن بکاتە سەر خاکی کوردان.

کوردەکان لەلای خۆیانەوە باسی پێشڕەوییان بۆ باشوور دەکرد، تا ئەو خێڵ وهۆزە کوردانەی پارێزگای کرمانشا کە هێشتا لە بن دەسەڵاتی ئێرانییەکاندا بوون رزگار بکەن، هەروەها باسی ئەگەری پەلاماردانی خودی کرماشانیان دەکرد تابەزەبری چەك ئەو ناوچانەش بخەنە سەر کۆماری کوردی. کە دوو کەتیبە هێزی

سوپای ئێرانی بەرەو سەقز کەوتە پێشڕەوی، بارزانییەکان بۆسەیەکیان بۆ نایەوە و چاوەڕوانیان کرد تا بکەوێتە بۆسەکەوە ولێی بدەن بارزانییەکان بە حوکمی ئەزموونی زۆریان لە شەڕی هێزەکانی عێراق و تورکیا کە چەندین ساڵی خایاند بوو، شارەزاییەکی زۆریان لە بواری ئەو جۆرە شەڕانەدا پەیدا کردبوو.

(پسپۆڕانی شەڕی شاخ)، ئەمە ئەو ناوە بوو کە ڕێزدار(روان روبسن)ی حاکمی عەسکەری عێراق لەسەردەمی ئینتدابی بەریتانیدا لە بارزانییەکانی نابوو، جا ئەو پسپۆڕانەی شەری شاخ هێندە بە سەبروحەوسەڵە بوون دەیانتوانی یەک ڕۆژی تەواو بێ ئەوەی جوڵە بکەن لە ناو سەنگەرەکانیاندا بمێننەوە تا هێزی دژمن بە تەواوەتی بکەوێتە بۆسەکەیانەوە و دڵنیا بن لەوەی کە شوێنەکەیان قایمە و پشتیان بە تاڵ نییە ئەوجا پەلاماری بدەن، بۆیە زەرەری گیانیان بەکجارکەم دەبوو یەکێک لە ئامێر بەتالیۆنەکانی حەوزی ڕەواندوز، پاش تێپەڕبوونی چەندین ساڵ بەسەر ئەو ڕووداوەدا بۆی گێڕامەوە کە"نهێنی شەڕەکانمان لەوەدایە کە هەوڵدەدەین خەسارەتمان کەم بێ".

نۆرەی (فورس)یش هات، کە بەلەز نێردرابوون تالە نزیکەوەو بە چاوی خۆیان لەو ڕۆژەی مانگی نیسانی1946دا ئەو نهێنییە ببینن و بە دەستی بارزانییەکان تالآو بنۆشن. کاتێ هێزی ئێرانی گەییە (گەوهەر ئاوا) سەیریان کرد دنیا کڕوکپەو چ شتێک لە گۆڕێ نییە، ئەمە تەماحی خستنە بەر کە پشویەک بدەن، بە تایبەتی ماوەیەکی زۆر بە پای پیادە هاتبوون و شەکەت بووبوون، ئیدی بارزانییەکان بە بێ خشپە لە هەموو لایەکەوە هێرشیان کردنە سەرو خەسارەتێکی یەکجار گەورەیان لێداون ناچاریان کرد بە پەلەپڕوزێ و سەر لێ شێواوی بەرەو سەقز پاشەکشە بکەن. دیپلۆماتی ئەمریکی(دیریک کینان)بە تەوسەوە باسی ئەو شەڕە دەکات و دەڵێ: "بارزانییەکان فەرمانیان بەهێزی ئێراندا کە بەرەو دوا بڕوات".

هێزێکی تری (ئێرانی)ش بە سەرکردایەتی نەقیب (خەسرەوی) کە کوردی خەڵکی سنەبوو، تووشی هەمان چارەنووس بوو، کاتێ کە لە ڕۆژی1946/5/2دا ویستی هێزێکی بارزانییەکان راوبنێ، بارزانییەکان بۆسەیەکیان بۆ نایەوەو بە دژە هێرشێکی لەناکاودا غافڵگیریان کردو زەرەرو زیانێکی گەوردیان لە ئێرانییەکان داو نەقیب(خەسرەوی) بە خۆیشی لە مەیدانی شەڕەکەدا کوژرا. ئیگلتون، کە لە مهاباد و دەورو بەریدا چاودێری ڕووداوەکانی دەکردو نوسیویەتی کە: "ئەم ڕووداوە هەترەشی ئێرانییەکانی برد و وردیان پێ نەماو بە جارێ نەترەیان بەردا" ئێرانییەکان هێزێکی سوپایی پێنج هەزار کەسییان بە پشتیوانی تانک و تۆپ و فڕۆکەو بەسەرکردایەتی خودی(ڕەزم ئارا)ی سوپا سالاری ئەو وەخت، ئامادەو تەیارکرد، هێزی کوردیش خۆی لە سێزدە هەزار کەسێک دەدا کە لە خەڵکی عەشایەر پێکهاتبوون و لە نێوان سەقزو سنووری عێراقدا خڕبوبونەوە و هێزی تایبەتی بارزانییەکانیشیان لەگەڵدابوو، کە خەڵکەکە بە هەڵبژاردەی هێزی کوردیان دەزانین، چەکی هێزی کورد تەنیا چەکی سووک و چەند سووکە تۆپێک بوو. هێزی کورد تاقە یەک چەکی دژە تانک و دژە فڕۆکەیان نەبوو.. بۆیان دەرکەوت کە ئەو چەکەی(دۆستە سۆڤیەتەکان) بەناوی چەکی دژە تانکەوە بۆیان ناردوون، قونبەلەی مولوتوف بوو.

لەگەڵ ئەمەشدا، ڕەوش و بارودۆخەکە ئاڵۆزبوو، چ کەسێک ئەنجام و ئاکامی شەڕەکەی بۆ پێشبینی نەدەکرا ئێرانییەکان لە سەرەتاوە هەوڵیاندەدا وا بنوێنن کە گوایە حەزیان بەچارەسەرێکی ئاشتیانەیە، هەر چەندە ئەو ئەگەرەش لەسەر زاران بوو کە گوایە ئێرانیەکان بە فێڵ و دەهۆن دەیانەوێ دەرفەتی پتر وەدەست بێنن تا بتوان دەسەلاتی خۆیان بۆ هەموو ناوچەکان بگەڕێننەوە، بە تایبەتی دوای کۆتایی دووەم جەنگی جیهانی و سالانی داگیرکاری بەریتانی و سۆڤیەتی ئیدی ئەو هۆیانە هەرچییەک بن کەئێرانییەکانیان هاندەدا ڕێگەی ئاشتی بگرنەبەر، (ڕەزم ئارا) پێشنیازی کرد کە لیژنەیەکی کوردی- ئازربایجانی هاوبەش بنێردرێ بۆ بانە تاگفتوگۆی لەگەڵدا بکات دەربارەی ئەوەی کە ڕێگەی ناردنی ئازوقە و پێداویستی سوپایی بۆ سەربازخانەی بانە نەگیرێ و ئەو ڕێگەیە کراوەبێ.

هەرچەندە سەرۆکی شاندی کوردی بەر لە چەند ڕۆژێک گفتی نەگرتنی ڕێگەکەی دابوو، لێ ئێرانییەکان زۆریان دڵ پێوە بوو بەڵێننامەیەکی نوسراویان لەو بارەیەوە دەستبکەوێ. بەڵێنی ئەوەشیاندا کە ڕێگەبدەن لیژنەیەکی کوردی بە شێوەیەکی بەردەوام لە شاری بانەدا هەبێ، ئەگەر کوردەکان بەڵێنی ئەوە بدەن کە هێزەکانیان بەرنە دوری سێ کیلۆمەتری باکوری شارو دوری چوار کیلومەتری ڕێگەی ئازوقەی سەربازخانەی بانە.

بەلآم ئەندامانی شاندی کوردیش لەلایەن خۆیانەوە پێیان لەسەر ئەوە دادەگرت کە ئەو بەڵێننامەیە ڕاستەوخۆ لەلایەن حکومەتەکدیانەوە لە مهاباد، پەسند بکرێ چونکە ئەمەیان بەجۆرە دانپێدانانێکی ڕاستەوخۆی ئێرانییەکان، بە حکومەتی کوردی مهاباد دەزانی ئابەمجۆرە پێشڕەوی هەردوو هێزەکە ڕاگیرا هەروەها ئەو هێرشە کوردییەش کە نەخشەی بۆ دانرابوو بەرەو باشوربکرێ، بە فەرمانی سەرکردایەتی ڕاگیرا، هەرچەندە بارزانی زۆر پێی لەسەر زەرورەتی دەستپێکردنی هێرشەکە داگرت.

## کۆماری مهاباد... وولاتێکی نموونەیی بوو؟

پایتەختی کۆماری کوردی لەو ماوەیەدا شان بە شانی کۆمارەکە گەشەی سەندو پەرەسەندنێکی باشی بە خۆوە بینی واتە ڕێک بەپێچەوانەی کۆماری ئازربایجانی دراوسێیانەوە کە بە ئاشکرا

ڕواڵەت و شەقڵی ستالینی‌یەتی پێوەدیاربوو. لە کاتێکدا کەش وهەوای ئازربایجان، کەش و هەوای مۆلکایەتی گشتی‌بوو،

حوکمی پۆلیس و تیرۆری فیکری زاڵ بوو، مهاباد لەو کاتانەدا بۆ یەکەمجار بوژانەوەی ئابوری و ئازادییەکی سیاسی ئەوتۆی بە خۆوە بینی... ەم گەلە لە هیچ قۆناغێکی مێژووی دوورودرێژی خۆیدا بە خۆیانەوە نەبینی‌بوو حکومەت خەرجی و مەسرەفی خۆی لە باجوخەراج کۆدەکردەوە، حیزب ئابونەی ئەندامانی خۆی وەردەگرت و خێزانە دەوڵەمەندەکانیش پیتاکیان دەدایێ، سەرەک خێڵەکانیش بۆ ئەوی گۆیرایەڵی خۆیان بۆ حیزب بسەلمێنن پیتاکیان دەدا، بازار، بە هۆی کەل و پەلی قاچاغی عێراقەوە کە هەندێ جار دەگەییە بازارەکانی تەورێزو تەنانەت بازاڕەکانی(تاران)ی‌ش، بوژایەوە، بەڵام ئەو قەرزەی کە لە حکومەتی ئازەربایجانی و لە مانگی کانونی دووەمدا وەرگیرا بوو لە دەرامەتی نەوشەکرە درایەوە کە کارگەی شەکری (میاندواو) بەرهەمی دەهێنا.

بەپێچەوانەی ئەو وەزع و حاڵەی لە ئازربایجاندا باوبوو، هاووڵاتی کۆماری کوردی دەیتوانی بەو پەڕی ئازادی بێ وبچێ وسەفەر بکات، هەموو هاووڵاتی‌یەك بۆی هەبوو چەك هەڵبگرێ، ئاسایش بەرادەیەك بەرکەماڵ بوو کە پۆلیسی کوردی بە درێژایی یەك دانە ساڵ تەنیا پینج کەسیان گرت.

هیچ سانسۆرێك لە سەر رۆژنامە نەبوو، یەکەمین کتێبی دەرسی قوتابخانان بە زمانی کوردی هاتەنوسین و بۆچاپ ئامادەکرا، گوێگرتن لە رادیۆی بێگانە ئاسایی بوو لە پاڵ گوێگرتن لە رادیۆی کوردی کە رۆژانە شەش سەعاتان کاری دەکردو بەرنامەی بڵاودەکردەوە ئیدی دەسەڵاتی سۆڤیەتی لەوێندەر بوو بەسفر، هەرچەند حیزب رێکخراوی قوتابیان و لاوانی لەسەر شێوەی سۆڤیەتی دامەزراند و بەرپرسانی کورد لە کاتی قسەکردندا ستایشی سوپای سوریان دەکرد و زۆرجار لە گوتاری رەسمی و بەیانات و گوتاری رادیۆییدا ئاماژە بۆ یەکێتی‌ی سۆڤیەتی مەزن دەکرا لێ لەو بۆنانەدا زاراوەی وەك مارکسیزم، لینینزم، ریفۆرمی کشتوکاڵی و خۆماڵی کردن ... هتد بەکار نەهێنران زۆر بە دەگمەن وێنەی ستالین لە دایەرەکانی کۆماردا دەبینرا، بە پێچەوانەوە وێنەی قازی محەمەد لەچوارچێوەی ڕەنگاوڕەنگ بەرەنگی ئاڵای (کۆمەڵەی جاران) لە هەموو شوێنێك داو بە تەنیشت نەخشەی کوردستانی گەورەوە هەڵواسرابوو، کە کۆماری کوردی وەکو خاڵێکی بچووك تێییدا نیشانەکرابوو.

خەڵکی کۆمار لە حاڵەتی خەونێکی نەتەوەیی رەنگیندا دەژیان سروودی نەتەوەیی بۆ هەموو پارچەکانی کوردستان دەگوترا جگە لە هەستی نەتەوەیی، نەوت‌یش یەکێك بوو لەو فاکتەرانەی کە سنووری خەونی کوردی دیاری دەکرد، وەکو لەم برگە سرووده نەتەوەییەدا بەدیار دەکەوێ:

نەفتم ئاوی ژیانە لە سیرت و کەرمانشانە،

بابا گوڕگوڕ دەزانی لە موسڵیش هەمانە،

کورد، بەرادەیەك لە خەونی ئایندەی خۆدا نقوم بوو بوون کە کەسیان هەستی بەوە نەدەکرد کە کێشەی دەوڵەتان لەسەر ئەو ناوچەیەی کە ئەوان تێییدا دەژین، لە راستیدا بۆ دەست بە سەراگرتنی ئەو ئاوی ژیانەیە لەگەڵ ئەوەشدا دەشیا بگەنە ئەو ئەنجامگیرییە، ئەگەر زەمینەی مێژوویی و هێماو ئاماژە سەرەتاییە ئاشکراکانیان هەڵبسەنگاندایە و بیانخوێندباوە کە بە ئاشکرا بەرەو ئەو ئاراستەیە دەچوون: رووس و بەریتانییەکان لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا رێك کەوتبوون لە سەر دابەشکردنی ناوچە پرنەوتەکانی باکور و باشوری ئێران هەروەها لەسەر هاوئاهەنگی هاوبەش رێککەوتبوون کە چۆن لە ناوچەکەدا روو بەرووی دەسەڵاتی ئابوری گەشە کردووی ئەوسای ئەڵمان بوەستنەوە.

وەختێ بەلشەویکەکان، لە ساڵی 1921دا لە ئێران کشانەوە و دەسبەرداری هەموو ئەو مافانەی خۆیان بوون کە ئەو پەیمانە بۆی دابینکردبوون، کاروبارەکان گۆڕان.. بەریتانییەکان بەپێی پەیمانی ساڵی 1909بیرەنەوتەکانی خۆیان پاراست ولەرێگەی کۆمپانیای نەوتی ئەنگلو- ئێرانییەوە کەوتە وەعەمەل هێنانی، هەرچەندە تاران بۆ ماوەیەکی کەم ئەم پەیمانەی هەڵوەشاندەوە، بەتایبەتی لەو کاتانەدا کە رەزاشای یەکەم سیاسەتێکی تازەی بۆ دانی مافی بەرهەمهێنانی نەوت دانا، لێ بەریتانیا ساڵی 1933دا مافی بەرهەمهێنانی تری بە پێی مەرجی تازە وەدەست هێنایەوە.

وەختێ جەنگی جیهانی دووەم کۆتایی هات و بارودۆخی ئێران هاتەوە تایم، بەریتانیا و دنیای رۆژاوا بە چاوی گومانەوە دەیانروانی یە هەوڵەکانی سۆڤیەت بۆ گەڕانەوەی دەسەڵاتیان لە ئێران و لەوەشە بیەوێ مافی بەرهەمهێنانی (نەوت)ی‌ش وەربگرێ.

## پیترۆڵ و جەنگی سارد

پێدەچێت سەرانی کۆماری مهاباد ئەم زەمینە مێژووییەیان لەبەر چاو نەگرتبێ هەروەها ئەو هەنگاوەی تری سۆڤیەتیانش کە لە ساڵی 1944دا نایان، بەجدی وەرنەگرتبێ لەو کاتانەدا کە سۆڤیەتەکان مژۆلی جوڵاندنی سەربازانی شەترنجەکەیان بوون لە کوردستان و ئازربایجاندا و خەریکی ئامادەکردنیان بوو بۆ گەڕی (جولە) ئایندە، مافی دەرهێنانی ئەوتیان لەسەرانسەری باکوری ئێراندا وەدەست هێنا لێ حکومەتی ئێران مەسەلەی یەك لایی کردنەوەی ئەم بابەتەی بۆ دوای جەنگ دواخست، بیانوشی بۆ ئەمە قەرارێکی وەزاری پێشوبوو لە لایەکەوە و هەنجەتی ئەوەش بوو کە بەردەوامبوونی شەڕ رێگە نادات ئەم ئیمتیازو مافە بە یەکێتی سۆڤیەت بدرێ.

لەبەرئەم هۆیانە سۆڤیەتەکان بە لایەکی تردا بایاندایەوە، ئەویش بریتی‌بوو لە پشتی‌وانی و بەهێزکردنی جوداخوازی کورد و ئازەر، لێ لەم هەوڵەیاندا روو بەرووی نارەزایی و مقاوەمەتی توندو تیژی حکومەتی ئێرانی دەبوونەوە کە تامەزرۆوتینوی ئەوە

بوو هەموو خاکی خۆی لە ڕووی سیاسی و سوپاییەوە بێنێتەوە ژێر ڕکێفی خۆی لەو کاتانەدا کە کورد مژوڵی تەواو کردنی بینای یەکەم دەوڵەتی خۆیان بوون لە مەهاباد و دەیانویست بۆ هەموو جیهانی بسەلمێنن کە دەتوانن خۆیان بەڕێوەبەرن، حکومەتی ئێرانی پەنای وەبەر هەموو کەناڵێکی گەمەی دبلوماسی دەبرد تا شارەکانی باکوری ڕۆژاوی وەربگرێتەوە و لە مەترسی دەریان بهێنێ.

وەختێ هاوپەیمانان لە ساڵی 1941دا چوونە خاکی ئێرانەوە بەڵێنیاندا کە لەگەڵ تەواوبوونی جەنگدا بکشێنەوە بەراستیش ساڵی 1946دانرا بۆ ئەم کشانەیەوە، ئەوەبوو ئەمریکییەکان لە ڕۆژی 1945/12/31دا کشانەوە دوا سەربازی بەریتانیش لە ڕۆژی 1946/3/2دا لە خاکی ئێران کشایەوە لێ سۆڤیەتەکان بە پێچەوانەی بەڵێنەکانەوە بوونی سەربازی و سیاسی خۆیان لە ئازربایجاندا زیاد دەکرد و ڕاوێژکارانی سۆڤیەتی لە مەهابادا مەشقیان بە سوپای کورد دەکرد.

ئێرانییەکان هەموو هەوڵ و تەقەلایەکی خۆیان وەگەڕ خست تا سۆڤیەتەکان ناچاربکەن خاکی ئێران بەجێ بهێڵن، ئیدی لە ڕێگەی پارانەوەو تکاوە بیگرە تا ڕژدبوون لەسەر پێشکەشکردنی داخوازی ڕەسمی و گوشاری ئەمریکی و بەریتانی، بەڵام ئەم هەوڵانە کەمو زۆر هەڵوێستی سۆڤیەتی نەدەگۆڕی، بەڵام سەرۆکی تازەی ئەمریکی(هاریس ترومان)، سووربوو لەسەر ئەوەی کە ڕووبەڕووی کاریگەری سۆڤیەت بوەستنەوە، ئەو سۆڤیەتەی کە هەموو هێماکان وایان دەنواند کە بەرەو ئەوە دەچێ ببێ بە دەوڵەتێکی زلهێنر بە تایبەتی دوای نەمانی ئەڵمانیای نازی، جا ئەگەر ئەم لە ڕووەوەستانە لە ڕێگەی نەتەوە یەککگرتوەکانیشەوە بێ کە ئەمریکا لەو سەرو بەندەدا سەرپەرشتی دامەزراندنی دەکرد.

نوێنەری ئێران لە ڕۆژی 1946/1/19دا سکاڵانامەیەکی دایە ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی و شکاتی کردبوو کە سۆڤیەت دەست لە کاروباری نێوخۆی ئێران وەردەدات وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکاو بەریتانیا و فەرەنسای هاوپەیمانی ئەمریکا پشتیوانییان لەو سکاڵایەی ئێران کرد، ئەمە یەکەمین سکاڵابوو کە دوای دوو ڕۆژ لە دامەزراندنی ئەنجومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتی درا بە ئەنجومەنی نێوبراو، بەرلەوەی ئەم ئەنجومەنە هێشتا پەیڕەوی ناوخۆی دانابێ، لە مانگی ئازاردا نوێنەری ئەمریکاو بەریتانیا لە مۆسکۆ نارەزایی نامەیەکی ڕەسمیان دژ بە ڕەفتاری سۆڤیەتی پێشکەشکرد، دیگول بەخۆی بانگەوازێکی ئاراستەی کرملین کردو داوای کرد لە ئێران پاشەکشە بکات.

هەر چەندە ئەنجومەنی ئاسایش نەیتوانی بگاتە بڕیارێکی ئیلزامی، تەنانەت پاش سکاڵای دووەمی (ئێران)یش کە لە18/3و1946/4/12 پێشکەشی کردەوە، بەڵام یەکێتی سۆڤیەت کە دەترسا تووشی گۆشەگیرییەکی نێودەوڵەتی ببێ، نەیتوانی بەرگەی ئەو هەموو گوشارانە بگرێ کە لە لایەن ڕایگشتی جیهانییەوە دەکرایە سەری.

کاتێک کە سەرەک وەزیرانی ئێران(احمد قوام) کە لە مانگی 2 ئەم پۆستەی وەرگرتبوو، ئیشارەتی دایە سۆڤیەت سەبارەت بە مافی دەرهێنانی نەوت، سۆڤیەتەکان لێبڕان گۆڕانی بنەڕەتی لە سیاسەتی خۆدا لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین بکەن و لەسەر بناغەیەکی تازە سیاسەتی خۆ ڕ ۆبنەنەوە، بڕیاریاندا جاری کۆمەک و پشتیوانی ئازربایجانییەکان و کوردەکان ڕابگرن و لەبری ئەوە هەوڵبدەن لەگەڵ حکومەتی ئێرانیدا بگەنە ڕێکەوتنێکی وەها کە لە لایەکەوە یەکێتی ئێران بپارێزێ و لە لایەکی ترەوە ڕووسەکان مافی دەرهێنانی نەوت وەدەست بهێنن(ج. س هوروفیتس)ی ئەمریکایی پسپۆڕ لە کاروباری ڕۆژهەڵاتی ناڤین، لە ساڵی 1946دا لە تەعلیقێکیدا لەسەر ئەم بابەتە دەڵێ لەڕوانگەی سۆڤیەتی یەوە ئەم کارە بریتیبوو لە گرتنەبەری دوو ڕێگە بۆ یەک ئامانج ئەویش نزیک بوونەوە بوو لە کەنداوی فارسی".

(احمد قوام) لە مانگی ئازاردا ئەم گفتوگۆیەی لەگەڵ سۆڤیەتەکاندا گەیاندە دوا قۆناغەکانی، وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت(گرۆمیکو) لە کاتی ئاڵۆزبوونی تەنگژەکەدا ڕایگەیاند کە هێزەکانی سۆڤێت بەم زووانە و لە ماوەی کەمتر لە شەش هەفتەدا خاکی ئێرانی بەجێ دێڵن ئەگەر ڕوداوی تازەی چاوەنۆڕ نەکراو نەیەتە پێشێ". ڕەنگە ویستبێتی بەم ڕستەیەی دوایی، سەرکەوتن یان سەرنەکەوتنی گفتوگۆی ئێران و سۆڤیەت، بە مەسەلەی مافی دەرهێنانی نەوتەوە ببەستێتەوە.

بەڵام ڕەوتی کاروبارەکان زۆر بە خێرایی چووە پێشێ لە4ی نیساندا قوام و سەفیری سۆڤیەت لە ئێران(أ. گ. سادخیکوف) ڕەشنوسی دامەزراندنی کۆمپانیای نەوتی ئێرانی- سۆڤیەتییان خستە بەردەم ڕۆژنامەوانان ئەوە ڕاگەیەنرا کە ئەم ڕێکەوتننامەیە بۆ ماوەی پەنجا ساڵ بەردەوام دەبێ و لە ساڵی 1966دا کۆتایی دێت ڕێکەوتنەکە ئەوەشی تێدا بوو کە سۆڤێتەکان لە 25ساڵی یەکەمدا 51٪ی بەشەکانی کۆمپانیاکە دەبەن و پاشان کەم دەکرێتەوە بۆ50٪ هەروەها لە بەشێکی تایبەتی ڕێکەوتننامەکەدا ئاماژە بۆ ئەوەکرابوو کە ناوچە نەوتاوییە دەوڵەمەندەکان بریتین لە هەردوو پارێزگای ئازربایجان و کوردستان واتا هەموو ناوچەی باکووری ڕۆژاوای ئێران بەدرێژایی سنوری عێراق و تورکیا.

## ڕوخانی ماڵە کارتۆنییەکە

ڕێکەوتننامەکە هەر ئەوەندەی مابوو ئەنجومەنی نوێنەرانی ئێرانی لە ماوەی کەمتر لە شەش مانگ پەسندی بکات و ئەوسا سۆڤیەت هەموو نەوشتانەیان چنگ بکەوێ کە مەبەستیان بوو.

قوام هەر بۆ ئەوەی نیازپاکی خۆی نیشان بدات هەستا دوو نوێنەری حیزبی تودەی لە کابینەی وەزارەتی ئێرانی وەرگرت، ئیدی سۆڤیەت بێ سێ و دوو قوربانییان بە سەربازی شەترەنجی ئازربایجانی و کوردی داو بە خواردنی دان.

لەو کاتەندا کەسەفیری سۆڤیەتی(سادخیکوف) لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە مەسەلەی ئازربایجان(مەسەلەیەکی ناوخۆی ئێرانییە) و پێویستە دەست بە گفتوگۆی ئاشتیانە لە نێوان تاران و ئازربایجاندا بکرێ تا ئازربایجان بگەڕێتەوە باوەشی ئێران و جۆرە خود موختارییەکی هەبێ، لە هەمان ئەو کاتانەدا دەسەڵاتی ناکۆمۆنیستی لە مهابادا پشت گوێ خراو سۆڤیەتەکان بەتەواوەتی فەرامۆشیان کرد، بێ ئەوەی گوێ بەوەبدەن کە چارەنوسی بەکوێ دەگات، ئەوەبوو لە کاتی گفتوگۆی نەوتدا بە جارێ پشت گوێ خرا سەفیری ئەوکاتی ئەمریکا لە تاران لەم بارەیەوە دەڵێ: "داروخانی ماڵی کارتونی ئازربایجانی و کوردی سەرکەوتن بوو بۆ سیاسەتی دروست و هەڵوێستی بنجبری نەتەوە یەکگرتوەکان بەرانبەر بە یەکێتی سۆڤیەت"، هەروەها لە سەری دەڕوات و لە پێشبینیەکیدا کە ڕەنگە بۆ هەشتاکانیش دروست بێ دەڵێ: "نابێ باوەڕ بەوە بکەین کە کرملین بەم شکستە حەیابەرەیە رازی دەبێ و. وەدەست هێنانی مافی دەرکردنی نەوت وای لێدەکات کە هەوڵنەدات دەسەڵاتی سیاسی و ستراتیژی لەسەرانسەری ئێراندا وەدەست بێنێ".

ئیدی بوکەڵەکانی دەستی مۆسکۆ لە تەورێزدا خێرا بایاندایەوە، کەوتنە خۆ سازاندن لەگەڵ ڕەوت و، ڕێبازی تازەی سۆڤیەتداو تەنانەت هاوڕێ پێشەوەری رایگەیاند کە ڕێکەوتن لەگەڵ تاراندا(بەداخەوە)زەروری یە چونکە ئەمریکا و بریتانیا مەسەلەی ئازربایجانیان کردوە بە هەنجەت بۆ خولقاندنی گیروگرفت بۆ دۆستی گەورەمان یەکێتی سۆڤیەت" ئابەمجورە گفتوگۆ لە نێوان ئازربایجانیە ستالینیە هاوسۆزەکانی کۆمۆنیزم و حکومەتی ئێرانی لە تاراندا دەستپێکرد، حیزبی تودە هاتە مەیدانی سیاسییەوە و چەندین خۆپیشاندان و مانگرتنی لەسەرانسەری وڵاتدا ڕێکخست.

ئەم ڕەوشە تازەیە و ئەو نزیک بوونەوە دیارە لە یەکێتی سۆڤیەت کردییە کارێک کە عەشایەری کەمە نەتەوەیی تری وەک(بەختیاری) و(قەشقەیی) لە باشووری وڵاتدا کە شەقڵێکی ئاینی هەبوو، بە پشتیوانی و هاندانی ئینگلیزەکان راپەڕن و روو بەرووی حکومەت ببنەوەو داوای لێبکەن کە سنورێک بۆ ئەم سیاسەتی (داشکان بەلای چەپ)دا دابنێ هەروەها بەرنامەی کۆمەکی ئەمریکیش کەوتە لەقین و ئەمەش وای لە (قوام)کرد کە لە مانگی 1946/1دا گۆڕانکارییەک لە وەزارەتدا بکات و وەزیرە کۆمۆنیستەکان دەربکات و وزارەتێکی بە هێزی وەها دابنێ کە سوربێت لە سەر پەیرەوکردنی سیاسەتێکی سەربەخۆی دوور لە سیاسەتی سۆڤیەت، بۆیە هەر هەموو ئەم کارانەی کرد چونکە دەیزانی ڕەوتی گشتی کاروبارەکان هاتۆتەوە تایمی خۆی و بەچ ئاراستەیەکدا دەڕوات.

لەم کاتەدا سوپای ئێران کەوتەوە سەر پێیان و ئەوسوکایەتی یە گەورەیەی لەبیرکرد کە لە ماوەی داگیرکردنی ئێراندا بە سەری هاتبوو پێدەچوو رازی بێ لەو دەورەی کە (قوام) لەم قۆناغەدا بۆ سوپای دانابوو، کە بریتی بوو لەوەی دەزگایەک بێ هەنگاوی گونجاوی ئەوتۆ بنێ کە چارە نوسی وڵات دیاری بکات. سەرەک وەزیران لە 1946/11/25دا فەرمانی بە سوپادا کە ئازربایجان و کوردستان بە هەنجەتی نوێبوونەوەی ریفراندۆمی گشتی بگرێتەوە و هەر بەرگرییەکی چەکدارانەی لەم دوو پارێزگایەدا هاتەرێ سەرکوتی بکات. ئەوەی هەست دەوروژێنێ، لە هەرەتی ئەم گۆڕانکارییە خێرایانەی ئێراندا، ئەوە بوو کە قازی محمد لەو کاتانەدا لە تاران بوو، بروسکەیەکی نارەزایی نارد دژی ئەو نەخشەیەی کە بۆ داگیرکردنی کۆماری کوردی دانرابوو هەروەها بە پشتی دۆستە سۆڤیەتەکان، لەو گفتوگۆیەدا کە لە مانگی ئەیلولدا لە تاران کردی، زۆر بە توندی ڕەفزی ئەوەی کرد کە مهاباد بۆ باوەشی ئێران بگەڕێتەوە، کاتێ هێزەکانی ئێران بە سەرۆکایەتی ئامیر لیوا(هەمایونی) لە سنوری هەردوو کۆمارە بێ خاوەنەکە نزیک بووەوە، هەنگینێ کوردەکان کەوتنە گومان لە دروستی کۆمەکی یەکێتی سۆڤیەتی مەزن بۆیان.

شاندێکی کوردی لە سەرەتای مانگی کانونی یەکەمدا بەلەز چوو بۆ شاری ڕەزاییە تا چاوی بە(هاشمۆف)ی کونسوڵی سۆڤیەتی لەوێندەر بکەوێ لەوەوە بزانن کە هەڵوێستی سۆڤیەتی چییە هلشموف هەموو هەواڵێکی وەگەرخست تاکوردەکان تێ بگەیەنێ کە ئەنجامی کارەکان ئەنجامێکی باش دەبێت و تاران بە تەمایە چەند یەکەیەکی سوپایی ڕەمزی بنێرێ بۆ سەرپەرشتی کردنی ڕەوتی هەڵبژاردنەکانی ئایندەو هەرکە هەڵبژاردن تەواوبوو، ئیدی سوپا لە خاکی هەردوو کۆمارەکە دەکێشێتەوە لەبەر ڕۆشنایی ئەم قسەیە، ئەنجومەنی جەنگی لە مهاباد فەرمانی بۆ هێزە کوردییەکان دەرکرد کە هیچ جۆرە مقاوەمەتێک لە بەرانبەر پێشرەوی هێزەکانی ئێران نەکەن، بەڵام دوای چەند ڕۆژێکی کەم بە ئاشکرا ئەوە دەرکەوت کە چارەنووسی کۆماری مهاباد لە راستیدا پەیوەست بوو بە چارەنووسی کۆماری ئازربایجانەوە.

لە ڕۆژی 1946/12/13دا پێشینەی هێزی ئێرانی خۆی بە شاری تەورێزدا کرد، بێ ئەوەی یەکێتیی سۆڤیەت چ کاردانەوەیەک دەربرێ بۆ رزگارکردنی سیستەمی ستالینی ئەو ڕژێمەی کە خۆی بەشداری لە دامەزراندنیدا کرد، لەئەنجامی ئەو ڕەفتارە توندو تیژانەدا کە دەزگای ئاسایشی حکومەتەکەی پێشەوەری کردیان، چەند گروپێکی ئەنتی کومونیزم کەوتنە پەلاماردان و داگیرکردنی بارەگا حیزبی و حکومەتییەکانی تەورێز و گەلەک ئاژاوە و پێکادان بەرپابوو، و جەماوەری تورە چەندین کۆمونیستیان کوشت، خەڵکی ئاژاوەچی زانییان کە(محمد بیریا)ی وەزیری پەروەردەی جاران پەنای وەبەر خەستەخانەی سۆڤیەتی بردوەو لەوێندەر خۆی

شارۆتەوە، ئەوەبوو پەلاماری خەستەخانەی نێو براویان داو بەستیان بە ئوتومبیلێکەوە و تا مردن هەر رایانکێشا، بەلاَم پیشەوەری و ئەندامانی گرینگی وەزارەتەکەی، لەکاتی خۆیدا بۆ باکۆ هەلاَتن و لەوێندەر پەنایان وەبەر هێزەکانی سۆڤیەت بردو، ئیدی کوردەکانیش یەقینیان پەیداکرد کە چارەنووسی کۆمارەکەیان پاش رووخانی تەورێز، نەمان و رووخانە، ئەوە بوو لە رۆژی 1946/12/17دا چارەنوسی کورد دیاریکرا.

## سێدارەکانی مەیدانی چوارچرا

قازی محمد سواری ئوتومبیلە (سیدان) کەی خۆی بوو، ئەم ئوتومبیلە سۆڤیەتەکان بە دیاری دابویانێ جلی مەدەنی لەبەر کردو جلی سوپای سۆڤیەتی بۆ یەکجارەکی لەبەرداکەند، چەند کەسێك لە یاوەرە نزیکەکانی لەگەڵی چوون قازی محمد گەییە بریارێکی پێچەوانەی راو تەگبیری زۆربەی خەلَکی، هەروەها بارزانی زۆری لەگەڵ گوت کە لە مهاباد وەدەرکەوێ و پەنا بۆ یەکێتی سۆڤیەت یان عێراق بەرێ بەلاَم سودی نەبوو قازی محمد بریاریدا کە لە نێو گەلەکەیدا بمێنێتەوە، لە نێو ئەو گەلەدا کە سوێندی خوارد بوو رێبەرایەتیان بکات وبیانپارێزێت، ئیدی وەکو داب و نەریتی کوردانو لێبرا لە شار دەرکەوێ و بچێتە پێشوازی سەرکەوتوو، و خۆ تەسلیم بکات.

ئوتومبیلەکەی قازی محمد و یاوەرەکانی بەسەر جادەی زوقم و شەختەگرتودا بەرەو باکورو ر ەوەو رەزاییە وەرێ کەوت کاتێ ئوتومبیلەکە13کیلومەتران رێگەی بڕی و گەییە نزیکی گوندی (قەرەتەپە) بەرایی هێزەکەی جەنەراڵ هەمایونی بە دیارکەوت هەنگێنێ قازی محمد دەستووری بە شوفێرەکەیدا کە بوستێت، ئیدی لە پاڵ ئوتومبیلەکەدا وەستا و چاوەڕوانی گەیشتنی هەمایونی کرد. هەمایونی سەرکەوتوو، بەرێزەوە داوای لێکرد کە سواری ئوتومبیلەکەی خۆی ببێ و لەگەڵ هێزەکەدا بەرەو مهاباد بچێت ئێرانییەکان بۆ ئێوارە شارەکەیان داگیرکرد، شار لەتۆ وایە شاری شەبەنگانە، چ مقاوەمەتێکی نەکرد جەنەراڵ هەمایونی هەر لە مەیدانی چوارچراوە کۆتایی کۆمارەکەی راگەیاند و ئەوەی راگەیاند کە ئیدی شار گەڕایەوە باوەشی ئێران، ئیدی قازی محمد بە دەستبەسەری لە ماڵی خۆیدا مایەوەو سەرکردەکانیتر گیران.

دەولَەتی کوردی، بەر لە چەند رۆژێك هەیبەت و بوونی راستەقینەی خۆی لە دەست دابوو، بە هۆی ئەو ناکۆکی یەی کە لە سەرەتای دامەزراندنیەوە لە نێوان (شێران) و(هەلَپەرستان)دا هەبوو لە نێوان چەکدارانی عەشایەرو بۆرژوایانی شاردا هەبوو، ئەو ناکۆکیانەی کە کۆمار بە درێژایی تەمەنی خۆی نەیتوانی چ چارەسەرێکیان بۆ بدۆزێتەوە، سەرانی هەندێ خێڵ ویستیان بەرگری تایەتی بکەن وەکو خێلَی(گەورك) و(زرازی) کەلێکۆلَەرەوەی ئەلَمانی پسپۆر لە کاروباری ئەرمەن (الیهمات هاویت) باسی دلێری و بوێریانی کردووە.

بەلاَم ئەو هاوارەی کە ئەوان بردیانە بەر عەشیرەتی شکاك، لە لایەن سەرەکی ئەم خێلَەوە (ئەمیرخان شریفی)یەوە کە کۆماری کوردی پلەی جەنەراڵی دابوێی، وەها وەلاَم درایەوە کە: "مخابن ناتوانین هیچ یارمەتییەکتان بدەین چونکە هەموو ئەسپەکان رەوانەی پاوان کراون". بە پێچەوانەی شکاکەوە ئەسپی پیاوانی(هەرکی) رەوانەی پاوان نەکرابوون". بەلَکو هەندێك لە رۆلَەکانی ئەم خێلَە، سواری ئەسپەکانیان بوون و بە پەلە بەرەو رەزاییەو تەورێز وەرێکەوتن تا بەشداری بکەن لە لەنێوبردنی کۆماری ئازربایجانی دراوسێیاندا، ئیدی بەرەبەرە هێزەکانی تری کۆماری مهاباد کەوتە هەرەس هێنان و لە نێوچوون تەنیا ئەو هێزە پچوکە نەبێ کە هەلَبژاردەی هێزەکانی کۆماربوو، بەنێو بەفرو سەرمادا بەرەوسنوری عێراق و ئێران کشایەوە و خۆی بە گوندە شاخاوییە دورە دەستەکاندا پەنادا.

گەرچی ئەم کۆمەلَە جەنگاوەرە توانیان خۆیان دەربازبکەن لێ چارەنوسی قازی محمد و یاوەرە نزیکەکانی زۆر زوو دیاریکرا لە سەرەتای ساڵی 1947دا دادگایەکی سوپایی ئێرانی لە مهاباد دانرا و قازی محمد و هەردوو وەزیری بەرگری و ناوخۆی کۆماری کوردی بە تۆمەتی یاخی بوون و خیانەتی گەورە تاونبارکردو حوکمی لە سێدارەدانیان بە سەردادرا چونکە(محمد رەزا شای پەهلەوی) سووربوو لەسەر جێبەجێکردنی ئەم حوکمە، بۆیە هەموو هەوڵێکی تەمیزکردنەوەو سوککردنی ئەم حوکمە بێ ئاکام مایەوە، لەو کاتەدا کە هاوپەیمانانی سەرکەوتوو لە دووەم جەنگی جیهانیدا، شاری (نورنبرگ)ی ئەلَمانییان، بە حوکمی پێگەی تایبەتی شارەکە، هەلَدەبژارد بۆ دادگایی کردنی تاوانبارانی جەنگ، شای ئێران سووربوو لەسەر ئەوەی کە حوکمی ئیعدام کردنی قازی محمد لە مەیدانی چوارچرادا جێبەجێ بکرێ، ئەو چوار چرایەی کە لەوێندەرەوە جیابوونەوەی مهاباد لە ئیمپراتوریەتی ئێرانی راگەیەنرا.

لە ئێوارە وەختێکی درەنگی رۆژی1947/3/3دا، دەنگی پاچ و بێلَی ئەو سەربازە ئێرانیانەی کە خەریکی داچەقاندنی سێ قەنارەبوون لە مەیدانی چوارچرا، وەستاو خامۆش بوو، ئەوە بوو لە بەرە بەیانی رۆژی ئایندەدا و هەر لەوێدا نوێنەرانی یەکەمین کۆماری کوردی لە سێدارەدران، لە مانگی ئایندەشدا(5) سەرکردەی تری کورد هاتنە خنکاندن و سی و یەك سەرکردەی تریش خرانە زیندانەکانی شاوە و بێ سەرو شوێن کران و کەس نەیزانی چییان بەسەر هێنرا.

## پاش شکست و داروخان

مەلا مستەفای بارزانی، کە رۆژێك پێش رووخاندنی مهاباد، خۆی گەیاندبووە ئەوێندەر تا قەناعەت بە پێشەوا قازی محمد بکات کە لە مهاباد وەدەرکەوێت و خۆی بەدەست هێزەکانی ئێرانەوە نەدات.. ئەم پیاوە یەکەم کەس بوو کە بە هوشیارییەوە هەستی

بەرەوتی کاروبارەکان کرد لای ئاشکرابوو کە ئەو بڕیارەی دژی بەرژەوەندییەکانی کورد دراوە، بڕیارێکی سیاسییە، شکستی کورد پتر شکستێکی سیاسییە تا شکستی سوپایی بێت، هەندێ هاوعەسری خۆی گوێیان لێ بووە کە چۆن نائومێدی خۆی لە دۆست و هاوپەیمانی خۆیان، لە یەکێتیی سۆڤیەت دەربڕی بوو، گوتبووی: "هێزی ئێران بەسەر کوردا سەرنەکەوتوون، بەڵکو بەریتانیا و وولاتە یەکگرتوەکان بەسەر یەکێتیی سۆڤیەتدا سەرکەوتوون".

هەڵبەتە ئاکامی نسکۆکە، سەبارەت بە بارزانی و هاوەڵەکانی جیاوازتر بوو لە هی پیاوەکانی تری کۆماری کوردی چونکە ئەوان ئێرانی نەبوون، هاووڵاتی عێراقی بوون، بۆیە نەدەکرا بە خیانەتی گەورە تۆمەتبار بکرێن بارزانی دەیزانی کە ئەوپەرەکەی تەسلیم بە عێراق دەکرێنەوە، بۆیە بارزانی، پاش ئەوەی قازی محمد خۆی بەدەستەوەدا، سەردانی جەنەراڵ هەمایونی فەرماندەی هێزەکانی ئێرانی کرد و ئاگاداری کردووە کە خۆی و خەڵکەکەی کە ژمارەیان دوانزە هەزار کەس دەبن، بەتەمان بۆ زێدی خۆیان بۆ بارزان بگەڕێنەوە، بە مەرجێ بەریتانیا گوشار بخاتە سەر عێراقییەکان گیانیان بپارێزێ هەمایونی بایەخی‌ی تایبەتی بە بارزانی دەدا، ئەمەش لەوەدا دەرکەوت کە هەموو دەسەلاتی‌ی خۆی وەگەڕخست تا زەمینە بۆ بارزانی خۆشبکات کە سەفەری تاران بکات و بەخۆی ئەم پێشنیارەی بخاتە بەردەم بەریتانییەکان، بارزانی پتر لە هەیڤەك لە(بەهو)ی ئەفسەراندا لە تاران مایەوە زۆر بەرێزەوە وەکو میوانێکی رەسمی مامەڵەیان لەگەڵدا کرا.

کاتێ بەریتانییەکان پێیان راگەیاند کە وەڵامی بەغدا ئەوەیە کەگوایە ناکرێ ئەم داوایەی جێبەجێ بکرێ، ئێرانی‌یەکان پێشنیازی ئەوەیان کرد کە بارزانی‌یەکان لە ناوچەکانی چیای (الوند)ی رۆژاوای (هەمەدان)ی دەوروبەری ناوچەکوردنیشنەکانی ئێران نیشتەجێ بکرێن هەر چەندە بارزانی دڵی پێوەبوو کە ئەم پێشنیارە قەبوڵبکرێ، بەڵام شێخ ئەحمەدی براگەورەی، کە سەرۆکی رەسمی عەشیرەت بوو، و دوابڕیارش بە دەستی ئەو بوو، پێشنیاری گۆڕینی رەفزکرد هەڵبەتە بوونی ئەم هێزە چەکدارو شەڕکەرو چەلەنگە، لەم ناوچە سنورییەدا کە تازە ئازاد کرابووەوە، مایەی نیگەرانی هەمایونی بوو، ئەمە پاڵی پێوە نا کە بچێتە نەغەدە و سەردانی شێخ ئەحمەد بکات و داوای دوا وەڵامی لێبکات و بزانێ بەتەمای چییە، بەڵام شێخ ئەحمەد نەیدەویست هەروا سوك و ئاسان گرێی دڵی خۆی بۆ بکاتەوە بۆیە پی‌ی گوت بەخۆ و خێڵەکەیەوە، زەمانەتی بەریتانی و عێراقی هەبێ یان نەبێ، بۆ عێراق دەگەڕێنەوە لە سەری رۆیی و گوتی چاوەڕوانی بەهاردەکەن تا رێگە بکرێتەوە و بتوانن ناوچە سنورییە سەختتەکان ببڕن، هەمایونی، ئەم هەڵوێستە نادیارو ئاڵۆزەی لە بەرگرانبوو، سەبری سواو بە شێخ ئەحمەدی گوت کە تەنیا سێ رێگەتان لە بەرە و چوارەمی نییە، یان دەمودەست و بێ چاوەڕوان کردنی خۆشبونی هەوا بۆ عێراق بگەڕێنەوە یان چەك دابنێن و تەسلیم بە ئێران بن و گوێ رایەڵی بڕیاری ئێران بن، دەنا بە پێچەوانەوە دەبێ خۆبۆ شەڕی سوپای ئێران ئامادە بکەن.

هەمایونی نەغەدەی بەجێ هێشت و گوتی دوو رۆژی دی بەهێزەکەیەوە دێتەوە بۆ وەڵام و بڕیاری کوردان بە راستیش دوای دوو رۆژان هاتەوە، بەڵام کاتێ هێزی سوپایی ئێران بە پشتیوانی تۆپ و تانك، پاش دوو رۆژان هاتە نێو نەغەدەوە، تاقەیەك بارزانی‌ی لەو دوانزە هەزار بارزانییەی نەبینی، لەتۆ وایە زەوی قووتی داون.

شتێکبوو لە بابەتی مەحاڵ کە هیچ تاقمێك بتوانێت بەو زستانە سەختە، کە لە زۆر شوێندا بە شەوان پلەی گەرمی دەگەییە سی نمرەی خوار سفرەوە، ئەو رێگاوبانە شاخاوییە ببڕێ و چوار سەد کیلومەتر رێگا بەنێو زریان و رەنوو و هەرەسی بەفردا بڕوات کەچی بارزانی‌یەکان بە حوکمی ورەبەرزی و خۆراگری و خۆشەویستی و گوێڕایەڵی بۆ سەرۆکەکەیان ئەمەیان کرد، ئەم کوردانە باشترین چەکی ناو عەمارەتی کۆماری مهابادیان، بەرلەوەی هێزەکانی ئێران دەستی بە سەردابگرن لەگەڵ خۆدا هێنا بوو، لەوانە پتر لە سێ سەد تفەنگی هەڵبژاردە، سەدوبیست رەشاش، دوو تۆپی مەیدانی‌و کۆمەڵێك نارنجۆکی دەستی زۆر.

## محمد رەزا شای پەهلەوی هەڵوێستی توندبوو

بارزانییەکان، لە سەرەتادا، لە لایەن هێزەکانی جەنەراڵ هەمایونییەوە تەنگەتاو نەکران جەنەراڵ هەمایونی پی‌ی وابوو مانەوەی لە بارەگای زستانەی خۆیدا زۆر چاکترەلەوەی ئەو کوردانە راوبنێ کە تەواو دوور کەوتبونەوە بەڵام شاکە هەزار کیلۆمەترێك لەوێندەرەوە دووربوو، زۆر توند بوو، سوور بوو لەسەر ئەوەی کە دەبێ هێزە هەڵبژاردەکەی کۆماری مهاباد دەرس و پەندێکی وەها دابدرێت کە هەرگیز ژبیری نەکات. ئێرانییەکان لە سەرەتادا ویستیان بە پی‌ی سیاسەتی (کوتی بکەوکۆتی بکە) عەشیرەتی هەرکێ بکەن بەگژ بارزانی یەکاندا، بەڵام ئەم هەوڵەیان سەرینەگرت ئەوە بوو هێزەکانی سوپای ئێرانیان خستە مەیدانەوەو بارزانی‌یەکان بەرەو سنوری عێراق چون، دیارە هەم کەشو هەوا لە باربوو، هەم شارەزای ناوچەکەش بون، ئیدی شەڕەکان بریتی بوون لە سووکە پی‌کادانی رۆژانەو پەراگەندە کە زیانی ئێرانییەکان زۆر لە هی بارزانییەکان زیاتربوو، ئیدی ئێرانییەکان پەنایان وە بەرتۆپ و فرۆکان بردو کەوتنە بۆردومانن و تۆپبارانی ئەو ژن ومناڵانەی کە بەلوتکەو زناراندا هەڵدەگەڕان یان بەقەد پاڵی هەزار بەهەزاردا دادەگەڕان، بەڵام بەو حاڵەشەوە لەسەرەتای نیساندا گەیشتنەوە خاکی عێراق و لە شەڕی ئێرانییان خەلەسانن لەم کاتانەدا هەندێ

کەناڵی کوردی دەسەڵاتدار لە بەغدا، توانیان کارێکی وەها بکەن کە عێراقییەکان چ کارێکی سوپایی دژی بارزانییەکان ئەنجام نەدەن، بەلای کەمەوە دەرهەق بەو ڕۆژە.

بەو جۆرە مەلا مستەفا و شێخ ئەحمەد لە ناوەندی هەیڤی نیساندا خێڵەکەیان گەیاندەوە ناوچەی بارزان بێ ئەوەی عێراقییەکان یان بەریتانییەکان هیچ دژایەتییەکیان بکەن. شێخ ئەحمەد بە خۆو چەند پیاوێك و هەموو ژن و منداڵەکانەوە تەسلیم بەحکومەتی عێراق بوو، وەزع و حاڵیان زۆر شڕبوو ماندو و شەکەتبوون، پێویستیان بە ماوەیەکی زۆر هەبوو تا ماندوێتی ئەو سەفەرە دژوارەیان لە لەش دەربچێت و وەحەسێنەوەو بێنەوە سەربەخۆ، بەڵام مەلا مەستەفا وای بەچاك زانی لەگەڵ کۆمەڵێك جەنگاوەری هەڵبژاردەدا، بۆ ناوچە سەختە سنورییەکانی تورکیا پاشەکشە بکات و لەوێ خۆ پەنا بدەن و چاوەنۆڕ بکەن ئاخۆ ڕۆژگار چ شتێکی تازەیان دێنێتەرێ.

پاشان بە دیارکەوت کە ئەم بڕیارە یەکجار ئاقڵانە و حەکیمانەبووە دەرکەوت کە کابینەی حکومەتی عێراق پڕە لەو عەرەبە ناسیونالستانەی کە لەژێر کاریگەری دامەزراندنی جامیعەی عەربیدابوون، ئامادەنەبوون هیچ نەرمییەك و ئاسانکارییەك لەگەڵ ڕۆڵەکانی نەتەوەی کوردا بنوێنن، بنەماڵەی هاشمی لەم بارەیەوە هاوبیرو بۆ چونی ئەندامانی کابینەی وەزارەتی ئەو وەختەبوون، وەختێ لە ساڵی 1939دا مەلیك غازی بەدەعمی ئوتومبیل مرد، تاجی پاشایەتی بە مەلیك فەیسەڵی دووەمی کوڕی غازی بڕا، کە هێشتا منداڵبوو.. کە فەیسەڵ و ناسیونالیستە عەرەبەکان سەیریان کرد خۆیان خودان بڕیارو دەسەلاتن، لێبڕان زۆر بە ساردی و بە توندی مامەڵە لەگەڵ کوردا بکەن کۆمەڵێك لەو ئەفسەرە کوردانەی کە وازیان لە سوپای عێراقی هێنابوو، و لەگەڵ بارزانیدا پەیوەندییان بە سوپای کۆماری کوردەوە بوو، لەگەڵ شێخ ئەحمەدا تەسلیم بووبوونەوە حکومەتی عێراق هەر بۆ ئەوەی بیانکات بە پەندو عیبرەت بۆ خەڵکانی دی گرتنی و دانی بە دادگایەکی سوپایی، حوکمی ئیعدام دران و زۆربەخێرایی حوکمەکە جێبەجێکرا یەکێك لەو ئەفسەرانە نەقیب عزت عبدالعزیز بوو، هەر چەندە ئەم پیاوە یاوەری شەخسی(وەلی عەهد)بوو، بەلاّم ئەمە شەفاعەتی بۆ نەکردو دادی نەدا.

### سەرچاوە

کوردگەلی لەخشت براویی غەدرلێکراو، دکتۆر گوینتەر دیشنەر، وەرگێڕانی حەمە کەریم عارف. چاپ دووەم – 1999– چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری هەولێر.






# قازی محمد و عشائرەکان باوەڕیان بە یەکتر نەئەکرد

میرزا محەمەد
ئەمین ـ مەنگوری



له كاتی شەڕدا فیشەك ئەدرا بەو كەسانەی كە تفەنگی بڕنەویان پێبوایە، ئەفەراتی چەكداری 3تیر سالْدات انگریزی- فیشكیان چنك نەئەكەوت، چونكە فیشەكی ئەو وێنە تفنگانەیان نەبو.

لەبەرئەوەی كە قازی محمد زۆر بە عەشائرەكان دلْ خۆش نەبو چەكەكانی بۆ ئەئەگۆڕینەوە بە بڕنەو.

قازی محمد ئەگەر بوی بكرایە بە زوترین كات ئاغواتەكانی لەناو ئەبرد جا ئەو بیْ باوەڕ و(دردۆنگیە) بوبو بە هۆی ئەوەی كە عەشائیرەكان سەر لە فەرمانی قازی محمد بپیچنەوە وە بۆ نەمانی تێبكۆشن.

لە زۆر ڕوداو و متینگا قازی محمد ئەی وت هەتا ئێستا بەسەر چوار شتا سەركەوتووم.

1. هەلْكردنی ئالاّی ئازادی كوردستان.
2. بیْ هێزكردنی ئاغایەكان.
3. دامەزراندنی دایرەی فەرهەنگ.
4. كڕینی چاپ.

جا بەم هۆیەوە ئاغاواتی عەشائیرەكان هەستیان بە پاشەڕۆژێكی خەراپی خۆیان كردبو. بە تەرزێكی نهێنی دەرگای مخابراتیان لەگەلْ حكومەتی ئێرانا كردبۆوە.

لەو باوەڕەدا بوم، ئەگەر لە ترسی ڕوس وملا مصطفی و حمە رشیدخان نەبوایە هەر زو ئاغایەكان لە قازی محمد ڕانەپەڕین و قازی محمد و ئەنجومەنی ئایالەتیەكەیان لەناو ئەبرد. حاشایان لە هەزار كورد وكوردستان و ئازادی ئەكرد. چونكە بۆ دەوری دەربەگیەتی و ئاغایەتی جاران یان زۆر پەشیمان بوبونەوە.

كە كچی كرمانجی بە پارە بفرۆشن و شیریایی ژن ئەوان وەریبگرن. وەلە هەمو شتیكا برابەش و شەریكە برابن لەگەلْ كرمانجا. دار داری ئەوانو پشت پشتی كرمانج بیْ.

هەتا ڕادەی لیْك هەلْبەزینەوەی قازی محمد و ئاغایان گەیشتە ئاقارێك كە عمرخانی شكاك- كە یەكێك بو لەسەر لەشكرەكان و كرابو بە پارێزەری ناوچەی سەقز، بەشی باشوور جنوبیەوە لە ژێرەوە لەگەلْ حكومەتی ئێران كەوتە مخابرەوە ئەگەر(70هەزار تومانی بدەنیْ جبهەی جەنگ چۆلْ بكات.

كاك اللو اغای حسن اغای- (قولقولْە) لە هەمان كاتا. لە ژێرەوە دەرگای مخابراتی لەگەلْ حكومەتی سقزا كردبۆوە موچەی(80) ئەمنیەی بە دروستی هەمو مانگیك وەرئەگرت.

لە هەمان کاتا علی اغای اسعدی- رئیس عشیرەتی دیبکری و حاجی بایز اغاو حاجی محمود اغای ئیلخان زادە حکومەتی ئێرانیان هان ئەدا کە هێرش بەرێتە سەر قازی محمد. کە لە وەختی خۆیان ئەو باسەتان بە درێژی ئەخەینە بەرچاو.

مام عزیزی قرەنی اغا- رئیس عشیرەتی مامەش- عبدالله خانی رئیس عشیرەتی مەنگوڕ- ملا خلیلی گورە مەر- محمد اغای عباسی- حاجی ابراهیم اغای گەورك ئەو سەرۆك عشیرەتانە لە ڕوی بێ مبالاتی قازی محەمەدەوە. هەموویان لەگەڵ حکومەتا کەوتنە ووتووێژ و بەڵێن و پەیمان بەستن و واداری بە مەنسەب و دەسەڵاتی گەورەتر. هەندێکیان هەڵاتن و چون بۆ تاران، هەندیکیشیان لە ژێرەوە بەرگی سیخوریان بۆ دەوڵەتی ئێران لەبەر کردبو لە دژی قازی محمد.

هەندێ دەستکاری سابلاغیەکان و پیلان هەڵ بەستراوی عەشائیرەکان بو بەهۆی ئەوەی کە نێوانی قازی محمد و حمە ڕەشید خانیش تێك بچێ. حەمە رشید خان ناچاری ئەوە ببێتەوە کە خۆی فرێ بداتەوە باوەشی پۆلیس و بەندیو دورخرانەوەی بۆ ڕمادیە و کەرکوك.

بێ سیاسەتی قازی محەمەد بو بە هۆی تەکێنەوەی زۆربەی عەشائیرەکان. قازی محمد چاوی لە ئازربایجانیەکان ئەکرد کە توانیان زۆر بە گورجی ڕۆحی ئیقطاعی و دەرەبگایەتی لە ناوچەی خۆیانا نەهێڵن وەیاسای تودە و شیوعەت تا ئەندازەیك بگەینەجێ، جا ئەو چاولێکردنو دەرسەی ئازربایجان لە قازی محمد نەئەوەشایەوە. چونکە موقف و جێگا و ڕێگا و ڕۆژی سیاسەتی قازی محمدو ئازربایجان زۆر لێکدوربون. قازی محمد وەختی ئەو هەنگاوەی نەبوکە لەگەڵ عەشائیرەکان تی کبدا و یاسای شیوعی بخاتە بازاڕی کوردستانەوە.

ناوچەی ئازربایجان لەگەڵ ناوچەی کوردا نێوانێکی زۆری هەبو، ئازربایجانیەکان هەر ئەوەندەیان وڵات هەبو کە چنگیان کەوتبو وە بە تەمای هیچ وڵاتیکی تر نەبون کە داگیری بکەن، بەڵام دەوری قازی محەمەد زۆر قۆناغی گەورەو منزلی دورتری مابو کە بیان بڕێ. وەکو ئازادی عیراق، سوریا، کوردی تورکیا، نفوزی عەشائیرەکان لەو کاتەدا

بۆ قازی محمد زۆر پێویست بو، چونکە بە پروپاگەندە هیوای نفوز بڵاوکردنەوەی عەشائیرەکان زۆر هەنگاوی قازی محمد جێگیر ئەبو.

لە ناو کوردستانا ڕوحیەی عەشائیرەی زۆر زیندو وە بەتینە بۆ بڕینی هەندێ مراحلی نیشتمانپەرستی. کورد و ئازەربایجان فەرقێکی زۆریان هەیە. ئازربایجانیەکان ناچاربون کە بە گورجی یاسای تودە سەرپێ بگرن- بەڵام کوردەکان جاری ئیشیان تەواو نەبوبو کە کاڵای شیوعیەتیان بخستایەتە بازاڕەوە. بە دوملیون کوردی ئازادکراوی مهاباد(15)ملیون کوردی غیرە ئازادکراو بترسێنن.

جا لەبەر ئەوە ئەتوانین بڵێن کە قازی محمد نەئەبو بەم پەلەپەلیە یەقەی ئاغاوات و خان و بەگەکانی بگرتایە و ئیعلانی شەڕی لەگەڵا بکردنایە. چونکە لەو کاتەدا عەشایرەکان بە هێزبون و ئەم پێویستی بە کۆمەگی ئەوان هەبو.

مصطفی کمال و ڕەزاشا لە دەوری خۆیانا بە هەزاران فرۆفێڵ وهێز و ڕاپەڕین، نەیانتوانی ڕوحی عەشائری و ئاغایەتی لەناوبەرن و بەچەند پەیمانی فێڵاوی وەکو پەیمانی سعد اباد و-کاخی سفید و گلستان- ویستیان گیانی عەشائری بێهێز بکەن، بۆیان نەکرا.

عەشائرەکان زو ئەبن بە کۆمەگ و زوش ئەتورێن- بەڵام کە زانایەکی هونەرمەند هەبێ ئەتوانێ بە سلیقە و مێشکی عشائری لەگەڵیانا بجوڵێتەوە تا ئەندازەیەکیش باری تەماعیان نیشانبدا. زۆر لەو سەربازانە باشتر شەڕ ئەکەن کە بەموچەو یاسای زۆر بە هێز پەروەردە کرابن.

عەشائیرەکان سافیلکە و خۆش باوەڕن. ئەگەر لە ڕێگای ڕاستا لەگەڵیان بدوێی زۆر بە ئاسان دێنە سەر ئەو بارەی کە کورد پێویستی پێ ئەبێ.

عەشائیرەکان بە تەماعێکی کەم ئەتوانن لەو حکومەتە بدەن کە وا خاکی کوردی داوەتە بەر لەپ- چونکە ئیستقلالی کورد، یا ئەبێ بە خوێنڕێژی وە یا بە هۆی قەڵەم و ئەحزابگەریەوە تأمین بکرێ.

خوێنڕێژی چەك و پارەیەکی زۆری ئەوێ کە ئەو مەبەستەی پێ ببرێتەسەر. هێزی حزبی دیمکراتیش لەوکاتەدا ئەوەندەی تەوانا نەبو کە بە پێشمەرگەی حزبی، لە دەوڵەت و عەشائیرەکان بدات جا کە وابو ئەبوایە قازی محمد عەشائیرەکانی بە گران و هەرزان لە حکومەت هاندابا. ڕێگایێکی وای نەهێشتبایەوە کە عەشائیرەکان پیا ڕوپشتبان بۆ لای حکومەت. چونکە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەندیدا. عەشائیرەکان دەستێکی باڵایان هەیە لە چەکداری و شەڕکردنا. لە زۆر دەورا دەوڵەتانی عەرەب و فارس و تورك سودیان لە نفوزی عەشائیرەکان کردووە بۆ سەر شۆڕکردنی ئەو دەوڵەتەی کە ویستویانە شەڕی لەگەڵا بکەن.

عەشائیرەکان لە شەڕی ناوخۆیی و شەڕی لابەلایی چەتەیدا زۆر لە سەرباز باشتر شەڕ ئەکەن.

ڕوتکردنەوەی عەشائیرەکان لە چەك و داماڵینیان لە مڵك، بۆ هۆزێك ئەگونجێ کە دەوڵەتێکی سەربەخۆ و دامەزراوبێ و لەهەمو باری کەوە خاوەنی هێز و چەکو تەوانابێ. لە پروپاگندەی دەرەوە پشت ئەستوربێ. یا حزبێك ئەتوانێ نفوزی ئاغوات و خانوبەگ نەهێڵێ کە لەسەر هێڵێکی ڕاست و دیمکراتیەت مەودایەکی زۆر بێ و لە خەبات و تێکۆشانا بێ. هەمو فەلاح وەرزێرو ڕەنجبەرەکانی ئەو عەشیرەتە لەناو حزبو سیاسەتا قاڵ بوبێتەوە. بە تەماعی دابەش کردنی زەویوزاری ئاغا میللەتەکە هەستابێتە سەر پێوە هێزی دەرەبەگ بێتین بوبێ.

بەڵام قازی محمد- لە دەوریکا داوای نەهێشتنی اغاواتو دەرەبەگی ئەکرد. کە هیچ تقریری مصیری ڕون نەکرابو. کەس نەیئەزانی بەسەربەخۆیی ئەژی یا ئەخریتە ژێر حوکمی ئازربایجان.



دەوڵەتی ئێران ئیعتراف بەم کیانو ژیانەی ئەکات یان لێ ئەدات. جا پێش ئەوەی کە قازی محمد ئەو قۆناغانە ببڕێ، لەسەر ئارەزووی شیوعی و شیوعی پەرستەکان جارێ لەگەڵ ئاغایەکان معرەکەو قرەی میراتی دابەستبو. لە زووترین کاتا- عەشائیرەکان جێگایەکی مەترسی بوون بۆ دەوڵەتەکانی بێگانە. چونکە چەکی عەشائیرەکان بە هەمیشەی بۆتە کۆسپێك لەرێی پەلاماردانی دەوڵەتەکانی بێگانە.

دەوڵەتانی بێگانە مەترسیێکی گەورەیان لە چەکداری عەشائیرەکان کردووە چونکە ئەو هێزەی هەتا ئێستا لە دەوڵەتانی عەرەب و تورك و فارس و رووسیی دابێ هەر عەشایر بووە. یان بەهیوای عەشائیرەکان ئەو حکومەتانە لە یەکتریانداوە لەزۆر کاتا.

بەڵێ نزامی سۆسیالیستی- لە دژی چینو تەبەقەی ئاغاواتو دەرەبەگێتیە، بەڵام ئێمە کە کوردین جارێ لەم کاتو رۆژەدا هیچ سودێك لەم تطور و ئالوگۆرە ناکەین چونکە هەرچی کە بیکەین بێگانە سودی لێ وەرئەگرێ نەك کورد.

کورد ئەبێ تێکوشانی بۆ کورد بکات نەك بۆ بێگانە. کورد ئەبێ شۆرش بۆ بەرزی کوردستان بکات نەك بەرزی وەڵاتانی دەرەوە، هەر میللەتێك کە دەست ئەداتە چەك و لەدژی حکومەتەکەی خۆی رائەوەستێ مانای ئەوەیە کە تەئسیرێك و دڵ شکاوی و نارەزایەتی یاساو زۆرداری ئەو حوکومەتەبووە وا ئەو میللەتە ناچار بووە کە بەرگی هەڵگەڕانەوە و شۆرشی لەبەرکردووە.

بۆ دەورێکی خۆشتر و ئاسایش تر هاتۆتە مەیدانی شۆرش و خوێن رێژیەوە. بەڵام کە دی دەوری حکومەتی پێشووی لەدەوری ئەم حکومەتەی ئێستایەی داخۆشتر و ئاسان تر و بەسوودتربووە. ناچار ئەبێ بۆ بادانەوە بۆ لای ئەو حکومەتەی کە لێی هەڵگەڕاوەتەوە جاله ئێرانا عەشائیرەکان و ئاغوات و خان و بەگەکان ئەو مەسرەحەیان دی، لەو شانوی سینمابییەی مهاباد بەتەواوی کەوتنە بەرچاوی وڵاتان.

جا لەبەرئەوەی کە هیچ وێنە ئیحترام و ریزێك بۆ ئاغواتو خانەکان نەمابۆوە لەدەوری قازی محمدا، ناچاربون کە با بدەنەوە بۆ لای حکومەت وە هەوڵی لەناو بردنی ئەو حکومەتە بدەن کە لە هەمو باریکەوە سەر و ماڵیانیان خستوتە مەترسی و نەمانەوە.

من لەگەڵ ئەو باوەڕەدانیم کە بڵێم تەبەقەی ئاغواتو دەرەبەگ مانەوەیان شتێکی باش بێ. بەڵام من ئەڵێم لە وەختێکی ئاوا ناسکو تەسکا لاوانەوەیان لە تۆرانیان پێویست ترە، چونکە ئیشیان پێتێکئەچێ. لەو باوەڕەدام ئەگەر قازی محمد توانیبای دڵی عەشائیرەکانی رابگرتایە و بەمستقبلی داهاتو تەمادار و دڵخۆشی بکردبانایە، هیچ ئاغایەك نەئەبو بە لاینگری حکومەتی ئێران، چونکە جەفا و رەزالەتو سوکێتی زۆریان لە ئێرانیەکان دی بو. بەڵام لە دەوری قازی محمدا- زۆرتر سوکیو مەترسییان چاو پێکەوت، بۆیە بە تێکرایی بایاندایەوە لای حکومەت. چونکە لە زەمانی حکومەتی ئێرانا هەر دەوڵەتو داوایەکەیان لە ژێر مەترسی دابو،

بەڵام لە زەمانی قازی محمدا سەر و ماڵو ناموسیشیان کەوتبوە مەترسیەوە. بۆنمونەی ئەو چەند ڕوداوەی خوارەوەتان بە عرض ئەگەینم کە من خۆم شخصیا رئیس حزبی جەوانان بوم لە ناوچەی سرا و ناوچەی سەقزا.

## حزبی جەوانان

لە ژێر سەرۆکایەتی علی خسرەوی سابلاغی و بەمستشاریەتی ئەسدۆف ناوی ممثلی سیاسی روس، حزبێك لە ناوچەی مهابادا پێکهات بەناوی (حزبی جەوانان– گەنجان– ئەندام و مرشحینی ئەو حزبە هەمووی ئەبوایە لەدەمروت و گەنج پێکهاتبایە.)

ڕاپەڕینەکەیان زۆر بەسام و ترسی ئەربو. ئەو حزبە لە حزبە خۆینرێژەکانی ئەوروپایی ئەکرد. هەر فەرمانێکیان کە پێ سپێرایایە ئەبو بەبێ گیروگرفت پێکیان هێنابایە.

نەفەراتی ئەو حزبە ئیمتیازێکی تایبەتیان هەبو لە هەموو ڕاپەڕین و تێکۆشانیکا. ئیشەکانیان وەکو بروسکە وابو. نابێ و ناکرێ لە بڕیارەکانیانا نەبو. نیشانەیکی زەرد و سوریان بەسەر سینگەوە دادورابو هەندێ نیشانەیان لە مفرەق و هەندێکیش یان لە پەرۆ دروست کرابو. لە رۆژی 31 تموزی 1946 عبدالرحمن ویس و سید بابانی حسینی هاتنە مەرکەزی سرا تشکیلاتی حزبی جەوانیان لە سەرا کردەوە، بەناوی حزبی جەوانانی(سقز و سەرا وظیفەی سەرۆکی ئەو حزبەیان بەمن ڕەوا دی.)

ئەو باسە لە رۆژنامەی کوردستان ژمارە(70)دا بڵاوکرایەوە بەڵام لە گەڕانەوەی حمە رشیدخان بۆ عیراق من ئەو وەزیفەی سەرۆکی حزبی جەوانانەم دایە دەست محمد محمود کە لەقەبەکەی محمد قدسی بو، جا ئەو حزبە لەناو کوردی ئێرانا سامێکی زۆری پەیدا کردبو.

ئەگەر ئازربایجان لەو چەندانەدا تسلیم بە ئێران نەبوبایەوە هەرچی ئاغوات و خانویەکی کوردەواری بون لەسەر دیهاتو شوێنەکانیان دەرئەکران.

بەڵام بەختی ئاغا و زۆرداری دووبارە ئاغا و ئاغاژنیان هێنانەوە سەر حکم و داروفەلاقەیان بۆ مسکین و کرمانجە هەڵگراوەکانیان دانایەوە.

ئەو حزبە هیچ گوێی نەئەدایە سوکی و بێ نەزاکەتی بەرامبەر بە ئاغایەکان. ئاغایەکان لە هیچ کاتێکا خۆیان بە خاوەنی سەر و ماڵو ژن نەئەزانی بو دەوری ئیرانی و ئەمنیە سوتخۆرەکان پەشیمان بوبونەوە.

لە پەنای ئەو حزبێکی شیوعی نهێنی لە دی باسی کەند) لە ژێر سەرۆکایەتی عزیز خانی ئاغای باسی کەند) کرابوەوە کە پێیان ئەووت پاڵەپشتی حزبی جەوانان، بەڵام وەکو حزبی جەوانان ئەو خۆی ئاشکرا نەکردبو هەر والە پەناوە دەستی ئەخستە ناو ئیشەکانی سوسیالیستی دروست کردن.

سەربەخۆیو ئازادی بۆ چینی دەرەبەگ و شۆڤینی نەمابوەوە. هەتا مجێوری مزگەوتەکانیش بە هیوای بەشومیراتی ئاغا خۆیان خستبوە ناو حزبی جەوانانەوە.

قازی محمد هەتا ڕەشو ڕوتیکی لە چینی کریکار و فلاح ئەهێنایە ژێر فەرمانی حزبیەوە و چەکداری لەلایەن ئاغاکانەو، وەلی تەفرەئەدراو پشتینەی بەربەرەکانیان لەزد ئەبەست.

قازی محمد ئەوەی بەراوورد کردبو کە کوردستان لە 50هەزار(دێ) پترە. ئەگەر لە هەر دێیەکا دوو و ئاغا و سێ چوار کەسی سەر بە اغای لێ برەنجێ دەستەی رەنجاو توراوان ئەکاتە نیو ملیون کەس.

بێگومان پروپاگەندەی نیو ملیۆن کەسی چەکدار و پارەدار معدەی باقی دانیشتوانی کوردستان تێکئەدا. ئەگەر تێکیشی نەدا ئەوا ئەو مەبەستە ئەشێوینی کە قازی محمد و دەستەی جەوانانی حزبی سوسیالیستی بەقونەخشکێ بۆی ئەچون.

چونکە دەوڵەمند و ئاغایەکان لە پێش ئەو ئینقلابەدا لایان وابو کە مبدەئی سوسیالیستی دەستکاری سەروەتو نفوز ناکات خەڵکەکە بە گەورە و بچوکیەوە ئامادەبون بۆ ئیستقبالی رووس، بەڵام لە دواییدا کە چاویان کرایەوە. تەماشایان کرد هەر ئاغاژنو کارەکەرێکیان بەدەست برا فەلاحێك و برا تێکوشەرێکی پیشەسازی و جەوانیکەوەیە لەو جەوانانەی کە قازی محمد چەکی داونەتە دەست بو پاریزگاری کوردستانی مەزن وە کوردستانی هەمو کوردیك. لە پێش دروستکردنی کوردستان جارێ پەلاماری ناموسی ئاغایان ئەدا بەڵێ ملەتان بە لەناو بردنی ئیقطاعیەتەوە ڕەجعی و دەرەبەگیەتی پێشکەوتون شۆرشی فرانسا لە ساڵی 1789 و شۆرشی ئۆکتوبەری رووس لە 1917دا بەڵگەی ئەوەیە کە بە توانەوەی ئەو خانو بەگو ئاغواتانە رووسیا و هەندێ وڵاتانی رۆژهەڵات پێیگەیشتون، بەڵام ئەوەندەی هەیە ئەو ڕاپەڕینە جارێ بۆ کورد دەست نادا چونکە کورد لە مراحلی ژیانو گیانی ئیستقلالیا هیچ قۆناغیکی نەبڕیوە. تا جارێ لە پێش هەموشتیکا بەگژ ئاغاکانا بچێت و نفوز و مەبەستی سوسیالیستی لە وڵاتەکەیدا بڵاوبکاتەوە، کە ئەو بیرە تەنها بۆ سودی شیوعیەت تەواو ئەبێ نەك کوردیەت، قازی محمد بۆ خویو محمد حسین خان سیف و صدری قازی برای دییان لە ناوچەی مهابادا هەبو قازی محمد ئەیزانی کە ژیانو یاسای دەرەبەگیەتی چۆنە وە چ دەنگیك لەم بەسەرهاتە دیتەڕو. بەڵام وا دەرئەکەوێکە پەنجەیێکی ناچاری ئەو ئیشەی پێکردبێ کە ناچار بوە بەسەر ئەم نەخشەی غەلەتەدا بڕوا. هەر ئەو پەنجەیەش بو کە داری ئازایەوە هەڵی ئاوەسی دیسان ئەو یاساو نظامەی حزبی شیوعی وە لەناوبردنی اغا و ئاغاژن لەم وەختەدا بو ڕوسیش هەر هەڵە بو رووسەکانیش ئەبوایە باریکیان تعقیب بکردایە کە دووربایە لە قرەو غەوغای ناوخۆیی. ئەو ڕاپەڕینو ئاغا و ئاغاژنە دەرکردنەیان هەڵگرتبا بو وەختیکی ئارام تر و پێویست تر، بەڵام رووسەکان ئەو ئیشەیان بۆ پەراوە

دامەزراندبو. ئایا ئەگەر ئێرانیەکان بەڵێنەکانیان ئەبردەسەر تا چ ئەندازەیەك ئەتوانن بە یاسای شیوعیەت لە ئێرانا پەیرەوی بکەن‌و، کوردەکان تا چە ئاقاریك حەز لە ژیانی سوسیالیست ئەکەن وە ئەڕون لەگەڵیا.

جابۆ تەدارەکاتی ئەو ڕۆژە ئەو(مەتەڵەیان) لە قازی محمد داهێناوەو پەراوەکەیان بە قازی محمد کرد.

لە سەر ڕاپورتی حزبی جەوانان زۆر ئاغای گەورە لە سابلاغ زیندانی‌و خانەنشین کرابون. لەو باوەڕەدا بوم ئەگەر ئەو حکومەتە تا مەودایەکی تر بەو تەرزە مابایەوە ئەو ئاغایانە یان هەموو لە داری سیاسەتە ئەدان، بەڵام بەختی ئاغوات لە بەختی کاکی فلاح بەهێزتر بوو.

## سەرچاوە

بەسەرهاتی سیاسی کورد، میرزا محەمەد لە 1914 1958، بەشی یەکەم، چاپی دووەم سلێمانی/ 2000.



از راست به چپ: مرحوم قاضی محمد و برادرش مرحوم صدر قاضی

□ نووسینی: عەبدولڕەحمان قاسملو

لە مانگی بەفرانباری1325دا دادگای پێشەوا قازی محەمەد و حوسێنی سەیف قازی دەستی پێکرد. لە ڕۆژی 9ی بەفرانبار(3ی دیسامبەری1946)دا سەدری قازیشیان لە تارانەوە هێناو لە مەهاباد زیندانی‌یانکرد، بەم شێوەیە هەرسێ قازی پێکەوە دادگایی کران، ئەم دادگایە نهێنی بوو نەیان دەهێشت کەس بزانێ چی لە دادگا ڕوودەدا، لەلایەکی دیکەوە کاتێك پێشەوا قازی و هاوڕێیانی داوایان کرد کە بۆ خۆیان پارێزەر (وکیل مدافع) دیاری بکەن ئەوەش لەلایەن دادگاوە ڕەدکرایەوە سەرۆکی دادگا سەرهەنگ فیرووزی زۆری ڕق لە جوولانەوەی دیموکراتی گەلی کورد و لە شەخسی پێشەوا بوو، پێشتریش بە نوێنەری لەشکری ئێران لە زەمانی کۆماری کوردستاندا هاتبوە مەهاباد، سەرەڕای ئەوەی کەدادگا نهێنی بوو و نەشیان هێشت پێشەواو هاوڕێیانی بۆ خۆیان پاریزەر هەڵبژێرن و بە زۆر پارێزەریان بەسەر داسەپاندن، ڕۆژی 19ی مانگی بەفرانبار(9ی ژانویەی1947)پێشەوا بۆ خۆی دیفاعێکی ڕێك وپێك و ئازایانەی کرد کە14سەعات درێژەی هەبوو، و هەموو تاوانەکانی دادگای فەرمایشی لەشکری شای ڕەدکردەوە ئەوسەنەدو بەڵگانە کە لە دەستدان تەنانەت ئەوانەی بە دەستی دوژمنانی گەلیش نووسراون بە چاکی نیشان دەدەن کە پێشەوا بە هەستی مەسئوولییەتێکی گەورەوە کە مێژوو خستبوویە سەرشانی، ئەوەندەی لە توانای دابوو و ئەوەندەی هەل و مەرجی دادگایەکی فەرمایشی نیزامی ڕێگای دەدا لە ئاواتەکانی گەلی کورد و ئامانجەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستان و هەروەها هەنگاوەکانی کۆماری کوردستان ئازایانە دیفاعی کرد.

پێشەوا قازی لە ڕۆژەکانی یەکەمی شکانی کۆماری کوردستانەوە دوو مەسەلەی زۆر بەچاکی لە بەرچاو بوون:

## یەکەم

ئەوەکە باش دەیزانی مردن چاوەڕوانیەتی‌و تاقی کردنەوەی چەندین ساڵ خەباتی گەلی کورد بۆی دەرخستبوو کە لەگەڵ دژمنێکی زۆردار و فێڵباز تێکەوتووە کە بە خوێنی ئەو وهی وەك ئەو تینووە، هەر بۆیەش لە یەکەم ڕۆژی گیرانی را تا دادگافەرمایشییەکەی تێکۆشا کە خۆی بە بەرپرسی ڕووداوکان و هەموو هەنگاوەکانی کۆماری کوردستان لە قەڵەم بدا، قازی دەی هەویست بەم جۆرە هەم بە ڕێگاو ئامانجاکانی حیزب و گەل وەفادار بمێنێتەوە و هەم ئەوەندەی دەکرێ لە تاوانی هاوڕێیانی کەم بکاتەوە، تا بەڵکوو بتوانێ کەمێك سزایان سووکتر بکا.

## دووهەم

ئەوەبوو کەپێشەوا قازی زۆر باش دەیزانی کە ئەوە شەخسی قازی محەمەد نییە، بەڵکوو جووڵانەوەی دیموکراتی خەڵکی کوردستانە کە دادگایی دەکرێ، ئاوات و ئامانجاکانی کۆمەڵانی زۆرلێکراوی گەلی کوردە کە دادگای نیزامی بە تاوانبار دادەنێ، هەربۆیەش وەك ڕێبەرێکی هەڵکەوتوو بەرامبەر بە جەلادە خوێنمژەکانی ڕێژیمی شا قارەمانانە ڕاوەستا و دیفاعی لە کۆماری کوردستان کرد.

دوژمنانی گەل زۆریان هەوڵدا قازی بێننە سەرئەوە کە بڵێ لە کردوەی خۆی پەشیمان بۆتەوە و داوای لێ بووردن بکا و لە بەرامبەریاندا بەچۆکدابێ، بەڵام پێشەوا قازی دادگای نیزامی و کاربەدەستانی ئەرتەشی شاهەنشاهی بە چۆکداهێناو ناچاری کردن کە بەرامبەر بە گەورەیی و ئازایەتی ئەو سەردانەوێنن، تەنانەت لە ژووری داخراودا کە نە تەماشاچی لێبوو و نەپاریزەر و نەدادگاش دادگا بوو، لەسەر سووکایەتی‌یەك کە بەگەلی کورد کرا پێشەوا قازی کورسییەکەی هەڵگرت و لە سەری دادستانی نیزامی ڕاکێشانەك هەر کۆنەپەرستی ئێران بەڵکوو ئاغابێگانەکانی، ئیمپریالیزمی ئەمریکا و ئینگلیس هێشتا هەر هیواداربوون کە قازی محەمەد بە فریو بەرن و کارێکی وابکەن پشت لە کارو کردەوەی خۆی و گەلی خۆی بکا و تەسلیمی ئەوان بێ، بەڵام پێشەوا قازی ئەمجارەش نەچووە ژێر بارو پێشنیازی نوێنەرانی ئەمریکای کە دە ڕۆژ پێش ئیعدام چوو بوون بۆ لای بە توندی ڕەدکردەوە، نەلەهەڕەشەکانیان ترسا و نەبەڵێن و وەعد و پەیمانەکانیانی بە هیچ دانا، پێشەوا قازی بەو سوێندەی کە لە 24ی ڕێبەندانی 1324(13ی فیوریەی1947)دا بەرامبەر بەگەل و نیشتمان خواردبووی وەفادار مایەوە، شەهیدبوو بۆ ئەوەی گەلی کورد سەربەرز بژی.

ڕۆژی3 ی ڕێبەندانی1325(23ی ژانویەی 1967) واتە ساڵێك و ڕۆژێك پاش ئەوەی بە سەرکۆماری کوردستان هەڵبژێرا پێشەوا قازی و هاوڕێکانی مەحکووم بە ئیعدام کران، بەڵام بەجێهێنانی حوکمی ئیعدام وەدواخرا، 77 ڕۆژی تەواوی پێ چوو تالە ڕۆژی15ی خاکەلێوەی1327 (25ی مارسی 1947)دا حوکمی ئیعدام لە مەهاباد بەڕێوەچوو.

ئەوە کە حوکمی ئیعدام زیاتر لە دوو مانگ وە پاش خرا چەند هۆی هەبوو:

یەکەم: پێشەوا قازی شەخسییەتێکی زۆر خۆشەویستی سیاسی بوو و نە دەکرا هەروا بە هاسانی بێلێکدانەوە ئیعدام بکرێ، هەربۆیەش سەعاتی سێی بەیانی پاش ئەوەی مەیدانی چوارچرا لە هەموو لایەکەوە گەمارۆ درابوو و لە سەربانەکان تیرباریان دانابوو، قازی و هاوڕێیانی لە سێدارە دران، کاتێك کە خەڵك لە خەوهەستان ئیدی پێشەواو هاوڕێیانی شەهید ببوون بەم جۆرە نەك هەر دادگای پێشەوا و هاوڕێیانی بەدزی بوو بەڵکوو تەنانەت ئیعدام کردنەکەشیان هەر بەدزی بەڕێوە چوو، هۆی دیکە ئەوە بوو کە ئەو کاتە جاری بەربەرەکانی لە کوردستان تەواو نەببوو و

بە تایبەتی بەربەرەکانی بارزانییەکان نەك هەربەردەوام بوو، بەڵکوو زەبری زۆر توندیشی لە لەشکری شادا بوو و رژێمی کۆنەپەرستی تاران ترسی ئەوەی هەبوو کە ئیعدامی پێشەوا قازی و هاوڕێیانی ببێتەهۆی نارەزاییەکی زیاتری خەڵکی کوردستان و رەنگە تەنانەت ببێتە هۆی دژەکردەوەیەکی توند لە لایەن خەڵکی کوردستانی ئێرانەوە.

لەسەر ئیعدامی قازییەکان هەرلە نێو کاربەدەستانی تارانیشدا ناکۆکی هەبوو هێندێ لە بەرپرسیارانی سیاسی دەوڵەتی، لایەنگری ئەوەبوون کە قازی و هاوڕێکانی ئیعدام نەکرێن، بەڵام ئەرتەشییەکان زۆریان هەوڵ دەدا کە هەرچی زووترە حوکمی ئیعدام بەرێوەبچێ، چونکە لەو بڕوایەدا بوون کە پێشەوا قازی هەم لە زەمانی کۆماری کوردستاندا دژی لەشکری شا راوەستاوە و تەنانەت بەچاوێکی سووك سەیری ئەفسەرەکانی کردووە و هەم لە زمانی دادگایی کردندا بە هیچ جۆرێك ئامادە نەبووە بچێتە ژێرباری داخوازەکانی نیزامییەکان و ئازایانە راوەستاوە و بەربەرەکانی لەگەڵ کردوون، لەشکری شا ئەوەی بەبێ حورمەتی بە خۆی دەزانی و داوای سەری پێشەوا قازی دەکرد.

لە ئاکامدا، پاش پێ داگرتنی ئەمریکاییەکان کە پێیان خۆش بوو ئیسباتی بکەن کەسێك دژی سیاسەتی ئەمریکا بجووڵێتەوەو لەوەش زیاتر لەگەڵ یەکیەتی سۆڤێتی دۆستایەتی بکا لەقامووسی ئەواندا سزای هەر کوشتنەو بەپێی هەڵوێستی شەخسی حەمەرەزاشا کە لە هەموو کەس زیاتر ئینتیزاری هەبوو قازی محەمەد ئیعدام بکرێ، بریاری دوایی دراو شا حوکمی ئیعدامی ئیمزا کردو بۆ سەرتیپ هومایوونی نارد کە ئەوکاتە بۆ بەرێوەبردنی شەری لەشکری ئێران دژی بارزانییەکان لە ورمێ بوو. ئەمری بەرێوەچوونی حوکمی ئیعدام رۆژی 9ی خاکەلێوە(29ی مارس) گەیشتە دەستی هومایوونی ئەویش بە بێ سیم بە مەهابادی راگەیاندو لەسەر ئەو ئەمرە رۆژی 15ی خاکەلێوەی1327 بەو شێوەیە کە باسمان کرد پێشەوا قازی محەمەد وبراکەی ئەبولقاسمی سەدری قازی و ئامۆزاکەی محەمەد حوسێنی سەیف قازی لە مەیدانی چوارچرای شاری مەهاباد لە سێدارە دران، لەومەیدانە کە رۆژی2ی رێبەندانی 1327 (22ی ژانویەی1947) دامەزرانی کۆماری کوردستانی تێدا راگەیاندرا بوو و قازی محەمەد بە سەرکۆمار هەڵبژێرابوو.

(شەخسییەتی قازی محەمەد پێویستی بەلێکۆڵینەوەی زیاتر هەیە، ئەو شەخسییەتە مەزنە لە مێژووی گەلی کورددا پلەو مەقامێکی تایبەتی و بەرزی هەیە کەپێویستە لاوانی تازەپێگەیشتوو لەگەڵی ئاشنا بن و لەژیانی دەرس وەربگرن، هەرچەند تەمەنی زۆر درێژ نەبوو پێشەوا قازی محەمەد رووناکبیرێکی هەڵکەوتوو بوو کە لەورۆژگارەدا وێنەی لە نێو نەتەوەی کورددا زۆرکەم بەدی دەکرا.

قازی محەمەد لە شارستانیەت و زانستی تازە و هەروەها لە وەزع و رووداوەکانی جیهان بە تەواوی شارەزا بوو، زمانی تورکی و فارسی و ئینگلیسی و عەرەبی و فەرەنسی و رووسی دەزانی، لە زانستەکانی ئایینی و کۆمەڵایەتیدا دەستێکی باڵای هەبوو لەگەڵ ئەوە کە رووناکبیرێکی پایەبەرز بوو لە نێو خەڵکێکی ساویلکەو بەداخەوە بەشی زۆری نەخوێندەواردا دەژیا، گوڵێك بوو لە سەحرا روابوو بەڵام دیسانەکە لەگەڵ خۆی نیزیکبوو، دەردوئازار و هیوا و ئاواتەکانی زۆرباش تێ گەیشتبوو لە هێنانەگۆرو دەرخستنی ئەو دەردو ئازار وهیوا و ئاواتانەدا لە هەمووکەس سەرکەوتووتر بوو، بە خۆرایی نەبوو کە لای خەڵکی کوردستان ئەوەندە خۆشەویست بوو کە بۆ یەکەم جار لە مێژووی خۆیدا خەڵك خۆی ناز ناوی "پێشەوا"ی پێ دابوو، پێشەوا قازی هەموو زانست و تێگەیشتنی خۆی بۆ خزمەتی گەل تەرخان کردبوو، لەهەمووکەس باشتر دەیزانی وڵاتەکەی چەندە دواکەوتووە و گەلە خۆشەویستەکەی چەندە بێخاوەنەو هاونیشتمانەکانی لە چ وەزعێکی نالەبار و لەنێو چ کوێرەوەری و هەژاری و ئازار و ئەشکەنجەیەکدا دەژین.

هەموو ئەو تایبەتمەندییانە ببون بە هۆی ئەوەکە قازی محەمەد نرخێکی زۆر گرینگ لە جووڵانەوەی دیموکراتی ساڵەکانی1325-1324(1945-1947)دا باری بکا، شەخسییەتی ئەو رێز و حورمەتێکی تایبەتی بۆ لای ئەو راکێشابوو. قسەکانی قازی ئیعتیبارێکی تایبەتی یان هەبوو و نەزەری ئەو بەراست و دروست دەزانرا.

پێشەوا قازی زۆر تێدەکۆشا ریزەکانی نێو خەڵکی کوردستان یەکگرتوو بکا، ئەو راستییە مێژووییەی لەبەرچاو بوو کە یەکێك لە هۆیەکانی ئەساسی تێکشکانی هەموو راپەرینەکانی پێشووی گەلی کورد، نەبوونی یەکیەتی ویەك دەنگی نێو خۆیی بوە، پێشەوا قازی زۆری هەوڵدا ناکۆکی لە نێوان عەشیرەتەکان هەڵبگرێ، هەر چەند ئەوە کارێکی هاسان نەبوو بەڵام ئارادەیەکی زۆر سەرکەوت.

لە شاری مەهاباد یەکێتییەکی بێوێنەی لە نێو هەموو دانیشتواندا پێك هێنابوو، تەنانەت پاش تێك شکانی جووڵانەوەش، پاش هاتنی لەشکری کۆنەپەرستی ئێرانیش کەس کەیف خۆشی و شادمانی دەرنەبری، کەس ئامادە نەبوو دەست بۆ رێبەرانی کۆماری کوردستان درێژ بکا.

پاش شەهیدبوونی، زۆر رەخنە لە پێشەوا قازی گیراوە رەخنەکان یەکودوو نین، بەڵام لە هەمووان گرینگ تر ئەوەیە کە بۆچی بەرامبەر بە پەلاماری کۆنەپەرستی ئێران رانەوەستاو وبەربەرەکانی نەکرد؟ هێندێك کەس نەزەریان ئەوەیە کە ئەگەر راوەستابا وبەربەرەکانی کردبا وەزع بە تەواوی دەگۆرا.

(راستە کە پێشەوا قازی نەدەبا بەو هاسانی یە خۆی تەسلیمی دوژمن بکا، ئەویش دوژمنێك کە ئەو زۆر باش دەیزانی چەند فێڵباز ودرەندەیە، بەڵام قازی محەمەد ئەو کارەی بۆ پاراستنی گیانی خۆی نەکرد، بەڵکوو ئەو مەسئوولییەتە گەورەیە کە سەبارەت بە گەلی کورد هەیبوو پێشەوا بۆ ئەو کارە هاندا راستی ئەوەیە کە پاش لێکدانەوەیەکی زۆر کە پێشتریش باسی کرا، پێشەوا قازی هیچ دەرەتانێکی لە بەربەرەکانیدا نەدەدی نەشی دەویست خوێنی خەڵکی بێ دیفاعی کورد بە دەست لە شکری داگیرکەر بڕژێ ئەگەر بڵێین تەسلیم بوونی قازی محەمەد هەڵە بوو، ئەو هەڵەیە لە پێش هەمووواندا بە نرخی گیانی خۆی تەواوبوو، ئەو کەسانەکە پێشەوا قازیان، ناسیوە و ئاگایان لەرابردوو و ژیانی بوە دەیان زانی کە پێشەوا دڵخوازانە خۆی تووشی ئەو هەڵەیەکرد، ئینسان دۆستی ئەو هێندە زۆر بوو کە دەی هەویست بکوژرێ، شەهیدبێ تا زۆرکەسی دیکە زیندوو بمێنن.

چەند رۆژ پاش ئیعدامی پێشەوا قازی و هاورێکانی، چوارکەس لە باشترین ئەفسەرەکانی هێزی پێشمەرگەی کۆماری کوردستان: "عەبدوڵا ی رەوشەن فیکر"، "حامیدی مازووجی"، محەمەدی نازمی "ومحەمەد رەسوولی نەغەدەیان" لە مەهاباد و هەروەها"عەلی بەگی شیرزاد" فەرماندەی هێزی بۆکان لە شاری بۆکان لە سێدارە دران دوو حەوتوو پێش ئیعدامی پێشەواو هاورێیانی لە26ی مانگی رەشەمەی ساڵی1325(17ی مارسی1947)دا یازدە کەس لە سەرۆك عەشیرەکانی فەیزوڵا بەگی و گەورکی سەقز کە لە کۆماری کوردستاندا چالاکانە بەشدارییان کردبوو، لە شاری سەقز لە سێدارە دران کە بریتی بوون لە: ئەحمەد خانی فاروقی(سالار)، عەولاخانی مەتین، حەمەخانی دانیشوەر، عەلی خانی فاتح، حەسەن خانی کانی نیاز، حەمەدبەگی باباخان بەگ، ئەحمەد جانی شەجیعی (شەنگە)، شێخ ئەمین ئەسعەدی کەس نەزانێ، ئاغا سەدیقی ئەسعەدی بازی بلاغی، عەلی ئاغای جوانمەردی تەموتەو رەسوولێ، ئاغای مەحموودی میرەدێ.

بیرورای سەرانی لەشکری شا لەو کاتەدا ئەوە بوو کە دەبێ هێندێك لە سەرۆك عەشیرەتەکانیش ئیعدام بکرێن بۆ ئەوەی ئەوانی تر بترسێن و تەسلیمی سیاسەتی دەوڵەتی مەرکەزی بن، بەراستیش حەق بڵێین سەرانی ئەرتەش باشترین کەسانیان بۆ ئیعدام کردن هەڵبژارد چونکە سەرۆك عەشیرەتەکانی فەیزوڵابەگی و گەورکی سەقز لە وەفادارترین پشتیوانانی کۆماری کوردستان بوون.

بەم جۆرە رژێمی کۆنەپەرستی تاران باشترین کاربەدەستانی کۆماری کوردستانی شەهید کرد، لەو 28 کەسانەی کە لەمەهاباد دادگایی کران بەشێکیان بەزیندانی ئەبەد، بەشێکیان بە 15ساڵ و هێندێکیان بە زیندانی 2تا 15ساڵ حوکم دران، زۆرکەسیش لە کاربەدەستانی کۆماری کوردستان دوای گەیشتنی ئەرتەش بە مەهاباد رایان کرد و زۆربەیان چوون بۆ عیراق و سووریە.

لەشکری ئێران دەستی بە لە نێوبردنی هەموو شوێنەواری کۆماری کوردستان لە مەهاباد کرد، کتێبە کوردییەکان بە ئاشکرا لە مەیدانی شار سووتێندران، بەڵگەکانی زەمانی کۆماری کوردستان یا پێشتر خەڵك لە ترسان سووتاندبوویانن و یا پاشان لەشکری شا لە بەینی بردن، تەواوی هەوڵ و تەقەلای دەوڵەتی مەرکەزی ئەوە بوو کە هیچ شوێنەوارێك لە کۆماری کوردستان نەمێنێ.







## سەرچاوە

چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادیدا، د. عبدالرحمن قاسملو، ل118-128

# لەسەرکۆمارییەوە بۆ ناو زیندانی داگیرکەر

مەحمود مەلا عززەت




ئەو هۆو گیروگرفت و کۆسپانەی کۆمارەکەی کوردستانیان رووخاند زۆربوون، باسکردن و چوونە ناو درێژەی رووداوەکان لەبەشێکی تردا دەخوێنینەوە، لێرەشدا بەمەبەستی وێنەگیرییەکی روونی سەردەمەکە، بەچڕی، ئاماژە بۆ هۆ گرنگەکان دەکەین، تا جگە لەمەسەلەی رووخاندنەکە، لەدیاردەیەکی تری زۆر هەستیار بلەین، کە خۆبەدەستەوەدانی سەرکۆماری کوردستان پێشەوا قازی محەممەد بوو، ئەمەش خۆی لەخۆیدا بەهۆیەکی تری رووخاندنەکە دادەنرێ، زیاتر لەوە بۆ تێگەیشتن لەتەواوی دیاردەکە، دەشبێ لەبیروبۆچوون، هەڵوێست و هەست و نەست، بیروباوەڕو بۆچوونەکان و ئاکارە گرنگەکانی قازی محەممەد و شەخسیەتی شارەزابین، وەک هەندێکی لەپێشەوە دەرخرا، بۆ تەواوکردنی مەبەستەکانی دروستکردنی وێنەیەکی نزیک لەواقیعی سەردەمەکە، لەگەڵ هۆکارەکانی رووخاندن، دەبێ لەو رووداو و کێشەو ئەو گرفتانەی لەڕۆژانی پێش رووخاندن، بەتایبەتی لەدوای رووخانی ئازەربایجان سەریانهەڵدا بگەین و شارەزایان بین بە تایبەتی لە:

-. ناکاملیی هەلومەرجی دامەزراندنی کۆمارو ناڕەسیویی زەمینەکەی.

-. کێشەو گرێ و گۆڵی ناوخۆ، گیروگرفتە سەربازی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتورییەکان، لاوازیی هەستی نەتەوەیی و هۆشیاریی سیاسی... هتد

-. فرە دوژمن، جیاوازیی نێوان توانای ئابووری و سەربازی کۆمار و بەرامبەرەکەی، رۆڵی خراپی زلهێزەکان لە یارمەتیدانی رژێمی شاو رۆڵی ناحەزو دوژمنانەی ئەمەریکا و ئینگلیزەکان.

-. نەبوونی دۆستی ستراتیجی.

-. رۆڵی خراپی یەکێتی سۆڤێتی، بەتایبەتی دوای مۆرکردنی پەیمانی نەوت لەگەڵ تاراندا(1)

-. کشانەوەی لەشکری سوور بێ ئەوەی لایەنی کەمی یارمەتی کۆمار بدات، تەنانەت ئەو تۆپانەی درابوون بەکۆماری ئازەربایجان وەرگیرانەوە، دەگوترێ کە ئامۆژگاری هەردوو کۆمار کرا کەرێگە لەئەرتەش نەگرن... هەڵوێستەکە وا نیشان درا کە سۆڤیەت یارییەکەی تەواوبوو، بۆیە بەرژەوەندی هەردوو کۆمارەکەی خستە لاوە، چونکە ئیتر پێویستی بەگوشار خستنەسەر تاران نەما زیاتر لەوانە:

لە11ی دیسامبەری1946دا ئازەربایجان رووخا، رووخانێکی کتوپڕی وا کە بوو بە بوومەلەرزەیەکی گەورەی سیاسی رووخێنەر، سەرانی کۆمارەکە هەڵهاتن، خەڵکی تەوریز و دەوروبەری کەوتنە بەردەم هێرشی ئەرتەشو شەڕوئاژاوەو کوشتن و بڕین و تاڵانی و تۆڵەسەندن هەموو شوێنێکی کۆماری ئازەربایجانی گرتەوە رووداوەکان زۆر قەبەتردەکران و دەگەیشتنەوە مەهاباد، ئەوانەش زیاتر لێپرسراوانی کوردی دەخستە بەردەم بیرکردنەوە لەهەمان دیاردە و هەڕەشە.

ئەو رووخاندنە، بەو ئاسانییە، کۆماری کوردستانی خستەناو بازنەیەکی بێ دەربازگە.

دەڵێن هاشموڤ ئاگاداری نمایندانی کوردی کردووە کەهێزێکی بچووکی ئەرتەش بۆ سەرپەرشتی هەڵبژاردنی مەجلس دێت و پاشان دەگەڕێتەوە.. رەنگە ئەمەش هەر لە هەمان هەڵوێستی رووسەکانەوە بووبێ کە کاتی خۆی پاش هێرشەکەی رەزمئارا بەهێزێکی زۆرەوە بۆ سەر بەرزاییەکانی مامەشا کەهێزێکی زۆر بچووکی کۆماری لێ بوو و سەرنجام بەسەرکەوتنی رەزمئارا کۆتایی هات، ئیتر لێپرسراوانی سەربازی کۆمار کەوتە سەر دانانی نەخشەی پێشکەوتن تابتوانن سنەش رزگار بکەن... بەڵام هاشموڤ، کۆنسوڵی سۆڤیەتی لەورمێ، لەدێی سەرا چاوی بەپێشەوا کەوت و ئاگاداری کرد کەهێرش نەکرێتە سەر ئەرتەش چونکە رەنگە شەڕی گەورە دروست ببێت و ئەوانیش ناتوانن کۆمەکی کۆمار بکەن....(2)

دوای رووخانی کۆماری ئازەربایجانیش:

. ئەو تیرەو هۆزە کوردانەی هەر لەگەڵ رژێمدا بوون کەوتنە جموجۆڵ و هەڕەشە.

. هەر زوو پێش ئەم رووداوانە، بەهۆی ناکۆکی خێڵەکی و ناڕەزایی لە سیاسەتی گفتوگۆ وەک لە بەڵگەنامەکاندا دەردەکەوێ، جەنراڵ حەمە رەشیدخان کۆماری بەجێهێشت و چووە عێراقەوە.

. جەنراڵ عومەرخانی شەریفی، سەرۆکی ئێلی شکاک، خۆی لە کێوەکانی "زیندەشت" گۆشەگیر کردبوو.

. زۆر سەرەک خێڵیتر چاویان لەوکردو دانیشتن.

. هەندێکی تر کەوتنە هاوکاریی ئەرتەش و ئامادەبوون بۆ هێرش بردنەسەر دیموکرات.

. سەرلەشکر (همایونی) هێزێکی لەمەنگوڕ و مامەش و دیبوکری کەبەشێکیان هەر لەسەرەتاوە لەگەڵ تاران بوون، ئامادەو پڕ چەک کرد.

هەر دوای کۆبوونەوەکەی مزگەوتی عەباس ئاغا کەتیایا بڕیاری دامەزراندنی شورای بەرگری و بەرەنگارکردنی ئەرتەش درا:

. میرزا ڕەحمەتی شافعی، شێخ حەسەنی ئەمسی بورهان، عەلی ئاغای ئەمیر عەشایەری و هی تریش خۆیاندا بەدەست ئەرتەشەوە.

. مەلا عەبدوڵڵای مودەڕیسی و مەلا حوسەینی مەجدی کەوتنە بڵاوکردنەوەی بەندو باوی بێسوودی بەربەرەکانی و شەڕی ئەرتەش.

. هەندێ لەدەوڵەمەندو مەلای مزگەوتی مەهاباد وەلایان بۆ ئەرتەش برد.

بەو جۆرە شڵەژاوی و ئاژاوە، بڕوا بەخۆ نەمان، هەوڵی خۆڕزگار کردن بڵاودەبوونەوە، "ئەبولحەسەنی تەفرەشیانی" لایەکی ئەو تراجیدیاو سەرلێشێواویەی ڕووبەڕووی کۆمار و پێشەوا ببووەوە بەم جۆرە دەگێڕێتەوە، ئەو دەڵێ: کاتێ نامەیەکی سەرهەنگ عزت، سەرۆکی ستادی مەلا مستەفا بەدەستم گەیشت (مەبەستی عزت عەبدولعەزیزە) کە هەواڵی ڕاکردنی پیشەوەری پێدەگەیەنی دەچێت بۆ لای تا پرسیاری ڕووداوەکانی لێ بکات...

ئەو پێی گوتم: ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ڕێبەرانی فیرقەی دیموکرات هەموویان هەڵاتوون و ئیتر شتێك بەناوی فیرقەوە نەماوە... ئەرتەشی ئێرانیش هەر لەو دوو سێ ڕۆژانەدا تەواوی ئازەربایجان داگیر دەکا، جا ئێستا خۆتان بڕیار بدەن! خێڵی بارزانی لێرە ماڵ ی کی نییە کەبەرگری لێبکا، ئێمە لە ڕاستیدا لەهەوادا ماوینەوە، ئێوەش ئێستا وەزعێکی ئاواتان هەیە ناتوانن خۆتان بگەیێننە تەورێز، دژ شۆڕش لەڕێگادا هەر نەبێ بۆ وەرگرتنی چەکەکەنتان ئێوە وەبەر گوللە دەدا، ئەگەر بە سەلامەتیش بگەنە تەورێز لەوێ ڕوون نییە چ‌یتان بەسەردێ، تەنیا ئەرکی ئێوەو ئێمە لە کاتی ئێستاش پاراستنی گیانی خۆمانەو جا بۆ خۆتان بڕیار بدەن بزانن چ دەکەن، ئێمە بەرەو مەهاباد پاشەکشە دەکەین ئەگەر ئێوەش پێتان خۆشە لەگەڵ ئێمە وەرن... هتد

ئەوەی ناوبراو بە سێ ڕۆژ دەگاتەوە مەهاباد و لەوێ ویستوویەتی پێشەوا ببینێ، پێیان گوتوە کەچوە بۆ میاندواو تا پێشوازی لە ئەرتەش بکات، ئینجا سەیفی قازی دەبینێ و دەڵێ: ئەو گوتی: ئێمە بۆ خۆشمان نازانین چ کارەین، بەڵام بەبیروباوەڕی من مانەوەی ئێوە لەمەهاباد مەسڵەحەت نییە، چونکە هەردەم لەوانەیە ئەرتەش بێتە مەهابادەوە"(3)

## زیاتر لەوانە:

لە15 دیسامبەر ئەسەدۆف نمایندەی بازرگانی ڕووسەکان، مەهاباد بەجێ دەهێڵێ و خۆی دەگەیەنێتە ورمێ.

سەرهەنگ غەفاری، هەر ڕۆژێك دوای هەرەسی ئازەربایجان بەهێزێکەوە دەگاتە بۆکان، عەشایەری ناوچەکە کەوتە پەیوەندی و ئامادەبوونی خزمەت بۆ ڕژێم..

هێمنی شاعیر لەباسی ڕۆژگارەکەدا دەڵێ:

لەو ماوەیەدا من هەمیشە لەگەڵ پێشەوا بووم، دیارە لەگەڵی نەچوومە حەمامیان" بەڵام لە شاری بەجێم نەهێشت دەمدیت پەشۆکا بوو بەڵام نەك لەترسان، بەڵکوو لەداخان، لەبەر ناهومێدی....(4)

ئیتر بارودۆخەکە بەو جۆرە شڵەقا بو، ڕووخاندن لە ئارادابوو، بێهیوایی، ترسی گەڕانەوەی ئەرتەش و ترسیی کوشتن و بڕین، هەڕەشەی عەشایەر و تاڵانی و تۆڵەسەندن، ڕووداوەکانی تەوریزو دەورووبەری... هەمووساتێك لەبەرچاودا لەبیرو کردارو چاوەڕوانیدا هۆش و گۆشی داگیرکردبوون کورت و پوخت قاسملو واتەنی:

"پێشەوا هیچ هیوایەکی بەتێکۆشان یا یارمەتی هێزە دیموکراتیەکانی ئێران نەمابوو... پێشەوا قازی هاتبووە سەر ئەو بڕوایە کەکۆماری کوردستان توانای بەربەرەکانی بەرامبەر بەدەوڵەتی مەرکەزی نییە، بۆیە تەنیا مەبەستێکی کەپێشەوا قازی پەرۆشی بوو ڕزگارکردنی خەڵکی مەهابادو دانیشتوانی قەڵەمڕەوی کۆماری کوردستان لە کوشت و کوشتاربوو...

"لەناو ئەو مەترسییانەو ئەو بێهواییەدا، هیچ لەبەردەم پێشەوادا نەمابوو جێبەجێکردنی بەڵێنەکەی نەبێ، بۆیە لە16ی دیسامبەردا بەتەلەفۆن پەیوەندی لەگەڵ همایونی کرد، دوای تەلەفۆن لەگەڵ حاجی بابە شێخی سەرەك وەزیران و سەیفی قازی وەزیری جەنگ دەچنە حەمامیان و خۆیان دەدەن بەدەستەوە ئەرتەشەوە... دوای قسەکردنی لەگەڵ همایونی، پێیان دەڵێ کەبگەڕێنەوە مەهاباد، بەو جۆرە هەم کوردان هێمن دەکاتەوە و هەم مەترسی بارزانییەکان و ئەو عەشایەرانەی تا ئەو کاتە ملیان بۆ ئەرتەش نەدابوو، دوور دەخاتەوە.

کە پێشەوا دەگەڕێتەوە مەهاباد، بارزانی خۆی دەگەیەنێتێ و چاوی پێی دەکەوێ، تا وای لێبکات مەهاباد چۆڵ بکات و خۆی نەدات بەدەستەوە، هەمان ئەو قسەیەی کەلەو چەند ڕۆژەدا دەیگوت و هەر وەك بەهەندێ لەسەرکردەکانی حیزبیشی گوتبو، کاتێ باسی پاشەکشە بۆ سۆڤیەت یا بۆ عێراقی لەگەڵ دەکەن، دەڵێ:

دەزانم ژیانم دەکەوێتە مەترسییەوە بەڵام قەیدی نییە، خەڵك بەجێ ناهێڵم.. لە باسی ژیانیشیدا، باسی ئەوەکرا بو کە پێشەوا پاش هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، بڕیاری خۆی ئەدا، ئیتر دوای ئەوە نەیدەگۆڕی" ئەو بڕیارەش ئاسایی نەبوو لەدایکبووی ئەو ساتە نەبوو، بۆیە دەبوو خۆشی لەپێناودا دابنێ تەنانەت هەروەك کوڕی ڕەش لە زمانی"مینا خانمی" دایکیەوە دەگێڕێتەوە کەلەڕۆژانی کۆتاییدا:

. دەوڵەتی شورەوی وتی ئامادەن هەتا گەسکی ماڵیشت بۆ هەڵگرین و هەموو شتێکت بۆبار بکەین.

. قونسوڵی ئینگلیز لە تەوریز داوای کرد بێتە عێراق و لەڕێی عیراقەوە بچێتە ئینگلستان.

. ئەمەریکای یەکانیش چاویان بە قازی محەمەد کەوتبو، داوایان لێکردبوو ببێتە پەنابەر لەدەرەوە. (6)

بەڵام هیچیانی قەبووڵ نەکرد لەڕاستیدا لۆجیکی رەوتی رووداوەکان نیشانەی پرسیار لەبەردەم ئەو سێ هەڵوێستەی ئەو سێ زلهێزە دادەنێت ئەگەر راست بن.

بەم جۆرە دواڕۆژی کۆماری- رۆژی کارەساتی نەتەوایەتی ورمانی کۆمار هاتەبەردەم.

ئەوەبوو لە رۆژی 17ی دیسامبەری 1946دا دوای ئەوەی سەرەک کۆمار و دەستەیەک لەبەر پرسیاران و هاوبەشانی کۆمار لە"کوکتەپە" پێشوازی ئەرتەشی رژێمی تارانیان کرد، لەو رۆژەدا جارێکی تر عەجەم مەهابادی داگیرکردەوە و کۆتایی بەسەردەمێکی کورتی ئازادی، بەڵام نەمرو هەمیشە لەیادا، هێنا. سیمبولی ئازادیو سەربەخۆیی کورد بەدەستی دوژمن هەرەسی پێهێنرا، نەک "ئاشبەتاڵ" وەک هەندێ لەنووسەرانی کورد وای ناو لێدەنێن.

چونکە بەکارهێنانی "زاراوەیەکی واڵە تراجیدیا و کارەساتێکی نەتەوایەتی وا گەورە، رەنگە هەر درشتیی بیرکردنەوە یا دژەکرداری لەدەستچوونەکەی کۆمار و، مەزنەی ئەگەر پێشەوا خۆی بەدەستەوە نەدایە ئەوا رەنگ بوو رووداوەکان رەوتیان بەجۆرێکی تر بکردایەو، وەبوویێ، ئەگینا لە پرۆسەیەکی مێژوویی وا مەزن و نەمردا، دەبێ: "ئاشەوان، ئاش، باراش، خاوەنباراش کێن ئەگەر هەر ناوێک لەگەڵ سەرکردە، شۆڕش، جەماوەر وپێشمەرگەو شەهیدان وە ئامانج و دروشمەکان جووت بکرێت، وا دەزانرێ چی سووکایەتییەک دەبێ بۆ ئەو ناوە پیرۆزانە، تەنانەت ئەگەر دوژمنەکە یا دۆستە دوژمنەکەش بخرێتە سەریان وا دیسان هیچ لەمەسەلە ناگۆڕێ، دیارە ئەمەش بۆ خۆی باسێکی گرنگەو لێرەدا مەودای ئەوە نییە درێژەی پێبدرێ.

## پێشەوای گەل لەبەردەم مەحکەمەی "بدوی سحرایی"دا

دوای داگیرکردنەوەی مەهاباد، ئەرتەش کەوتە سەروکاری سڕینەوەی شوێنەواری کۆمار، ئەفسەران زۆر بەپەلە بوون بۆ گرتن و لەسێدارەدانی قازییەکان.

بۆیە همایونی و ئەفسەرانی بەرپرسیار لەناوچەکە کۆبوونەوەیەکیان کرد تیایا گەلێ بڕیاریاندا... لەوانە:

-. راونانی بارزانییەکان.

-. چەککردنی هەموو عەشایر.

-. گرتنی ئاژاوەچی و موتەجاسرین.

هەرچەند شای ئێران لێبووردنی گشتی بڵاوکردەوە، بەڵام ئەوەی مەبەستیان بوو ایە نەیدەگرتەوە سەرتیپ"همایونی"یش وەک سیمبولی رژێمی تاران لە مێژووی شکاندنی گفت و بەڵێن و پەیمان، هەر بەوەوە نەوەستا"تەئمینی جانی"یەکەی خۆی باسی کردبوو: "بەرلەوەی قازی محەمەدو سەرانی تری حکومەتی کوردستان بچن بۆ لای گفتی(تەئمینی جانی) پێدابوون بخاتە ناو تورەکەی بێبەڵێنی و شکاندنی پەیمان، لە21ی دیسامبەردا پێشەواو سەیفی قازی و دەیان تێکۆشەر و لەدواییشدا، گەیاندنەوەی سەدری قازی لە تارانەوە بۆ مەهاباد بەحەپسی، لەزیندان توندکران، دادگا سازکرا.

رایگەیاند کەهەر کەسە سکاڵاو بەڵگەی لەدژی بەندییەکان هەیە رایگەیەنێ"

بەڵام"رووداوەکان رەوتی خۆیان بەهێمنی پێوا، هیچ کارەسات و دژەکردەوەیەکی لەم چەشنە نەقەوما."

(دیارە کە مەبەستی لەرووداوەکانی ئازەربایجانە) مەحکەمەی بدوی سحرایی بەسەرۆکایەتی (سەرهەنگ پارس تبار) و دادوەری گشتی (سەرهەنگ فیوزی) دەستی بەکاری خۆی کرد. "تاوانەکان" زۆر بوون: دامەزراندنی جەمهوریەت و بوونە سەرۆکی، بەرزکردنەوەی ئاڵای سێ رەنگی کوردستان، بەرگی جەنراڵی پۆشین، گۆڕینی ئاڵای ئێران و لابردنی نیشانی شێرو خورشید، کوشتنی ئەفسەروسەربازانی ئەرتەش، کۆبوونەوەو قسەکردن لەگەڵ بێگانەو چوونە باکۆ، بەڵێنی ئیمتیازی نەوت بەرووسەکان... هتد.

بەڵگەش سەرجەمی رۆژنامەو بڵاوکراوەو وتارو دیدەنی و ئەو نامەو وێنانە بوون کە کەوتبوونە دەستیان.

پێشەوا قازی محەممەد هەر زوو روونی کردەوە کەئەم دادگایە نایاساییەو دەسەڵاتی ئەوەی نییە موحاکەمەیان بکات، چونکە سەربازییە و ئەمان سڤیلن، لەرووی"پارێزەر" و"ماوە" نایاساین، بەڵام گوێ لەو قسانە نەگیرا.. نەخشەیەو دانراوە... مەحکەمەی بدوی سحرایی دەبێ حوکمی خۆی بە سەر قازییەکاندا بدات، ئیتر یاساو بەرگری و پارێزەر رۆڵیان نامێنێ بۆیە لە23ی جانیوەری1947دا بڕیاری لە سێدارەدانی هەر سێ سەرکردەکەی کورد درا.

بەئومێدی ئەوەی لەتاران موحاکەمە بکرێنەوە، داوای چاوپیاخشاندنەوەو دادگای "تەمیز"یان کرد، چونکە پێشەواو هاورێکانی وایان مەزنە کردبوو کە ئەگەر لەوێ بدرێنە مەحکەمە لە ئیعدام رزگاردەبن.

مەحکەمەی تەمیزی سەربازی بەسەرۆکایەتی (سەرهەنگ عطائی)و دادوەری گشتی (سرهنگ نکوزاد)و پارێزەران: (ملازم صلح جو) و(ملازم نبوی) لە28ی مارسی ئەو ساڵەدا دەستی کرد بەمەحکەمەکردنەوەی پێشەواو هاورێکانی. دادوەری گشتی "تاوانەکانی خوێندەوە، هەمان کۆنەکان و"تاوان"ی نوێش: راپەڕینی چەکدارانەی دژ بەدەوڵەتی مەرکەزی، بەسووکی روانینە حکومەتی مەرکەزی، سووتاندنی ماڵی فەرمانبەرانی دەوڵەت.

## پێشەوا لەدوو مەحکەمەدا

پێشەوا بەرامبەر تاوانەکان ئازاو لێزانانە لە هەردوو جارەکەدا بەرگری لە خۆی و هاورێکانی کرد، چەندین سەعات لەسەر قسە بەردەوام بوو: "گوتبووی سەرچاوە و وەرۆحهێنەری ئەمن لەم کارە، نیشتمان و

نەتەوەکەم بووە. هەرچییەکی ئەتانەوێ لەگەڵ مندا بیکەن، بەڵام نەتەوەکەم ئازار مەدەن لەو کاتانەشا هەوڵی ئازادکردنی زیندانییەکانی تری داوە: "کاتێ کە چووم بۆ سەردانی پێشەوا کە سەرهەنگ(پارسی تباری) دێت پێی دەڵێت: "بۆ ئەو خەڵکە لە خۆڕاگیراوە، ئەوانە هیچیان نەکردووە ئەگەر کەسێك هەبێ مەسئول و بەرپرس بێ هەر منم."

چیرۆکی مەحاکەمەکردنی پێشەواو هەردوو هاورێکەی هەرچەندە کورت و بەچەند رۆژێ ئەنجام درا، بەڵام سەیرو مێژوویی و بێوێنە بووە. دەنگوباسەکانی لە ناو ئەرشیفەکانی ئەرتەشدا زیندانی کراون، کەمێکی لەسەر زاری ئەفسەرەکان وهەر ئەوەش کەئەوەی مەبەستیان بووە بڵاوکراوەتەوە، سەرچاوەیەکی تر، سەروان(پەروێزی و شەریفی)بوە کە خۆیان ئاگاداری ڕووداوەکانی مەحکەمەکە بوون.

ڕۆژێك سەروان شەریفی دەچێتە ماڵی خێزانی قازییەکان بەدڵپیسیەوە وتوویەتی: "حەیف بۆ قازی محەمەد، بۆ ئەو پیاوە مەزن و ژیرو زانایە، دوێنێ لە کاتی مەحکەمەدا بەبێ کاغەز 4 سەعات وتاریدا بەزانست و مەنتقی خۆیەوە هەمووانی حەیران کردبو... لە هەموو کەس باشتر قانوونەکانی ئێرانی دەزانی، لەهەموو کەسێك باشتر شارەزابوو لە وەزعی سیاسی ئێران و هەندەران.. لە ڕاستەقینەدا قازی بوو کە مەحکەمەی مەحاکەمە دەکرد... دەڵێن هەر لەسەر ئەوەش بوە ناوبراو لەئەرتەش دەرکراوە بەلێسەندنەوەی هەموو دەرەجەکانی"

دیسان(نجفقلی پسیان) و(سولیمان ح) وە ئەرشیفی سۆڤیەتی ڕووخاو(... کەمێ لەڕووداوو بەسەرهاتەکانی باس دەکەن و دەنووسن:" لە مەحکەمەدا قازی محەمەد پەلاماری بردە سەر سیاسەت و ئاکاری دەوڵەتی تاران و ئەیگوت من لەو قوژبنەی گرتوخانەوە دەنگی خۆم بەرز ئەکەمەوە لەدژی دەوڵەتی تاران و سەرۆکەکانی و ئەڵێم تاوانبار ئێوەن نەك ئێمە... ئێوەن کە وەڵاتتان لێداگیرکردوین و هێرشتان هێناوەتە سەرمان.

"لە جیاتی ئەمەی کە ئێوە بگیردرێن و مەحاکەمە بکرێن و، هاتون لە ماڵی خۆم ئەمنتان گرتووەو لە گرتوخانەتان هاویشتووم... تەواو ئەم بەسەرهاتەی کەڕوویداوە ئەنجامی سیاسەتی داگیرکەرانەی دەوڵەتە... ئەگەر دەوڵەت تەواوی کوردان بەخاین دەزانێ دەست لەو مەڵبەندە هەڵگرێ و ئەگەر بەنیشتمانپەروەریشیان حیساب دەکات بابهێڵن بۆ خۆیان کاروباری خۆیان بگرنە دەست خۆیانەوە."

قازی محەمەد لە تەواوی ڕێڕەوی مەحکەمەکەدا زۆر بەجەسارەت و نەترسی وسەربەرزی وتاری ئەداو جارێك نەدیترا سەری داخا و پەشیمانی لە کردەوەی خۆی بکات.

ئەو هەڵوێستانەو ئەو قسەلۆجیکی یاساییانە، مەحکەمەو سەرکردایەتیی ئەرتەشی نیگەران کردبوو، بەردەوام ئەفسەرانی لێپرسراو بەبێسیم لەگەڵ مەهاباددا بوون پەلەیان بوو لەدەرکردنی بڕیار وجێبەجێکردنی، لای ئەوان هەمووی دەزانرا، تەنها ئەو بۆیە یاسایەی گەرەك بوو، تالە 30 ی مارسدا حوکمەکە بەلەسێدارەدان جێگیرکرا هەر کەسەرانی ئەرتەش بڕیارەکەیان پێگەیشت، بەپەلە ئاگاداری مەهابادیان کرد کەلەماوەی24سەعاتدا بڕیارەکە جێبەجێ بکەن، چونکە زۆری پێنەدەویست لەسەر بڕیاری"اعلی حزرت" شای ئێران بوەستن.

## ساتەکانی نێوان بڕیارو جێبەجێکردن

"بێگومانە موحاکەمەکردنی سەرکردەکانی جەمهوورییەتی کوردستان سەرنج ڕاکێشەرترین و نامۆترین موحاکەمەی سیاسی بوو کە لەمێژووی نوێی ئێراندا بێوێنە بووە"

"جعفر مهدی نیا"ی تاراندۆست بەو جۆرە پێناسەی موحاکەمەکەی پێشەواو هاورێکانی دەکا.

لەڕاستیشدا، ساتەکانی نێوان بڕیارو جێبەجێکردن، خودی جێبەجێکردنەکە، پڕبوون لەڕووداوی سەرنجڕاکێشەرو دەگمەن، بگرە نامۆتر لە موحاکەمەکە، هیچ گومانیشی تێدانەبوو کەخوڵقێنەری ئەوانە، هەردوو لای سەر شانۆ سیاسییەکە بوون لای یەکەم: پێشەواو هاورێکانی کەلەمەڵبەندی نیشتمان و نەتەوەپەروەری ویژدان و یاساو داوەری، خاوەن گفت و بەڵێن و ڕاستگۆیی، ئارام و ئاساییش و ئازادیخواز، مرۆڤدۆست و زوڵملێکراو، نیشتمان و ماف زەوتکراوەوە ڕەفتاریان دەکرد.

لای دووەمیش: ڕژێمی تاران و سەرانی، کەتەواو بەپێچەوانەوە بوون.

باڵێرەدا، کورت و پوخت، چەند نموونەیەك لەو ڕاستییانە بخەینە پێش چاو:

ڕۆژنامەی"جهان پاك" دوای بڵاوبوونەوەی بڕیارەکە نووسیبووی: "قازی محمد و سیفی قازی و صدری قازی کە بەاعدام محکوم کران (اعلی حزرت) بۆ دڵ نەوایی کوردەکان عفوی کردبوون."

ئەو درۆیەی ڕۆژنامەکە سەرچاوەکەی سەرەك وەزیران و شای ئێران بوو کاتێ سەدری قازی پێش گرتنەکەی خۆی دەگەیەنێتە تاران، تا قوام ببینێ بەڵکە بەڵێن و وادەکانی وەبیربێت. هەموو داواکەی دێتە سەر ئەوە کەکارێ بکات بەڵکو نەنێردرێتەوە مەهاباد، چونکە لەوێ ئیعدام دەکرێ.

قوامیش دەڵێ: "دەزانیت کە گوشاری سەربازەکان زۆرە، ئەگەر تۆ نەچیتەوە مەهاباد وا خراپ تێدەگەن کە من پە یوەندیم بەفیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانەوە هەیە، باشترایە تۆ بگەڕێیتەوە مەهاباد تا منیش لێرە بەکاری ئازادکردنی ئێوە هەستم" ئەوە لە کاتێکدا سەرەك وەزیران دەیزانی چی دەکرێ و چۆن ڕووداوەکان دەخوڵقێنرێن، هەر خۆشی دەیزانی لەو ساتانەشدا چاوەڕوانیان دەکرد کەسەدر بێتە دەرێ وبیگرن.

با لەسەرەك وەزیرانەوە بچینە لای شاو بزانین ئەم چۆن گفت و بەڵێنی خۆی دەخاتە ناو توورەکە مێژووییەکەی ئەو نەریتە نەفرەتلێکراوەوە.

ئارچی رۆژڤیلت ئەفسەری موخابەرات لەسەفارەتی ئەمریکا لەتاران لەبیرەوەرییەکانی خۆیدا دەنووسێ:

"چارەنووسی قازی محەمەد زۆری نەخایاند هەرسێك قازییەکان لەمەهاباد، لە 23ی جانوەری، لە مەحکەمەیەکی عەسکەری ئاشکرادا محاکەمە کران و حوکمی ئیعدامیان درا لەگەڵ ئەوەشدا، جێبەجێکردنی حوکمەکان لەلایەن تارانەوە دواخرا، لەبەرئەوەی کە پێخۆش نەبون لەڕاستەی جەنگەی وتووێژی ناسك لەتەك شوورەوییەکاندا لەمپەرو تەگەرەی بێتە سەر ڕێ، ئەو درێژە بەقسەکانی ئەدات: ماوەیەکی کورت بەرلەوەی لەفیبریوەری 1947دا تاران بەجێبهێڵم، ژنراڵ ڕەزمئارا چوو بوو بۆ مەهاباد، ئەمن وای بۆ چووم کەمەبەستی لەو سەفەرە بۆ چاودێریی ئیعدام کردنی برایانی قازی بێ، جا بۆیە ئەمن بەپەلە خۆم گەیاندە لای سەفیر" جورج ئالێن" بۆ ئەوەی بزانم ئەو لەم بارەیەوە چی لەدەست دێ.

جورج ئالێن پێی گوتم: "ئەتۆ بۆچی ئەوەندە بەتەنگ چارەنووسی قازییەکانەوەی؟ دەبێ لەبیرمان نەچێ کە ئەوان لەتەك شوورەوییەکاندا هاوکارییان دەکرد." ئەمن وەڵامم دایەوە : "ئەمە ڕاستە، بەڵام ئەوان لەبناوانەوە ناسیونالیست بون وە بۆ باشتر کردنی وەزعی گەلی خۆیان ئەوەی لەدەستیان بهاتبا دەیان کرد، ئەگەر ئەوان ئیعدام بکرێن، لەچاوی کوردە ناسیونالیستەکاندا لەهەموو شوێنێکدا ئێمە وەك بەشێك لەم درندەییە دادەنرێین."

"باشە، ئەتۆ دەڵێی ئەمن لەم بارەیەوە چی بکەم؟"

"من پێم وایە ئەتۆ دەبێ داوا لەشا بکەیت کەفەرمان بدا بە" ڕەزمئارا" بۆ ئەوەی قازییەکان بهێنرێن بۆ تاران و لە دادگایەکی عادیلانەو کراوەدا محاکەمە بکرێن."

لەسەر ویستی سەفیر، دەستبەجێ کاتی پێدرا کەچاوی بەخاوەن شکۆ حەمە ڕەزا شا بکەوێت، لەم دیدەنییەدا شا هیوای دەربڕی کەدادگا عەشیرەتییەکان باشتر بەڕێوە بچن، لەمانە محاکەمەی کوردەکان، پاشان ئاڵێن بەشای گوتبو، ئەگەرچی قازییەکان هاوکارییان لەگەڵ شوورەوییەکاندا کردووە، بەڵام ئەوان کارێکی زۆریشیان بۆ بەرەو پێشبردنی خوێندەواری وپەروەردە کردوە، شا قسەکەی پێ دەبڕێ و بەبزەیەکەوە دەڵێ:

"لەوە دەترسێی فەرمانی تیرباران کردنیان بدەم". "چ ترسی وات نەبێ ئەمن نایان کوژم."

لە31ی مارسدا قازییەکان لەشەبەقی بەیاندا بەفەرمانی"خاوەن شکۆ شاهەنشا" لەداردران.

مرۆڤ بەم ئاکامە دەگا کەلەوانەیە هەر دوای ئەوەی کەسەفیرەکەی ئێمە چۆتە دەرەوەو دەرگای لە سەر گاڵە دراوە، فەرمانی ئیعدام کردنی قازییەکانی ناردبێ.

## بەرەوسێدارەو وەسیەتنامەی پێشەوا

ڕووداوەکان بەو جۆرە گوزەریان پێدەکرا. کۆمار ڕووخێنرا، مەهاباد داگیرکرایەوە، ناوچەکە خرایەوە ناو زیندانە گەورەکە، پێشەواو سەدرو سەیف چاوەڕوانی ئەنجامدانی بڕیاری مەحکەمە دەکەن، نەیاندەزانی کەی و چۆن! جار جار تروسکایی هیوا وەك بروسکەیەك لەناو بیرە ژاکاوەکاندا گوزەری دەکرد، بیرو گیانیان شەکەتی ناو مەحکەمەو هەڵمەتی هۆش و لەش بوون لە دژەکرداری دەرپەڕاندنی ڕستەی"کوردی سەگ سیفەت" بەرووی پێشەوادا، جارێ مەرەکەبی بڕیار وشك نەبوو بوو نەیاندەزانی ئەو شەوەی 30ئازاری1947، هەر ئەو ڕۆژە، شەوەزەنگی ئەو ڕۆژە، دوا شەوی ژیانی دەبێت و بەرەبەیانی ڕۆژی 31ی ئەو مانگەدا، کاتێك خەڵکی مەهاباد لەشیرینەی خەودا دەبن ژیانی سەرکردەکانیان کۆتایی پێدەهێنن، لەپڕ بەو نیوەشەوە یەکێك خۆی کرد بەژووری زیندانەکەیاندا: خۆتان ئامادە بکەن چونکە دەوڵەت بڕیاری داوە بنێردرێن بۆ تاران، ئەم هەواڵە کە هەمیشە بیری داگیرکردبوون، بۆ ئەو ساتە وەك مژدەی سەرفرازی وابوو بۆ ئەوان کەوتنە ئەملاو ئەولای یەکتری ماچ کردن، داوایان کرد ڕێگەیان بدەن داوای پول بکەن بۆخەرجی، وەرام درانەوە کە دەوڵەت بەوە هەڵدەستێ.

پێشەوا ئامادەبوو، برایەدەرەوە، سواری لۆرییەکی پڕ لە چەکدار کرا، گوایا دەبرێ تا کەمە لێکۆڵینەوەو ڕێکخستنی پێویستی سەفەر سازبکرێ، لەبەر بینایەکی چەند دەرگا لە گۆشەیەکی چوارچرادا، دابەزێنرا بۆ خانووکە برا، ڕووەو ژوورێکی ڕووناك کە کرا بەژووردا ئیتر تێگەیشت کەلەدواساتیشدا درۆیان لەگەڵ کرا"مەلا صدیق صدقی" لە پشت مێزێك کە قورئانێکی لەسەر دانرابوو، سەرۆکی تەندروستی، وسەرهەنگ نکوزادو هی تریش ئامادەبوون. نکوزاد، بڕیارەکەی مەحکەمەی خوێندەوەو گوتی: بڕیاریشە کە دەبێ هەر ئێستا حوکمەکە ئەنجام بدرێ، بۆیە هەر داواو وەسییەتێکت هەیە بینووسە.

لەسەر وەسیەتنامەکەی پێشەوا، چەن ڕیوایەتێك باس دەکەن لەمەڕ هەندێ لەناوەرۆکی"جعفر مهدی نیا" و ڕوزنامەی "مرد امروز" نووسیوویانە کەبەشێك لەوەسیەتەکە: بەشێ لە سامانی بۆ دروست کردنی قوتابخانەو نەخۆشخانە بۆ خەڵکی کورد لەمەهاباد تەرخان بکرێ، کوردی نەسیحەت کرد بەیەکێتی و شتی لەو بابەتانە.

هەرچی دوکتۆر ڕەحیمی قازی هەیە دەڵێ: بەگوێرەی وێژراوی ئەفسەرەکان قازی محەمەد دوو وەسیەتنامە ئەنووسێت، یەکیان لەمەڕ ماڵ و منداڵ و ئەوەی تریش لەمەڕ مەسەلەی سیاسی. ئەمەی کە لەمەڕ ماڵ و منداڵە ئەیدەن بەخێزانی قازی، بەڵام ئەوی دیکەیان نەدابوو ئێستاش مەعلوم نەبوو کە قازی لەوێداچی نووسیبوو لە وەسیەتنامەکەی لەمەڕماڵ و منداڵ کەڕوونووسەکەی بەدەستی ئێمەوەیە چەند دێڕێکی مەبەستی سیاسیی تێدایە کەوا لەژێرەوە هەرچۆنێکی کەنووسیوویەتی ئەیخەینە پێش چاوی خوێندەواران" .. بەو هەموو هۆیەوە کە لەئیختیار مندابو ئەگەر شەرم کردبا ڕەنگ بوو تێنەشکێین، بەڵام بۆ ئەمەی کەمەهاباد وێران نەبێت و بۆ خاتری تێدانەچوونی خەڵك شەرمان نەکرد.

بەو هەمو ماشێن و هەڵانەی کەلەئیختیارمدا هەبوو نەمتوانی لە مەهاباد

هـەڵێم ودووجـاریش لـەوتارەکانی خۆمـدا بەخەڵکی مەهابادم گوت، ئەمن دەمزانی ئەگەر هـەڵێم ئـێرەش وەکوو تـەورێزی لێدەهـات و توشـی کوشـتار و تـالآن وبرۆدەبـو، ئـەمن بەخـەڵکم راگـەیاند کـە، رەنگـە بمگـرن و بشمکوژن، بەلآم بۆ ئەمەی ناموسی خـەڵکی بپارێزدرێت و تالآن نەکرێت هەڵ نایەم و خۆم بە قوربانی ئێوە دەکـەم ئـەوا ئـەمن بەعـەهدی خـۆم وەفـا ئەکـەم و تائێستاش لـەمێژوودا نەدیتراوە کەسێك فیداکارییەکی وای کردبێت هەڵبـەت لەسـەر ئێوەش پێویستە نیسبەت بەخزم و کەس وکاری من وەفاداربن و تۆڵەی منیش بستێننەوە.

دوای بلآوکردنـەوەی وەسـیەتنامەکەی پێشـەوا کـە لـە شـوێنی خۆیـدا دەقەکـەی دەبینیت، وادەردەکەوێت کەهەر ئەوە تەنها وە سیەتنامە بێت... پێشم وایە قسەکانی تـری بـەدەر لـەم وەسـیەتنامەیە، ئەسـڵ ێکیان نـەبێت... چونکـە پێش ئـەوەی لـە سـاتی جێبەجێکردنی حوکمەکە ئاگادار بکرێن، رێی تێنـاچێت هیـچ نامـە یـا وەسـیەتنامەیەك نوسـرابێت.. لـەکاتی نوسـینی ئـەو وەسیەتنامەیەشـدا بـەکات و بەشـێوەی نوسینی ئـەو وەسیەتەدا هـەر ئـەو بۆچونـە دەسەلمێنن.

لـەدواییدا کـاتی جێبـەجێ کردنـی رێوشوێنی ئیسلامەتی بۆ خۆ ئامادەکردنی مـردن هـات ئینجـا لـەو دەرگایـەی لەسـەر مـەیدانی چوارچـرادا بـوو هێنرایـە دەرێ، راسـتەوخۆ چـاوی بەهەرسـێ سـێدارەکان کەوت، گوتی سێدارە لە ئیسلامدا مەکروهـەو گوللـەبارانم بکـەن، وەرامیـان: بریـار هـەر سێدارەیەو دەبێ هەر وا بکرێ.

لەسـەعات سـێ و دە دەقیقـەی رووەو بەیانیی31مارسی1947لاشـەی پێشـ ەوای نەتـەوەی کورد بەسێدارەوە شۆڕبووەوە، دوای سـێ وچـوار دەقیقەیـەك گیـانی نـەمری رووەو بەهەشـتی ئـەزەلی هـەڵفڕی، نـاوی پیرۆزیشـی بەنـەمری و مێـژووی پڕ لەشانازیی بۆ کـورد مایەوە.

بەهـەمان رێ گـەو شـوێن سـەیفی قـازی بەرەو سێدارە بەرێ کرا، هەر کەپێی نایە ئەم دیـو دەرگـای سـەر زەوی چوارچـراو لاشـەی پێشـەوای بینـی کەوتـە پـەلامارو نەعرەتـە... وەك شێر هاواری دەکرد بژی پێشەوای کورد، بژی سەربەخۆیی میللەتی کورد دەگوترێ زۆر لەو دەورووپشتە، لەنەعرەتەی سەیف وەخەبەر هـاتن دوای پـەتی سـێدارە لـەمل کـردن و بەردانەوەی پەت دەپچڕێ...

بـەلآم زۆردار بـەوەش وازیـان لێنـەهێنا سـەریان خسـتەوە سـەر سـێدارەو ئـەویش بـەگیان و نـاوو شـانازییەوە رێوشـوێنی پێشەوای هەڵگرت.

سەدری قازیش بەوجۆرەی ئەوانی لەگەڵ کـراو بەهـەمان شـێوە لەسـێدارە دراو نـاوو مێـژووی ژیـانی بەشـانازییەوە بـۆ کـورد بەجێهێشت و گەیشتە ناو کاروانی شەهیدان، دوای ئەو تراجیدیا پڕ لە نەهامەتی و رووخان و لەسێدارەدانانە، دەمێنێتەوە سەر پرسیارێك کـە ئـارچی رۆزڤیلـت لـە کۆتـایی باسـەکەی لەسـەر مـەهاباد بـۆ ئایندەی کـوردی بـەجێی هێشـتبوو دەڵـێ: دەبـێ داهـاتو ئـەوەمان بـۆ روون بکاتـەوە کـە ئایـا لەشـوێنێکدا کەخەڵکەکـەی مریـدو لایـەنگری رێبـەرانی مەزهـەبی و سـەرۆك عەشـیرەتەکانن و ناسیولیزم بۆیـان دیاردەیـەکی نەناسـراوە، جولآنـەوەی کـوردی شـتێکی پراکتیـك و گونجاوە...؟

پرسـیارێکی تـەواو گونجـاوە لەگـەڵ سـەرەنجامی یـەك لـەدوای یـەکی راپـەڕین و شۆڕشەکانی کورد بـەلآم کـام جوولآنـەوە یـان کـام شـێوەو رێبـازی خـەبات؟ چونکـە هیـچ گومان لەوەدا نییە کە ئەو بارودۆخە خراپەی کوردی تیا قەتیسکراوە، بـەبێ بوونـی کـورد خـۆی بـێ خواسـت و ویسـت و خـەبات و دروشـم و ئامـانجی خـۆی بـۆ خـۆی گـۆڕان نایەتە ئاراوە، بۆیە ئـەم بوون و جوولآنەوەیە بۆ ئەو گۆڕانەی کە دەبێ کورد بگوێزێتەوە بۆ مەڵبـەندی ئـازادی و سـەرفرازی و دەوڵـەتی نەتەوایـەتی خـۆیو زۆر پێویسـت و پراکتیکیشە، بـەلآم چۆن و لەسـەر چ رێبـازو هەلومـەرجێ؟ خـۆ ئەگـەر مەبەسـتیش لـەوە جوولآنـەوەی چـەکدارو شۆڕشـە، شـێوەو رێبـازی خەباتـە وائێسـتا پـاش ئـەوەی پرسیارەکە لەسەر سەرەنجامی رووداوێك کراوە کە زیاتر لە(55)ساڵی بەسەردا تێپەڕیووەو تازە بەهـەمان شـێوەو بـۆ هـەمان مەبەسـت رووبەڕوومان ئەبێتەوە، لەبارودۆخی سەردەمدا پرسـیارەکە پێویسـتی بەهەڵوێسـتەیەکی هۆشیارانە هەیە سەبارەت بەو هەموو زیان و کارەساتانەی سەرەنجامی هەر یەك لەم جۆرە جوولآنەوانە بوون، دەبێ هێزە سیاسییەکانی کورد، لە ناو لێکۆڵینەوەیەکی هەمەلایەنەی ورد و بابەتیو زانستیانەی رابـردوودا بکەونەسـەر رێبـازی دانـانی سـتراتیجێکی یـەکگرتوو بـۆ جوڵآنـەوەی نیشـتمانی کوردسـتان بەرەخسـاندنی بەرەیـەکی یـەکگرتووی سەرتاسەری، بەتێگەیشتنی واقیعی هەر بەشە، گونجاندنی خەباتی پلەیی، دروشم و ئامانجی پلـەیی، لەگـەڵ جوولآنـەوەی سەرتاسـەری و سـتراتیجییەکەیدا، ئەمەیـە کـە دەبـێ هـێزە سیاسییەکانی کورد کاری بۆ بکەنو نەیەڵن لەوە زیاتر کات بەسەربچێ، نەیەڵن لەوە زیاتر هێزو توانا بەهەدەر بڕوات، نەیەڵن لەوە زیاتر کورد تووشی زیان و کارەسات و شکستو هەرەس ببێتەوە، بەتایبەتی بۆ ئەمڕۆی کورد کە لە کوردستانی عیراقدا هەلێکی مێژوویی تری بۆ رەخسێنراوە، وا لەناو هەمان سەرچاوەی بیری پرسیارەکەوە، کورد خـۆی نـەك دوژمنەکـەی خەریکە لـەناو شـەڕی خۆکوژیـدا وەلآمێکی پۆسەتیڤ دەداتە دەست پرسیاکەی ئارچی روزفلت...

## وەسیەتنامەکەی پێشەوا

بـۆ زیـاتر روونـاکیی خستنەسـەر دواساتەکانی ژیانی پێشەوا قازی محەممەد و ئەو وەسییەتنامەیەی لەو دواساتانەی پێش لە سێدارەدانیدا نوسراوە، لێرەدا دەقی دەقە ئەسـڵیەکەو تـایپکراوی وەسـیەتنامەکە دەخەینە پێش چاو...

این وصیتنامـەو در دهـم فروردیـن 1326 بحضور این جناب محمد صدیق صدقی گفته اند:

یك پارچه یادو پارچه قالی یاقالیچه سید رحیم پسر سیدجامی با اسبابهای منند، بدهید بخودش و او هم پولی به من مقروض است، اگر دادخوب و اگرنداد مختار است.

گندمی کەدر تثبیت بودەاست و مال من است اگر دادند بگیرید.

موقعی کەمرا بازداشت کردند پنجهزارو دویست تومان در جیبم بوده از من گرفتند و یکصدو پنجاه وسه تومان هم یك فقره ودەهزار تومان هم سروان شریف بەنام حق الوکاله از عیال من گرفته اراهم پس بگیرید.

معینی سه هزار تومان چیزی زیاد یا کم بەمن مقروض است و لو هم چیزی دادەاست و ساعتکه بەعنوان هدیه برای من اورده داخل دفتر شرکت کردەو من با شرکت طرف نبودەم.

سید سلام نمیدانم هشت هزار تومان یاچیزی کمتر طلب بر سرم دارد، هرچه خودش گفت به او بدهید.

تلفون را بردەاند تعقیب نمائید.

اتومبیلی که از بابا شیخ گرفتەاند انهم مال شخصی خودش است.

چهار جیب که بشخص خودم... ودر اختیار من بوده انها هم مال شخص خودم میباشند.

چون سروان شریف زحمت... در حدود سیصد تومانی به او بدهند.

اگر ان پانزده هزار تومان بالا اخذ شد به هر یك از سعید همایون و میرزا رحیم کەخدمت کردەاند یك هزار تومان و به محمد فیروزه خانم هم پانصد تومان بدهید.

خواهر خودم هستند غیر از اغلیان که بەاسم خودم پبت شده، در همه ترکه پدرم حق دارند، ایشان را راچی نمائید.

عیالم مادر بچەها وصی باشد اطفالها سرپرستی بکندو ملا عبدالله ناظر باشد.

مطبعه هم خودم خرید ام مال من است.

مام عزیز قرنی اقا کاری کەبر سرش امده به خیالش بەتحریك من بودەاست اگرچه بی خبرم، اما کاری بکنید که مرا ازاد نماید.

میرزا رحمت یادیگری هرچند از کشتن نجاتش دادم اگر از من چیزی در دل داشته باشد ازادم کند.

نوکرها که این مدت خدمت کردەاند زحمت با من کشیدەاند، نیکی به ایشان کردەو ایشان را راضی نمائید.

بعد از... چند هزار تومان برایم اسقاط وتهلیل نمائید.

شب10-1-1326

امضاء

شب10-1-1326 ملا صدقی و قاضی محمد.

## هەندێ سەرنج و ڕوونکردنەوە لەسەر وەسیەتنامەکە:

1. ئەم سەنەدەی لێرەدا بڵاودەکرێتەوە وەسێتنامەی پێشەوا قازی محەمەدە، کە بەخەتی مەلا صدیق لە شەوی10-1-1326ی هەتاویدا(31-3-1947)، نیو سەعاتێك پێش شەهیدبوونی قازی نوسراوە پێشەوا بەردەوام ئیمزای خۆی بە"محمد قازی" نووسیوە.

مامۆستا مەلا صدیقی صدقی ڕۆحانییەکی زۆر بەڕێزی مەهاباد بووەو لەڕابوردوودا پێشنوێژو دەرسبێژی مزگەوتی هەباساغای مەهاباد بووە، لەشەوی لە داردرانی قازیدا بۆ وەسێتکردنی قازی و یارانی، ئەویان هێناوە تا وەسێتەکەیان یادداشت بکا.

ئەسڵی ئەم وەسێتنامەیە لەلای"دۆکتۆر عەبدوڵڵا ئەبریشمی" یە دۆکتۆر ئەبریشمی پیاوێکی هەڵکەوتووی مەهابادە، زاوای قازی محەمەدەو ئێستا لەتاران دەژی کاك سەعیدی هومایون کە خوشکەزای قازییە، بۆ ڕوونکردنەوە و شیکردنەوەی چەند جێگەیەکی ئەو بەڵگەنامەیە یارمەتییان دام زۆر سوپاس بۆ گەورەیی وپیاوەتیی هەردوولایان.

2. (گندمی کە در تثبیت است)، تثبیت (تەسبیت) ناوی جێگەیەکەو عەمباری دەغڵ و دان بووە.

3. معینی محەمەد ئەمینی موعینی، وەزیری کیشوەر لەکابینەی کۆماری مەهاباددا.

4. (سید سلام نمیدام هشت هزار تومان)، سەییدا سەلامی حوسینی، ئەرباب(خاوەن)ی دێی سەوزی بووە.

5. بابا شێخ: جەنابی حاجی بابا شێخ سەرۆك وەزیرانی حکومەتی مەهاباد.

6. لەدوو جێگەدا ناوی سەروان شەریف هاتووە، ئەم سەروان شەریفە ئەفسەرێك بووە لەپادگانی مەهاباد، کەئەو سەردەمە لەلایەن حکومەتەوە وەك وەکیل(پارێزەر)ی بەزۆر دانراو(تسخیری) بۆ پێشەوا قازی دیاری کراوە، پیاوێکی بەڕێزو ڕاستگۆبووە، پاشتر خاتوو مریەمی کاکاغازادەی خەڵکی مەهاباد بوو بەهاوسەری، زۆربەی ڕووداوەکان لەبارەی قازییەوە و کاروباری بەدادگادانی ئەوی بۆ خەڵکی مەهاباد گێڕابووەوە و ئاشکرای کردبوو.

7. (عیالم مادر بچەها... و ملا عبدالله)، مەبەست مەلا عەبدوڵڵای مودەڕیسە.

8. (اگر ان پانزده هزار تومان بالا اخذ شد به هر یك از سعید همایون و میرزا رحیم... و به محمد فیروزه خانم) سەعیدی همایونی کەسایەتییەکی بەڕێزو خۆشەویستی مەهابادە(لەبنەماڵەی فەیزوڵڵا بەگییە) و خوشکەزای پێشەوا قازی محەمەدە، میرزا ڕەحیم: میرزا ڕەحیمی جەوانمەردی قازییە.

محەمەدی فەیرووزەخانم کارمەندی ئیدارەی دوخانیات (کارگێڕیی تووتن)ی مەهاباد بووە، تار ژەنێکی لێهاتوو بووە و پوورزای قازی بووە.

9. میرزا ڕەحمەت: خودا لێ خۆشبوو میرزا ڕەحمەتی شافیعی، یەکێك بوو لە کەسایەتییە ناودارو دیارەکانی مەهاباد.

10. ئاغڵیان ناوی دێیەکە لەدەوروبەری مەهاباد.

بالێرەدا بگەڕێینەوە دواساتەکانی سیاسەتی ڕژێمی شا بەرامبەر بەکوردو بەڵێن و پەیمان و ڕووداوەکان...

بۆ زیاتر چاوترساندن و سەرکوتکردنی کۆمەلآنی خەڵك رژێمی شا چەندین تێکۆشەری تر بەخنکاندن حوکمدا، لەوانە:

لە 7ی نیساندا، حمید مازوچی، رەسول نەغەدەیی، ملازم عبدالله رەوشن فیکر، ملازم محمد فاطمی لەمەهاباد کران بەسی`دارەدا، هەر لەو رۆژەدا لەسەقز ئەمانەی خوارەوە لەسێدارە دران شێخ حمە امین کەس نەزان، ئاغا صدیقی یازی بلآغی، علی ئاغای تەموتە، ئەحمەد خانی فاروقی، عەولاخانی فاروقی، حمە خانی فاروقی، رەسول ئاغای میرەدێ، حسین خانی کانی نیاز و عبدالله مەتین.

لەبۆکانیش: علی بەگی شێرزاد، محمد بەگی دانشوەر، ئەحمەد خانی کەلتەگە، محمد خانی بابە خان بەگ و محمود خانی تورکمان کەندی، کران بەپەتی سێدارەدا.

سەرەرای ئەوە بەدەیان لێپرسراوو سەرکردەی کۆمار لەزیندان توندکران و دەیانی تر خۆیان نەدا بەدەستەوەو ئێرانیان بەجێ هێشت یا خۆیان شاردەوە.. ئیتر چەوسانەوەو ئازاردان لەخراپترین شێوەدا دەستی پێکرد، گەلێکی شکاو، بەکاتیش بێت، بکەوێتە بەردەست دوژمنێکی کۆنەپەرستی خوێن رێژ، ئەبێت ژیانی چۆن بێت؟ سەرەك وەزیرانی ئێران- ئەحمەد قەواموسەلتەنە- ئەو دەورەی پێی سپێررا بو پێی هەستا، نەخشەکەی بەئەنجام گەیاند، ئەوسا فەرمانی پێکرا کە ئیستقالەی خۆی و وەزارەتەکەی پێشکەش تەختی شا بکات و هەر خێرا جێ بەجێ ی کرد.

دوای رووخانی هەردوو کۆمار، بەڵێنەکانی قەوامو لسەڵتەنە و پەرلەمان و سەربەستی دیموکراسی و مافی کرێکاران و ئازادی بیرورِاو چالاکی پارت و رێکخراوەکان و نوێنەرانی تودە لەوەزارەت و تاد... چیان لێ بەسەرهات؟ ئەوانە وەکو هەڵم چوون بەئاسمانا، نەك هەر شوێنەواریان نەما، بەڵکو رژێمی تاران کەوتە قەلآچۆکردنی هەموو بیرودەنگ و داوایەکی ئازادی، سەرلەنوێ ستەم و زۆرداری سەرانسەری ئێرانی گرتەوە.

لەشوێنی خۆشیدایە، دوای ئەوانە، ئاورێك لە پەیمانەکەی نێوان سۆڤیەت و ئێران بدەینەوە و بزانین کۆمپانیای هاوبەشی نەوت چی لێبەسەرهات:

"پاش ئەوەی حکومەتی قەوامو لسەڵتەنە بەیارمەتی ئینگلیزو ئەمریکا لەجولآنەوەی رزگاریخوازانەی ئازەربایجان و کوردستانی داو لەگۆمی خوێناوو خۆڵدا نقومی کردن، رێکخراوەکانی حیزبی تودەو یەکێتیە کریکارییەکانی لەناوبرد... ئەوسا لە تشرینی یەکەمی ساڵی 1947دا پەیمانەکەی سۆڤیەت و ئێرانی خستەبەردەم پەرلەمان... پەرلەمانیش رەفزی کرد...."

بەڵێ نزیك روانین و دورکەوتنەوە لەتێگەیشتنی سروشتی رژێم و چینی دەسەڵاتدار... نەبوونی بنچینەی زانست لەشیکردنەوەی سروشتی رژێمی تاران، دەرك نەکردن بەپیلان و نەخشەی دوژمنانە بەرامبەر دوو گەلی ئازادیخواز و دوو قەوارەی خودموختار... ئەبێت هەر ئەوە ئەنجامی بێت.

ئەگینا زۆر ئاشکرا بو کە رژێمی شا نۆکەری ئیمپریالیزمە، لەوەش ئاشکراتر ئەوە بو کەئیمپریالیزمی بەریتانیا هەر لە سەرەتای ساڵی 1920 و بەهۆی (کۆمپانیای پیترولی سەروی ئێران) دەستی بەسەر نەوتی ئێراندا گرتبوو، ئیمپریالیزمی ئەمەریکاش هەر لەکۆتایی ساڵی 1921وە بەهۆی(کۆمپانیای ستاندارد اویل اوف نیوجرسی)یەوە هاوبەشی نەوتەکە بو.. لەدوایشدا هەمو نەوتی ئێران کەوتە بەردەستیان، ئەی چۆن دەست بەرداری ئێران و نەوتەکەی ئەبن، چۆن رێگە ئەدەن رژێمی تاران روو بکاتە لایەکی تر یان رێگەی ئازادی گەل بدات و جێگەیان پێ لێژ بکرێت؟ بێگومان سروشتی ئیمپریالیستیی ئەو دوو دەوڵەتە هەرگیز رێگە بەوانە نادەن، ئەوە راستیەکە زۆر لە مێژەوە ئاشکرایەو پیر لێکردنەوەی قوڵی ناوێت.

## سەرچاوە

جەمهوریەتی کوردستان، مەحمود مەلا عیزەت، چاپی یەکەم، سلێمانی (2000) لە چاپکراوەکانی دەزگای سەردەم.

# لە دادگەدان و هەڵواسینی قازی محەمەد، سەدری قازی و سەیفی قازی

## شەوکەت شێخ یەزدین



مەهاباد بازێرێکی بچووکە، ناوی کۆنی "سابلاغ"بووە و لە رابردوودا بەسەرهاتی پڕ لە رووداوی هەیە. ئەم شارە کە لەسەر لێواری رووباری بچووکی مەهاباد هەڵکەوتووە، سەبارەت بە ناهێمنی و بشێوێنییەوە تەناهی و خۆشیی بەخۆیەوە نەبینیوە، لە رواڵەتی شارستانەتیی نوێدا لە کارگەیەکی بچووکی کارەبا و چەند باڵەخانەیەکی دوو نهۆمیی بێ بایەخ بترازێ شتێکی تری تێدا نابینرێ. مەهاباد لە نێوان چەند زنجیرە چیایەکی کە ئەم شارەیان لە کۆش گرتووە و لەملاو لەولا وە سەریان بۆ ئاسمان هەڵبڕیوە، هەڵکەوتووە.

زنجیرە بانەکانی باکور و باشوور، ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا کە چێترین پارێزی ئەم شارەن، لە بارەی دیرۆکی مەهابادی بچووکەوە نهێنیی بەمەترسییان لە دڵدا هەڵگرتووە. مەهاباد سەردەمانێ لە لایەن رووسە تزارییەکانەوە داگیرکراوە و، ڕۆژانێ بەدەستی سوارانی خوێنەخۆری سمایلاغاوە بووە. بەینێکیش شەڕگەی زۆر خوێناویی هێزگەلی دەوڵەت و کوردان بووە.

بەڵام ئەم رووداوانە لە ڕیزی بەسەرهاتی ئەوتۆ روویانداوە دوورنییە بەساڵان ر ابببوورن و کەسێك پەیدا نەبێ باسیان بکات. نهێنیی ئەوتۆ هەن لەوانەیە هەتا هەتایە کەس پێیان نەزانێ: جەردەیی، خوێنڕێژی، پیلانگێڕی و بێنەوبەردەی نۆکەرانی وڵاتانی بیانی وهیترو هیتر ئەم بازێرەیان کردبوو بەگۆڕەپانی زۆرانێی خۆیان.

مەهاباد لە نێزیکی سنووری سێ وڵات یان چاتر بڵێم چوار وڵاتدایە، بەرژەوەندی دژبەیەکی: نەوت، کۆماری کورد، سەرکوتینەوەی کورد، خۆبەڕێوەبەریەتی، ناوبەناوێ دانیشتوانی بەلەنگازی ئەم سەرزەوییە بەسەردەکەنەوە. ڕۆژێ کۆلۆنێل لۆرەنس دەیکا بەمەیدانی تەراتێنی خۆی، ڕۆژێکی تر ئەسەدۆڤ بۆ پێشوەبردنی سیاسەتی وڵاتی خۆی گورجوگۆڵ ییی تێدا دەنوێنێو سەردەمانێکی تریش نەوت پێوەندیی دانیشتوانی ئەم سەرزەوییە بەسیاسەتگەلی دەرەکییەوە گرێدەدا. راپەڕین، خوێنڕژتن، دووبەرەکیو کوشتار، گەلێك جاران دێنەوە کایە. بارودۆخ هێمن دەبێتەوە و پاش تۆژینەوە لەوەی روویدا، چاودێری بێلایەن دەگاتە ئەو بەرکەوتەی کەوا پاش هەموو ئەو قوربانیدان و نیشتنەوەی لافاوە تەنیا دەوڵەتێك دۆڕاندبێتی ئێرانە و تەنیا گەلێك لە خۆڕاییی قوربانی دەدا گەلی ئێرانە، جا چ لەم لا بێ چ لەو لا، بەو شێوەیەی لە بەرگی پێشوودا گوتمان کۆماری خۆبەڕێوەبەریەتیی کوردستان و ئەم بیرە بەر لە شەڕی ناوولاتان شانبەشانی دەسڕۆیشتنی وڵاتێکی بیانی کە لە ئێران و تورکیا و عیراق و سووریا و شام واتە لە ناوچەگەلی کوردنشیندا دەسەڵاتی دەنواند، بەرە بەرە، لە زار بۆ زار، لە دڵ بۆ دڵ و لە گوێ بۆ گوێ لە هەموو شوێنێکدا پەرەی گرت و ئالیگرانی لەخۆی کۆکردەوە. وڵاتانی بیانیش کەچاویان بڕیوەتە ئەم ناوچەیە و لە کانگەی نەوتە گەشەدارەکەی راماون، کەڵکیان لەم ئاوازو لەم نێزەی خۆبەڕێوەبەریەتییە وەرگرت و ئەوەیان هێنایە کایەکە بینیمان.

نووسەر بێ ئەوەی بیەوێ ناوچەگەلی کوردستان و کوردەواری بە دوورو درێژی و بە نەخشەوە بۆ خوێنەران شرۆڤە بکات، بەئازادییەوە دەڵێ دەستی سروشت زەویی بەنرخ و زێڕینی کە لە سەرنجی ئابووری و سوپایی و سیاسییەوە بۆ ئینگلیز و رووسی کۆن و سۆڤیەت و ئەمەریکا و بەریتانیای نوێ لەو پەڕی گرینگیدان، بە مرۆڤگەلێك داوە کە کوردیان پێگوترێ و برێتین لە کۆنترین دانیشتوانی ئێران. جارێکی تریش ناچارم ئازادانە ئاماژە بکەم کە دانانی سنووری وڵاتانی بچووکی ئێستەی ڕۆژهەڵاتی نێزیك بەجۆرێکە کوردستانی لەت لەت کردووە، کورد لەم ناوچەیەدا لەوەی کە لەئێراندا هەن و ئێرانین، هەروەها لە تورکیا و عێراق و سووریاشدا بەشێوەی کەمینە-کەمینەیەکی کارەسات دیتە، هەن، سەبارەت بەو نەوتە بەهادارەی لە زەوی کوردنشینی ئێران و تورکیا و عێراق و سووریا و تەنانەت بەشێکی قەفقاسیاشدا هەیە، ناوی کورد بەردەوام لەگەڵ ناوی نەوتدا جووتە کە ئەمڕۆ نەوت بەوێنەی کیمیایە. هەمان سیاسەت کە نەوتی دەوێ و لە پرسی نەوتدا تێکەڵە، لە پرسی کوردستانیشدا چالاکی دەنوێنێ.

قازی محەمەد پاش ئەو گۆڕانانەی هەمرومان دەیزانین، دروست لە هەمان ئەو کاتەی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان لە گوێ بەفەرمانیی دەوڵەتی ناوەندی هەڵگەڕایەوە، ئەویش ئاڵای زۆرداریی هەڵداو دەنگی خۆی بۆ دانانی کۆماری کوردستان بڵند کرد و دەستی پێکرد

ئاوازی (خودموختاری- خۆبەڕێوەبەریەتی) بژەنێ. وەك لە پێشەوە گوترا، بیری هێنانە کایەی ئەم بەڵایە نوێ نەبوو، چالاکیی قازی محەمەدیش شتێکی تازەبابەت نەبوو، چاکتر وایە بەشێوەیەکی کورتەبڕی باسێك لە ژیانی رابردووی قازی محەمەد و برایانی ئەو بکەین.

باوکی قازی محەمەد، ناوی قازی عەلی و لە پیاوانی رێزدارو شایەن رێزی کوردستان بووە، لە شەڕی پێشوو لەگەڵ قازی مونعیمی ئامۆزایدا خزمەتێکی گەورەیان پێشکێشی دانیشتوانی مەهاباد کردووە و هەتا پێیان کراوە پێشبڕییان لە دەسەڵاتی رووسە تزارییەکان و زوڵمی ئەوان کردووە، مامی باوکی قازی محەمەد، قازی فەتاح کە دەسەڵاتێکی فرەوانی لە کوردستاندا هەبوو، لە رووداوی "مەشروتە" و "ئیستیبداد"دا سوێندی خواردبوو هەتا زیندووبێ نەهێڵێ سەربازی تزار پێبنێتە ناو مەهابادەوە، بۆ ئەمە کفنی لەبەرکرد و بانگی لە خەڵك گێرایەوە بۆ "جیهاد" و لە پێناوەدا شەهیدبوو. ئەو رابردووە گەشەدارەی بنەماڵە کە هێشتا لە بیری دانیشتوانی مەهاباد نەسڕاوەتەوە، ئیتر ناوبانگی بنەماڵەی قازیی لەگەڵ رووبەڕووبوونەوەی بیانیدا هاوتا کردبووو دانیشتووانی کوردستانی هان دەدا لە پێش کەسانی سەر بەم بنەماڵەیەدا سەری رێزو نەوازی دابنەوێنن. بەتایبەتیش لەبەرئەوەی ئەندامانی ئەم بنەماڵەیە پیاوی ئایین و زانست بوون و، بەشێك لە سوننییەکانی کوردستان گوێڕایەڵیی ئەوانیان دەکرد.

لە سەردەمانی دەسەڵاتداریەتیی پاتشای پێشوودا کە هێزگەلی سوپا لە پێناوی چەسپاندنی دەسەڵات و فەرمانڕەوایەتیی دەوڵەت لە کوردستاندا ناچار بوون لەگەڵ خێڵان وئاییندارانادا پێکەوە خەبات بکەن، لەو رۆژانەدا دەوڵەت بێ رادە خاوەن دەسەڵات بوو، توانا و دەسەڵاتی ئەو رۆژانەش وەك پەندی پێشینان، ئیتر لەو رووەوە کە باوکی قازی محەمەد و مامی دەسەڵاتی‌ی فرەیان لە مەهاباد و دەوروپشتیدا هەبوو، دەوڵەت مۆڵەتی بەهەردووکاندا سوود لە بەرگی ئایینی وەربگرن، دەست هاوێژەکەیشیان بەشێوەی خوارەوەیە:

"ژمارە66، بەگوێرەی مۆڵەت، بەڕێزان میرزا عەلی و میرزا مونعیم قازی، بەپێی بەندی3 لە مادە2ی یاسای شێوەی یەکگرتوودا، لە لەبەرکردنی جلکی مەلایەتیدا مۆڵەت دراون. بەژمارە 2669 شەهادەی مۆڵەتی دەرس گوتنەوەیش لە زانستی(منقول) و(معقول)دا بەگوێرەی پەسندکردنی یەکێك لە زانایانی ئەهلی سوننەت بەناوبراوان بدرێت."

میرزا عەلی قازی کە دەسەڵات و رێزی شایەنی هەبوو و، پاتشای پێشوو کەیفی پێی دەهات، لە ساڵی1317دا کۆچی دوایی کردووە. بەپێشنیازی سەرکردەی فیرقە و رێنوێنیی بەرپرسانی سوپا، لە تارانەوە مۆڵەت و فەرمانی دادوەری لە لایەنی پاتشای پێشووەوە لەسەر ناوی قازی محەمەدی کوڕی دەرچوو. پلە ورێزی مەزەبیی قازی محەمەد پاش ئەوەی بایەخی دەوڵەتی ناوەندی و بایەخی پاتشاشی هاتنەسەر، دەسەڵاتێکی بەرهەڵدای بۆ ئەو لە کوردستاندا هێنایە گۆڕێ، بەڵام میری نەکرا سوود لەو دەسەڵات و خۆشەویستییەی ئەو وەربگرێ، لەبەرئەوەی تاران هەستی نەکرد کە قازی محەمەد هەرچەند خۆی موفتیی مەهابادە و فەرمانی دادوەریی هەیە و ئەنگوستیلەی ئەلماسی بەدەست هێناوە، هەروەها دەشیەوێ سەدری قازیی برایشی بەنوێنەرایەتیی ئەنجوومەن بۆ تاران بنێرێ.

ئەو رۆژانە وەکو ئێستە، تەنیا هەندێ ماستاوساردکەرەوە دەیانتوانی سەرنجی بەرپرسانی مەلبەند بەکێش بکەن. گوێ بەو بابەتە نەدرا، تەنانەت کارشکێنی لە دژی قازی محەمەد کە تێدەکۆشا بەبێ خۆدەرخستن پلەیەك بۆ خۆی بەدەست بهێنێ، دەستی پێکرد. هێشتا لەبیر نەکراوە کە وا لەیەکێك لە سەردانە مێژووینەکاندا پاتشای پێشوو لە دیمانەی دەمڕاستی ئەو شارەدا کە پیا وێ‌ی دەروون پاك و پیرو پەککەوتە بوو، شایەتیش بۆ گەورەترین هونەری ئەوەبوو بەبێ مۆڵەتی سەرکردەی مۆڵگە نەدەهاتە شار و سەعاتێك لە پشت دەرگەی ژوورەکەی ئەودا لە چاوەڕوانیی دەرچوونی مۆڵەتدا دەوەستا، بێ خولکیی خۆی پێشاندا و لە یەکێك لە دانیشتنەکاندا کە ژمارەیەك لە پیاوانی ئاینی و بازرگان تیایدا ئامادە بووبوون، پاش ماوەیەك لە باسوخواس و تێگەیشتن لە زانین و خوێندەواری و دەسەڵات و قسەکانی ئەو پیاوە، پاتشا بەسەرکردەی فیرقەی فەرمووبوو: "بۆچی لەمانە نانێری بۆ ئەنجوومەن؟"، ئەو خوالێخۆشبووە بەشێوەیەکی نهێنی گوتبووی: "ئەمانە گوێڕایەڵ نین!".

بەهەحاڵ دوورەپەرێزی لە بایەخدان بەپێویستییەکانی سەردەم و گۆڕانەکانی رۆژ، بووە هۆی ئەوەی نوێنەرایەتیی مەهاباد لە پەرلەماندا بەکەسێك بسپێردرێ کە لە رۆژی تواناییدا دەوڵەت نەتوانێ دەست و پێی قازی محەمەد گرێ بدات و پاش مانگی گەلاوێژ لە ترسی ئەو نەچێتە مەهاباد و دەوڵەت لە چالاکیی ئەو کەڵك وەرنەگرێ.

قازی محەمەد پیاوێ‌ی لەبنەوە و فێڵاوی بوو، بەزاراوی ناسکئامێزی ئەمڕۆ سیاسەتکاربوو. بێ ئەوەی هیچ بیانووەك بداتە دەستی ناحەزانی خۆی، لە چاوەڕوانیی هەل و دەرفەتدا کاتێ خۆی بەموتالا وردبوونەوە بەسەر دەبرد. ئیتر بەرە بەرە خۆی لە پیاوێکی ئایین پەروەری کوردەوارییەوە کرد بە پیاوێکی زانا، بەتایبەتیش لە بواری فێربوونی زانستی نوێدا چالاکییەکی زۆرتری لە خۆیدا پێشان دەدا و پێی کرا زمانگەلی: عارەبی، ئینگلیزی و فەرەنسی پتر لە رادەی بەجێ گەیاندنی پێویستی فێربێ. تەنانەت



بەجۆرێك لە مێژووی کۆنی کوردستانی کۆڵییەوە کە ئاخاوتنەکانی ئەو بۆ زۆر لە ئاگادارانیش بووبوون بەدەستهاوێژ. بەم هەموو توانا و دەسەلات و ئامادەکارییەوە، باری ئارامی کوردستان بەهاتنی هێزی بیانی لێکهەڵوەشایەوە، پاڵەپەستۆی بیانییان لەو ناوچەیەدا بەرادەیەك گرژ بوو شەوێکیان بەهاندانی قازی محەمەد ئەوکاتەی بەڕێز فەریق جیهانبانی بۆ پشکنین چووبووەدەر، هەندێ لەخراپەکاران لەپشت باڵخانەیەك کە ئەو تیایدا روودەنیشت، هەتا سەری سبەینێ خەریکی گوللەباران بوون، پاش تاوێك بنکەی پۆلیسی مەهابادیان چەك کرد شوێنەوارێکی بەکردەوە لە هێزی میری لەو ناوچەیەدا نەما. لەو بارودۆخەدا کە هێشتا شەڕ بەکۆتا نەهاتبوو و خەریکبوونی ولاتانی بیانی بەشەڕەوە بووبوو بەپێشبڕ لە تیکەڵبوونیان لە کاروباری ئێراندا قازی محەمەد، قازی سەدری برای یا وەك بەناوی سەدری قازی بەناوبانگە، بەناوی نوێنەری کوردستانەوە لە خولی چواردەدا ناردە ئەنجوومەن. هەموو ئەو ماوەیە قازی محەمەد بەکردەوە چیی پێویست بوایە دەیکرد بەلام ناوی: لە(خودموختاری) یان دژایەتیی دەوڵەتی ناوەندی بەسەر زاریدا نەدەهات بەڕادەیەك، جارێك یان دوو جاریش هاتە تاران و بەخزمەت پاتشا گەیشت و ئەنگوستیلەی ئەڵماس و بڕێکیش پارەی پێدرا.

ئەرکانی سوپا لە ڕیگەی کرێگرتە نهێنییەکانی خۆیەوە لە مەهاباد و ناوچەگەلی تری کوردستاندا کە ئەرکی کۆکردنەوەی دەنگوباسیان هەبوو، چالاکیی دەنواند. بەلام دەوڵەت زێدە لە رووداوی ئەوێدا خۆی تیٚکەڵ نەدەکرد لەبەرئەوەی ململانەیەکی گەرموگوڕ لە نێوان کاردارانی سیاسی و سوپاییی دوو دەوڵەتی بیانیدا لە پەنای پەردەوە دەگەڕا و ئێران بۆی نەدەلوا دەست بە کارێکی بەکارو لەبار بکات. بەپوختی بەهەمان ئەو شێوەیەی قازی محەمەد لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندیدا گەمەی دەکرد دەوڵەتی ناوەندییش خۆی لەو نەبان دەکرد و، لەو کاروکردەوانەی قازی محەمەد لە مەهابادو سەدری قازی لە تاراندا بەئەنجامیان دەگەیاند خۆی کڕو بێدەنگ دەکرد.

بێ ئەوەی بمانەوێ ئەو باسانەی لە بەرگی یەکەمدا گوتوومانە جارێکی تر دەوربکەینەوە، دەڵێینەوە کەوا بەهۆی ئەو گیروگرفتانەی لەو ڕۆژانەدا هەبوون و ئەو کێشەو بەرانەی لەبارەی پرسی نەوتەوە سەریان هەڵدابوو و بووبوونە مایەی رووداوەکانی ساڵی1323 و1324، لە نیوەی دووەمی ساڵی1324 بەدواوە بارودۆخی کوردستان و مەهاباد ڕەوتێکی تریان گرتەخۆ و ئاشکرابوو لە کوردستانیشدا پەردەیەکی بچووك کە داخوازەکانی حیزبی کۆمەڵەی هەتا ئەوکاتە داپۆشیبوو، بەزوویی چووە لاوەو، بارستی راستەقینەی کارەکانی قازی محەمەد ئاشکرابوو. لەبەرئەوەی دەستهاوێژهەبوون پێشانیان دەدا کەوا لە کوردستانیشدا پێشینەی

پێویست لە پێناو بەجێگەیاندنی سیاسەتێکی لەگوێ، ئەو سیاسەتەی کەلە ئازربایجان بەرێوەدەچوو، ئامادەیە و لەبەردەستدایە. هاتنی بارزانییەکان ئالیکارییەکی گرینگی دا بەفراوانکردنی داوێنی ئەو رووداوانە.

لە ئەنجامدا، لە هەمان رۆژی کەوتنی فیرقەی تەوریزدا واتە لە رۆژی بیست و یەکی مانگی سەرماوەرزی 1324دا (واتە 11 کانوون 1945) قازی محەمەدیش نیازی خۆی لە پشتەوانیی ئەو سیاسەتەدا بەناردنی نێردەیەك بۆ تەوریز ئاشکراکرد. ئەو نێردەیە بەسەرۆکایەتیی محەمەد حوسێن قازی (سەیفی قازی) و، برێتی (نیابة) لە گەورە بەرپرسانی حیزبی کۆمەڵە بوو. ئەمانە وتوێژێکی فرەوانیان لە تەوریز لەگەڵ پێشەوەری و گەورە بەرپرسانی فیرقەی ئازربایجاندا کرد و، یارمەتی و دەستەوایی و پشتەوانیی خۆیان بۆ یەکتر راگەیاند.

قازی محەمەد رۆژی بیست و دووی سەرماوەرز نەخشەی کوردستان و بەرنامەی سەرخۆبوونی خۆی خستە بەردەمی دانیشتوانی سادەی مەهاباد و، نزیکەی300کەسی لە لاوانی مەهاباد چەکدارکرد. رۆژی بیست و شەشی سەرماوەرزیش(16کانوون یەکەم) ئاڵای ئێرانی لە باڵەخانە دەوڵەتییەکان دابەزاند و ئاڵایەك کە برێتی بوو لە سێ رەنگی سوور و سپی و کەسك، بەرەواژی ئاڵای ئێران، هێمای گوڵەگەنم و رۆژ و قەڵەمی پێوەبوو، کە بەناوی ئاڵای سەرفرازیی کوردەوە دروستی کردبوو، بەرزکردەوە. رۆژی دووەمی رێبەندان، قازی محەمەد حکومەتی کۆماری کوردستانی جاڕدا (واتە: 22کانوون دووەم 1946)و پاش ئەمە محەمەد حوسێنی سەیفی قازی بەجلك و بەرگی یونیفۆرم و پلەی جەنەراڵییەوە چووە پشت مێزی و تاردان و قازی محەمەدی وەك پێشەوا و سەرۆك کۆماری کوردستان خوێندەوە، قازی محەمەدیش بەجلك و پلەی جەنەراڵ و بەناونیشانی سەرکردەی هەموو هێزگەلی کوردستان لە شوێنێکی بەرز بەپێوەوە وەستاو خۆنواندنی هێزەکانی خۆی بینی و پاش بەجێ هێنانی رێورەسمی خۆنواندن، قازی محەمەد پێکهێنانی کابینەی کۆماری کوردستانی بەشێوەی ژێرەوە راگەیاند:

1. حاجی بابەشێخ- سەرۆك وەزیر (رەئیسی هەیئەت).

2. محەمەد حوسێنی سەیفی قازی- وەزیری شەڕ (جەنگ).

3. محەمەد ئەمینی موعینی- وەزیری ناوخۆ (کیشوەر).

4. ئەحمەدی ئیلاهی- وەزیری ئابووری (ئیقتیصاد).

5. کەریمی ئەحمەدەین- وەزیری پۆست و تێلگراف.

6. حاجی رەحمان ئێلخانی زادە- وەزیری راوێژکار(مشاور).

7. مەنافی کەریمی- وەزیری رۆشنبیری(فەرهەنگ).

8. سەدیقی حەیدەری- وەزیری راگەیاندن(تەبلیغات).

9. خەلیل خوسرەوی- وەزیری کار.

10. حاجی مستەفا داودی- وەزیری بازرگانی(تیجارەت).

11. مەحموودی وەلی زادە- وەزیری کشتوکاڵ(کیشاوەرزی).

12. سمایلی ئێلخانی زادە- وەزیری رێگەوبان.

دوای ماوەیەك، واتە لە رۆژی چوارشەمووی24ی مانگی رێبەنداندا، بەپێی ئەوەی لە رۆژنامەی بلاوکەرەوەی بیری حیزبی کۆمەڵەدا نووسراوە، قازی محەمەد سوێندی خوارد. رێورەسمی ئەو سوێندە لە رۆژنامەی کوردیی بلاوکەرەوەی بیری قازی محەمەددا بەشێوەی خوارەوە نوسراوە:

".... لە هەوەڵ ئاخیر و نێوانی وتارەکاندا لە هەر کاتێکدا نێوی ریاسەتی جمهوور قازی محەمەد، بەسەر زاراندا دەهات بێ وچان موزیکی میللی لێ دەدرا و چەپڵەڕێزان دەکرا و بەیناوبەینیش قوتابییەکانی مەداریسی کوڕو کچ سروودی میللییان دەخوێندەوە.

لەم کاتەدا رەئیسی جمهووری بەنگی بەرز بە ئەندامەکانی کۆمیتەی مەرکەزیی ئەمر فەرموو کە قوورئانی موقەدەس و نەقشە و ئاڵای کوردستان حازر بکرێت، بێ وچان هەیئەت کۆبوونەوە و دوو بەدوو لە پشت سەری یەك کەوتنە رێ و چوون لە کانگای حیزبی دیموکراتی کوردستان قورئانی موقەدەسیان دەگەڵ نەقشەو ئاڵای کوردستان دەگەڵ ئیحتیرامێکی فەوقولعادە لە سەر دەستی مەلا حوسێنی شکاك داناو، هەیئەت بەتەرتیبی هەوەڵ لە پشت سەری وی گەڕانەوە تا گەیشتنەوە حزووری پێشەوا، پێشەوا بەدەستی خۆی سەرپۆشی لەسەر قورئانی موقەدەس و نەقشە و ئاڵای بەرزی کوردستان لابرد و مەراسیمی سوێندی:

(ئەمن بەخودا، بەکەلامی عەزیمی خودا، بەنیشتمان، بە شەرافەتی میللەتی کورد، بەئاڵای موقەدەسی کوردستان سوێند دەخۆم کە تا ئاخیر هەناسەی ژیانم و رژاندنی ئاخیر تنۆکی خوێنم بەگیان و بەماڵ لە رێی راگرتنی سەربەخۆیی و بەرزکردنەوەی ئاڵای کوردستاندا تێکۆشم و نیسبەت بەرەئیسی جمهووریی کوردستان و یەکێتی کورد و ئازربایجان موتیع و وەفاداربم.)ی خوێندەوە."

پاش بەجێهێنانی ئەم رێورەسمە کە گومانی تێدا نییە قازی محەمەد سەبارەت بەهەست گرژییەوە دەلەرزی و، ئەو کەسانەیش کە ئەو گەمەیەیان هێنابووە گۆڕێ پێدەکەنین، قازی محەمەد پلەی جەنەراڵییدا بەهەندێك کەس، لەوانە دای بە"رێگر"ێکی وەك محەمەد رەشید کە بانەی لە ئاگر هەڵکێشابوو و بەسەتان مرۆڤی بێ گوناحی کوشتبوو بێجگە لەم وشەیە ناتوانرێ بەهیچ ناوێکی تر بانگ بکرێ.

قازی محەمەد پاش ئەوەی "بەقسەی خۆی" بەئاوات گەیشت، بەوێنەی فیرقەی دیموکراتی ئازربایجان بەفەرمانی بێگانان لە ڕێگەی سەدری قازیی برایەوە لە تاران خەریکی نواندنی چالاکیبوو. لەو ڕۆژانەدا ئەحمەد قەوام سەرۆک وەزیر بوو و کەشی دەوروبەر بۆ ئەم شێوە چالاکییانە لەباربوو. لە یەکەمین خولی وتووێژی نێوان دەمراستانی ئازربایجان و تاراندا سەرکەوتن بەدی نەهات و دەوڵەت ڕاگەیاندنی‌ەکی لە یەکەمی مانگی گوڵاندا دەرکرد و لە خاڵی یەکەمیدا گوتی:" لەبەرئەوەی دەوڵەت بڕوای وایە دامەزراندنی سەرۆکانی بەرپرسیاری سوپا و پۆلیس لە لایەنی دەوڵەتەوە بێ بەڵام دەمراستانی ئازربایجان ئەو باوەڕەدا بوون کە دەبێ دانانی سەرۆکان بەپێشنیازی ئەنجوومەنی هەرێمایەتی و پەسندکردنی دەوڵەت بێ بۆیە و تووێژ بێئەنجام مایەوە."

بیانییەکان بۆ ئەوەی پاڵەپەستۆیەک بخەنە سەر دەوڵەتی ناوەندی، لە تەورێزو مەهابادا دەستیان کرد بەنواندنی چالاکیی سیاسی و لە هەندێک شوێندا "کە وەک سنووریان لێ بەسەر هاتبوو" خەریکی خۆپێشاندانی سوپایی بوون. تەنانەت بۆ ئەوەی دەوڵەت بترسێ، قازی محەمەد خۆنواندنی‌ەکی گرینگی بەهەموو خێڵان "کە ئەو کاتە لە سایەی لەباربوونی هەواوە دەیانتوانی چالاکی بنوێنن" لە مەهاباد بەجێ هێناو، دەستی‌کرد بەخۆپێشاندانێکی گرینگ و، رادیۆی تەورێز بەستنی پەیمانێکی گرینگی لە نێوان تەورێزو مەهابادا ڕاگەیاند.

ئەم دەستپێشکەرییە کارێکی نالەباری لە تاران کرد لەبەرئەوەی لەو دەمەیدا کە دەوڵەت پێوەبوو لە ڕێگەی وتووێژی ڕاستەوخۆ و ئاشتیخوازانەوە ئۆتۆنۆمیی ئازربایجان لەبار بچوێنێ، ڕۆژی سێشەمی سێیەمی مانگی گوڵان (واتە: 23نیسان1946) ئازربایجان و کوردستان بەوێنەی دوو دەوڵەتی سەربەخۆ خۆیان ڕاگەیاندو پەیمانی شەڕو ئابوورییان بەیەکەوە بەست. لەبارەی ئەو پەیمانە و ئەو مەرجانەی تیایدا تۆمار کراون ڕۆژنامەی کوردستان نووسیویەتی: "... ڕۆژی سێ شەموو 3ی بانەمەڕی 1325 ساتی پێنجی ئێوارێ لە شاری تەورێز لە عەمارەتی میللیی ئازربایجان بەحزووری سەرانی حکووتی میللیی کوردستان:

. ڕەئیسی حکوومەتی میللیی کوردستان جەنابی ئاغای قازی محەمەد.

. ئاغای سەید عەبدوڵڵای گەیلانی عزووی کۆمیتەی مەرکەزیی حیزبی دیموکراتی کوردستان.

. ئاغای عومەر خانی شەریفی عزووی کۆمیتەی مەرکەزیی حیزبی دیموکراتی کوردستان و ڕەئیسی عێڵی شکاک.

. ئاغای محەمەد حوسێنی سەیفی قازی ڕەزیری هێزی حکوومەتی میللیی کوردستان.

. ئاغای ڕەشید بەگی جیانگیری عزووی کۆمیتەی مەرکەزیی حیزبی دیموکراتی کوردستان و ڕەئیسی عێڵی هەرکی.

. ئاغای زێڕۆ بەگی بەهادوری عزووی کۆمیتەی مەرکەزیی حیزبی دیموکراتی کوردستان.

. نوێنەری کوردی شنۆ ئاغای قازی محەمەد خدری،و بەحزووری سەرانی حکوومەتیی میللیی ئازربایایجان:

. ڕەئیسی مەجلیسی میللیی ئازربایجان جەنابی ئاغای حاجی میرزا عەلی شەبستەری.

. سەرۆک وەزیری حکوومەتی میللیی ئازربایجان جەنابی ئاغای سەید جەعفەری پیشەوەری.

. معاونی سەدری فیرقەی مەرکەزیی حیزبی دیموکراتی ئازربایجان ئاغای پادگان.

. وەزیری داخلیەی ئازربایجان دوکتۆر سەلامولڵا جاوید.

. وەزیری فەرهەنگی ئازربایجان ئاغای محەمەد نیریا.

بۆ قایم و مەحکەمکردنی دۆستایەتی کە لە بەینی ئازربایجان و میللەتی کوردستاندا بووە و بۆ پایەداریی صەمیمییەت و دۆستایەتیی زیاتر لە بەینی ئەو دوو میللەتەدا ئەو قەرارانەی خوارەوەیان قەبووڵ کرد و هەردووکیان لەوەدوا لەگەڵ ژیان خۆیان تەبیقی دەکەن.

1. لەو جێگایانەی بەپێویست بزانرێ هەردووک حکوومەتی میللی نوێنەر دەگۆڕنەوە.

2. لە ئازربایجاندا ئەو جێگایانەی کە دانیشتووانی کورد بن کاری ئیداراتی دەوڵەتی بەکوردان دەبێ و هەروەها لە کوردستانیش لەو جێگایانەی کە بەشی زۆری دانیشتوان ئازربایجانی بن لە تەرەف مەئموورانی حکوومەتی میللیی ئازربایجانەوە ئیدارە دەکرێ.

3. بۆ حەل بوونی مەوزووعی ئیقتیصادی لە بەینی هەردووک میللەتان کۆمیسیۆنی تێکەڵاو دادەمەزرێ و قەراری ئەو کۆمیسیۆنە بەکۆششی سەرانی ئەو دوو حکوومەتە ئیجرا دەکرێ.

4. لەکاتی پێویستدا لە بەینی حکوومەتی میللیی ئازربایجان و کوردستان هاوکاریی پێشمەرگەیی دەکرێ و دەبێ ئەوەی لازم بێ بۆ کۆمەکی یەکتری ئەنجام بدرێ.

5. هەر کاتێک پێویست بێ لەگەڵ حکوومەتی تاران قسە بکرێ دەبێ موافیقی نەزەری حکوومەتی میللیی ئازربایجان و کوردستان بێ.

6. حکوومەتی میللیی ئازربایجان بۆ ئەو کوردانەی کە لە خاکەی ئازربایجاندا دەژین تا ئەو ئەندازەی کە بتوانێ بۆ پێشکەوتنی زمان و تەرەقیپێدانی فەرهەنگی میللیی وان هەوڵ بدا. هەروەها حکوومەتی میللیی کوردیش بۆ ئەو ئازربایجانییانەی کە لە خاکی کوردستاندا دەژین بۆ پێشکەوتنی زمان و تەرەقیپێدانی فەرهەنگی میللیی وان ئەو ئەندازەی بتوانێ هەوڵ بدا.

7. هەرکەس بۆ تێکدانی دۆستایەتیی تاریخیی نەتەوەی ئازربایجان و کورد و لە بەین بردنی برایەتی وە دیموکراتیی میللی

وە یا لەکەدارکردنی یەکەتیی وان هەوڵبدا هەردوو لا بەیەك دەست ئەو مورتەکیبانە بەجەزای خۆیان دەگەیەنن." لەژێر ئەم رێککەوتنەدا ئیمزای هەموو ناوبراوان دەبیندرێ.

قازی محەممەد پاش بەستنی ئەم پەیمانە، دەستی کرد بەچالاکی نواندن لە پێناو راکێشانی خێڵان لەبەرئەوەی هەرچەندە ئەو رۆڵێکی گرینگی لەناو شاری مەهابادو دانیشتوانی شاردا دەگێرا، بەلاّم سەرۆکی خێڵان هێندە گوێرایەڵی ئەو نەدەبوون. هەر لەبەر ئەمە بوو سەرەتا کاربەدەستانی بیانی دەیانویست سەید عەبدوڵلاّی گەیلانی بۆ سەرۆکایەتیی کۆماری کوردستان راست بکەنەوە بەلاّم بەهۆی هەوڵدانی بەرێز"فەهیمی"یەوە ئەویان لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندیدا نەگونجاو ئەوەبوو روو لە قازی محەممەد کرا.

قازی محەممەد خێڵ و هۆزێکی نەبوو بەلاّم سوودی لە هەبوونی بارزانییەکان وەرگرت کە مرۆڤگەلێکی شەرکەربوون، بۆ ترساندنی خێلاّنی ئێرانی بەکاری هێنان و دەستی کرد بەدابەشینی چەك و پارە بەناویاندا. ئیتر، تووتن و تۆماکۆی کوردانیدا بەکاربەدەستانی بیانی و لە بەرامبەردا پارە و چەکی وەرگرت. پێناوی ئەم کارەش"ئەسەدۆڤ" بوو کە بەرووالەت دەمراستی بازرگانیی سۆڤیەت بوو لە تاراندا.

قازی محەممەد لە کاتی فەرمانرەوایەتیی خۆی لە مەهاباددا بەکارزانییەکی تایبەتەوە هەڵسوکەوتی کرد، رێگەی نەدا کوشتن و جەردەوانی لەشار روو بدەن و ماڵی هاووڵاتیان بەتالاّن بچێ. ئەمە بووە مایەی ئەوەی لەماوەی دوو ساڵی فەرمانرەوایەتیی ئەودا تەنیا یەك مرۆڤی دانیشتوانی شار بکوژرێو، خەڵك حەزێکی تایبەتی بۆ قازی محەممەد پەیدابکەن. ئەم سیاسەت و کارزانییە وەك لە پێشەکیدا هاتووە، دەوڵەتی ناچار کرد لە سەرەتای گەرانەوەی هێز بۆ مەهاباد بەشێوەیەکی ئاشتی بجووڵێتەوەو، لە دەسبەسەرکردن و گرتنی خەڵکدا خۆی لابدات. سەیر ئەوەیە لە رۆژانی سەرەتادا لیوا هومایۆنیی سەرکردەی هێزگەلی کوردستان لە مەهاباد لە ماڵی قازی محەممەد لایدا و فراڤینی لەگەڵ ئەودا خوارد و باس و خواسێك لەبارەی گرتنی ئەو لە گۆرێدانەبوو.

لەو رۆژانەدا برای قازی محەممەد کە پێوەندییەکی نزیکی لەگەڵ سەرۆك وەزیرانی ئەو کاتە بەرێز ئەحمەد قەوامدا هەبوو لە تاران خەریکی نواندنی چالاکی بوو بۆ ئەوەی بەقسەی خۆی، ئەو بۆندژییەی هەیە لە نێواندا هەڵستێ ودەوڵەت دەست لە دژایەتیی خۆی و خزمەکانی هەڵگرێ، بەهەمان نیاز، سەدری قازی لە تاران بەپەیامنێری رۆژنامەکانی گوت: " من لە رێکوپێکیی بەرێز لیوا هومایۆنی و هەڵسوکەوتی هێزگەلی سوپایی لە کوردستاندا زۆر رازی و خۆشحاڵم، دانیشتوانیش هەر بەهۆی ئەم بارودۆخەیە بەخۆشییەوە خەریکی بەدەستەوەدانی چەکن."

لە رۆژانی هاتنی مەلا مستەفا و چوونی بۆ تاراندا، قازی محەممەدیش گیرا ودەسبەجێ لێتۆژینەوەی لەگەڵدا دەست پێکرا چەند رۆژێ پاشتر، لە تاران بوو بەدەنگ گوایە"لەبەرئەوەی قازی محەممەد هەندێك شتی گوتووە پێویست بێ سەدری قازیش بۆ روونکردنەوە بچێتە مەهاباد، ئیتر ئەویش گیراوە بۆ ئەوەی رەوانەی مەهاباد بکرێ." ئەم رستەیە سەردێری هەواڵی رۆژنامەکانی تاران بوو. بەلاّم راستی شتێکی تر بوو و سەدری قازی لە نێوان ململانەی دوو هێزدا هەڵکەوتبوو. سەرۆك وەزیران کە پێوەندیی تایبەتیی بەبرایانی قازییەوە هەبوو، لە سەرهەڵدانی هەرای کوردستانیشدا بەهەمان شێوەی رووداوی ئازربایجان بێ تەئسیر نەبوو، دەیویست ئەمانەی لەبەر دەستدابێ بۆ پاڵەپەستۆدانی هەندێ لە بەرپرسان لەکاتی پێویستدا. بۆیە حەزی نەدەکرد بگیرێن و سزابدرێن، لەلایەکی ترەوە بەرپرسانی سوپا کە تێدەکۆشان دەسەلاّتی دەوڵەت بەسەر سەرتاسەری کوردستاندا برەوێنن، مانەوەی ئەمانەیان بەلەمپەر لە پێش ئۆپەراسیۆنی خۆیاندا دەزانی.

بەو شێوەیە، کاتێ کاردارانی پۆلیس لە تاران کەوتنە سۆراغی گرتنی سەدری قازی، ئەو خۆی گەیاندە باڵەخانەی وەزارەتی دەرەکی و چووە دیمانەی سەرۆك وەزیران.

بەرێز ئەحمەد قەوام پێی گوتی:" من ئەوەی پێویست بێ بۆ دەربازکردنی ئێوە دەیکەم بەلاّم وا چاترە خۆت بەدەست کاردارانی سوپاییەوە بدەی هەتاکو بۆندژییەکە نەمێنێ."

سەدری قازی گوتی: "گیرانی من و ناردنم بۆ مەهاباد واتە بۆ هەمان بەدارەوەکردنە، کارێ بکە بەڵکو لە تاران نەمبەنە دەرەوە وەهەر لێرە لە دادگە بدرێم."

"بەلاّم،" سەرۆك وەزیران گوتی:" پاڵەپەستۆی بەرپرسانی سوپا زۆرەو ئیتر هیچم لەدەست نایێ!"

سەدری قازی زۆر ناهومێد و بێ هیڤی لە ژوورەکەی ئەوان چووە دەرەوە، بەجۆرێك ورەی بەردابوو کەوا لە سالۆنی ناوەندیی وەزارەتی دەرەکیدا خۆی بەدیوارەوە هەڵپەرسارد هەتاکو نەکەوێتە زەوی ئەو کاتە، یەکێك لە نوێنەرانی دەستی راستی ئەنجوومەنی چواردە خۆی لێ نێزیك کردەوە و گوتی:"کاك سەدر بینیت حیسێبی ئێوە هەڵە بوو و دەوڵەت بەهێزە؟"

سەدری قازی گوتی:"ئەمە من نیم کەشکاوم، ئەمە سیاسەتی سۆڤیەتە لە ئێران دۆراندوویەتی..."

هەرچۆن بێ، سەدر بەترس و لەرزەوە لەگەڵ ئەسکورتێکی(کاروانێکی) سوپایی لە تارانەوە بۆ تەورێز ولەوێشەوە بۆ مەهاباد بردرا، لەوێ لە ژوورێکی بە تەنیایی لە گرتووخانەدا خرایە ژوورەوە. ئەوکاتە، سەیفی قازی و برێکی تر لە هاوەڵانی قازی محەممەدو بنەماڵەکەیان گیرابوون.

لەدادگەدانی گوناحبارانی سەرەکیی وەك محەمەد قازی و سەدری قازی و سەیفی قازی لە دادگەیەکدا کە بەسەرۆکایەتیی بەڕێز عەقید پارسی تەبار، داواکەری گشتی عەقید فەیووزی پێك هاتبوو، دەستی پێکرد، لەو دادگەیەدا و تووێژێکی زۆرکرا، داواکەری گشتی گوتەی گرینگی لەبارەی ناپاکی و گوناحی برایانی قازی و هەڤاڵانی ئەوان خستە روو گوناحبارانیش دەستهاوێژیان لەمەڕ بێ‌وناحی و پێوەندیی خۆیان بەهەندێ لە بەرپرسانی ناوەندییەوە پیشاندا،زۆرقسە و باس هاتنە ئارا، پرسی جیاجیا پێشکێش کران و هەردوو لا پێی گەلێك کەسیان لە بەرپرسانی ناوەکی و دەرەکی کێشایە ناوەوە وبەڵگەو نموونەیان هێنایەوە، تەنانەت ئاماژە بەنەوت و داوای راستەوخۆی دەرەکی و هاتنی هەندێ لە بەرپرسانیش دران. ئەوەی پێویست بێ لە دادگەیەکی مێژوویی سوپایی ئاوەهای سەردەمی شەڕدا رووبدا، روویدا، ئێمە لێرەدا بەکورتی و بەپوختی ئەوەی بواری قسە لەسەرکردنی هەیە و بۆ بڵاوکردنەوە دەشێ، رادەگەینین هەتاکو خوێنەرانی ئێمە لە چۆنیەتیی ئەم دادگە مێژووییە ئاگەداربن.

لەکاتی دانانی دادگە هێشتا شەڕ لەگەڵ بارزانییەکاندا دەستی پێنەکردبوو و دەوڵەت سیاسەتێکی توندی لە مەهاباد نەگرتبووە بەر، بگرە لە ڕێگەی ئاشتییەوە هەنگاوی بەرەوپێش دەهاویشت لەبەرئەوەی هێشتا سەرتاپێی ناوچەکە هێمن نەبووبوو وزۆر لە خێڵان بەتایبەتیش خێڵانی گۆشەی سنووری ئێران و سۆڤیەت و تورکیا چەکدار بوون، بۆیە دەوڵەت نەیدەویست پێش دەسەڵات شکانی خۆی بەسەر بارودۆخدا ترس و سامێك بنوێنێ، لەبەر هەمان هۆ و بۆ ئەوەی دەسەڵاتی مەعنەوی قازی محەمەد لەباربچێ، بێ وچان پاش دانانی دادگەی سوپایی، دەوڵەت زۆرینەی خێڵانی باکوروباشووری بۆ تاران بانگهێشتن کرد و لە ڕۆژی دەیەمی مانگی ڕێبەندان لە تاران لە ڕێوڕەسمێکی بەشان و شکۆدا هەموو سەرۆك خێڵان و پیاوانی ئاین و ماقوولانی کوردستان لە ڕێگەی سەرۆکی ئەرکانی سوپاوە بەخزمەت مەزن ڕێداری پیرۆز شاهەنشا گەیشتن. هەریەکە و بەگوێرەی پلەوپایەی خۆی بەخەڵاتی کوستیلکی ئەڵماس و فەرمانی دادوەری و میدالیە و نیشان و داردەست شانازکران، ئەو کاتە لەگەڵ شانازی پێدانەکەدا هەندێ لە سەرۆك خێڵانی مەنگوڕ و مامەش و ئایندارانی گەورە لە خزمەت پاتشادا داوای لەدارادنی قازی محەمەد و برا و ئامۆزایەکانیان کرد. ئەوە بوو ئەو ئاخاوتنانە لە ڕێگەی ڕۆژنامە و بەلاڤۆکەوە بەناو خێڵاتدا بڵاوکرانەوە. داوەتکراوەکان بەدیتنی داوودەزگای سوپا و یەکەگەل، تواناو دەسەڵات و وزەی دەوڵەتیان زانی بەجۆرێ دوای گەڕانەوەیان جگە لە باسی دژبەریی قازی محەمەد و داوای لەداردانی ئەو، شتێکی تریان نەدەگوت.

پارێزگاری ئازربایجان ئەو کاتە بەڕێز عەلی مەنسوربوو کە پیاوێ‌ی سیاسەتکارو بەوردە و نەرمبوو، بەری لە دەسدرێژی و تۆڵەسێنی و زەبروزەنگی نابەجێ دەگرت و، بۆ دەستەبەرکردنی خۆشگوزەرانی و هێمنیی دانیشتوان هەتا ئەو شوێنەی لە توانایدا بوایە هەنگاوی دەهاویشت.

بەم سەروبەر و کارزانییەوە، لێتۆژینەوە لە قازی محەمەد و برا و ئامۆزایەکانی بەبێ سەرهەڵدانی روداوی ناخۆش یا خۆپێشاندانی ناپەسند، لە مەهاباد دەستی پێکرد، بەجۆرێ قازی محەمەد خۆی لە سێیەمین دانیشتنی لێتۆژینەوەدا گوتی:"من ئێستە هەندێك هیوام بەژیانی خۆم ماوە لەبەرئەوەی دەبینم دەتانەوێ لە دادگەمان بدەن بەلام سەرەتا پێم وابوو بێ پێشەکی دەمانکوژن."

لەبەرئەوەی دادگەی کتوپڕی سەدەمی شەڕ کە لە مەهاباد دامەزرابوو، بەگوێرەی بڕیاری سوپا نەیدەتوانی دانیشتنەکانی خۆی بپسێنێتەوە بۆیە زۆربەی دانیشتنەکان لە سەعات8ی سبەینەوە هەتا نیوەشەو هەندێك جاریش هەتا سێ سەعاتی پاش نیوەشەو درێژەیان دەکێشا.

پاش ئەوەی تۆژینەوە لەگەڵ یەکەیەکەی گوناحباران بەجیا بەکۆتا گەیشت، بۆ راوێژکاریەتی، فایل رەوانەی دادگەکرا و بەگوناحباران گوترا بریکار بۆ خۆیان دیاری بکەن. قازی محەمەد لە کاتی دیاریکردنی بریکاردا چەند ئەفسەرێکی لێوەشاوەو بەتوانای سوپای- وەك زەعیم عەمید ئەسلانی و عەقید مووسا شاقولی"کە ئەو دەمە بەژیان مابوو" بۆ بریکارەتی هەڵبژارد، بەلام پێیان گوت:"پێویستە بریکاری خۆت لە ناو ئەفسەرانی ئامادەی مەهاباد و مۆڵگەی ئەم شارەدا هەڵبژێری نەك لە شوێنانی تر، لەبەرئەوەی کار کۆسپەی تیدەکەوێ و یاساش ڕێگەنادا، دوورنییە تۆ بتەوی لە لەندەن بریکار هەڵبژێری."

قازی محەمەد گوتی: "ئێوەچی بڵێن من وا دەکەم، ئەگەر پێوەندیم بەلەندەنەوە هەبوایە کارم بەم ڕۆژە نەدەگەیشت. زۆرباشە لە ناو ئەم ئەفسەرانەی هەڵدەبژێرم ملم لە موو باریکترە." پاش ئەوە نەقیب شەریف و چەند کەسێکی تر بۆ بریکارەتیی ئەو و سەدری قازی و سەیفی قازی هەڵبژاردران. ڕۆژی نۆزدەی بەفرانبار کە دانیشتن لە پێشتریی گوناحبارانی کۆڵییەوە، محەمەد قازی لە سەعات 8ی بەیانییەوە هەتا سەعات22 واتە لەو ماوەیەش کە دادگە بە ناوی پشووی نانخواردنەوە هەڵدەگیرا، نێزیکەی 14سەعات قسەی کردو کەموکورتیی جۆربەجۆری لە دادگە گرت. قازی محەمەد بەشێوەیەکی گشتی سێ کەموکورتیی لە دادگە گرت، یەکەم: ئەم دادگەیە دەسەڵاتی بڕیاری لە گوناحەکانی ئەودا نییە، لەبەرئەوەی پیاوێکی غەیرە سوپاییە و پێویستە لە دادگەی شارەکیدا، یان لە تاران لە دادگەی سوپاییدا لە ژێر لێکۆڵینەوەدا بێت. دووەم: دادگە کاتێکی تەواوی پێنەدا

بۆ بیرکردنەوە و هەڵبژاردنی بریکار.
سێیەم: ئەوەیە دەبێ گوناحباران بەیەکەوە بۆ پێش دادگە بانگ بکرێن.

دادگە پاش راوێژ هەرسێ رەخنەکانی ئەوەی بەپاش دایەوە. پێشبڕیی یەکەم نابەجێ بوو لەبەرئەوەی دادگە گەلی سوپایی لە شوێنانی پێویستدا بۆ بڕیاردان لە گوناحی کەسانی وەك قازی محەمەد پێك دەهێنرێن و، یاسای سزادانی ئەو کەسانەی لە دژی هێمنیی ولات رادەپەڕن، بەدادگەی سوپایی دەسپێردرێن، بەتایبەتیش ئەوانەی کاری چەکدارانەیان کردبێ. دووەم: لە یاسادا 24 سەعات مۆڵەت بۆ دانانی بریکار و لێکۆڵینەوەی فایل بەگوناحبار دەدرێ، بەلام دادگە بۆ قازی محەمەد و سەدر و سەیفی قازی ئەم مۆڵەتەی هەتا 40سەعات درێژکردەوە، لەبارەی لێتۆژینەوەی بانگهێشتن کردنی تاوانبارانیش بۆ پێش دادگە رایگەیاند کەوا بۆ رێگەگرتن لە رێککەوتنی گوناحبارانە کە هەموویان بەیەکەوە نەهێنراونەتە پێش دادگە. لەبەرئەمە ئەو پێشبڕیانە بەرپەرچ درانەوە و دادگە دەستی بە لە دادگەدان کرد.

لەدادگەدا قازی محەمەد بەشێوەیەکی یەکجارەکی بەرتەکی هەڵسوکەوتی دەوڵەتی ناوەندیی دایەوە و گوتی:"من لەم گۆشە دوور هەڵکەوتەی کوردستان و لەم سووچی گرتووخانەیەوە بۆ دەوڵەتی ناوەندی و کاربەدەستانی بەرپرسیاری جاڕدەدەم و دەڵێم من گوناحبار نیمو ئێوە گوناحبارن. لەبەرئەوەی ئەگەر دەوڵەت لەم چەند ساڵەی دواییدا وزە و دەسەلاتو ویستی ئەوەی هەبوایە هێز بۆ ئەم ناوچەیە بنێرێ و فەرمانڕەوایەتی خۆی بنوێنێ و دەسەلات بەسەر باروودۆخدا بکێشێ ئەوا بیانییان پاڵەپەستۆیان نەدەهێنایە سەر دانیشتوانی بەلەنگازی ئەم دەڤەرە و من ناچار نەدەبووم بۆ پاراستنی گیانی خۆم و بنەماڵەم دەست لەم کارە وەربدەم. من لە لایەنی خۆمەوە ئەوەی پێویست بووبێ لە کاتی خۆیدا بەبەرپرسانی بەرزم گەیاندووەو، سەرۆك وەزیران و تێکڕای بەرپرسانم لە هەلومەرج ئاگەدار کردووەتەوە، ئێوە زۆرداریو بێ رەحمیمان لە دژدا دەکەن، وەك چۆن دەوڵەتی شاهەنشایی، وێڕای ئەوەی کە باڵیۆزخانەی دەرەکی لە تاراندا هەن و لەبەر چاوی نوێنەرانی ولاتانی جیاجیا و بەئاگەداریی هەموو دنیا لەم باروودۆخە، دەوڵەت چەندان جار لە پێش پاڵەپەستۆی سۆڤیەتدا خۆی بەدەستەوە داوە و فەرمانگەلی ئەو دەوڵەتەی راپەڕاندووە، بۆ پارێزگای جۆربەجۆری ولات هێزی نەناردووە و ماڵ و گیان و سامانی خستۆتە بەردەستی رووس، ئێمەش ناچاربووین. منیش کەهێزو وزە و سوپام نەبوو ناچار بووم فەرمانی ئەوان بەجێ بهێنم، بەخوا ناچاربووم، وەڵلاناچار بووم..."

سەدری قازی، بەرگرییەکەی جۆرێکی تر بوو. لەبارەی ئەو شتەی لە خولی نوێنەرایەتیی ئەودا رووی دابوو دەیگوت من پاسەوانەتیم هەبوو و، لەگەڵ کەمینەیەکی پێکهاتوودا هاوکاریم دەکرد، لەبارەی کردەوەکانی ئەم دواییەش دەیگوت من لە تاران بوم و کارێکم نەکردووە، پێویستە من لە دادگایەکی شارەکیدا لە دادگە بدرێم نەك لەم دادگەیەدا.

سەیفی قازیش لەبارەی لەبەرکردنی جلکی جەنەراڵی رۆیشتنی بۆ باکۆ دەیگوت: "حکوومەتی هەرێمایەتیی تەورێز ئەو دەسەلاتەی بەئێمە دابوو و چاوەڕوان بووین دەوڵەتی ناوەندیش بەرەسمی بمانناسێ، پاش ئەوەی سەرۆك وەزیرانیش منی کرد بە قایقامی مەهاباد ئیتر وازم لە لەبەرکردنی جلکی جەنەراڵی هێنا."

بێ بەختیی قازی محەمەد و سەدری قازی و سەیفی قازی لەوەدابوو داوەریی ئەم دادگەیە بە عەقید فەیوزی سپێردرابوو کە سەرۆکی ئەرکانی هێزبوو، لە نێوان ئەندامانی ئەم دادگەیە کەسانی وەك عەقید مزەفەری دەبینران کە بەدرێژاییی ساڵێك لەگەڵ قازی محەمەد و ئەوانیتردا سەری پێوەندییان هەبوو و زانیاریی زۆر قووڵیان لەبارەی چالاکی و ئەو نامانەی بەدەسخەتی خۆی لە دژی دەوڵەتدا نووسیبوونی، لەبەردەستدا هەبوون کە بوواری نکووڵییان بەقازی محەمەد نەدەدا، ئەگەر ئەوان دەیانویست دامەزرانی حیزبی کۆمەڵەی کوردستان و راپەڕینی لایەنگرانی ئەوو سەرجەم کارەکانی تریان بەئەنجامی سیاسەتی بیانییەکان بژمێردرێن و، بەپشت گوێ بخرێن ئەوا دەستهاوێژی تر لەبەر دەستدابوون پێشانیان دەدا کە قازی محەمەد خۆی و سەیفی قازی و سەدری قازی بەئارەزووی خۆیان هەندێ کاریان کردبوو کە رەنگە کاربەدەستانی ولاتانی بیانی بەهیچ جۆر رایان لەسەر نەبووبێ.

بۆ نموونە لە ئازربایجان، هەر چەندە بناغەی حکوومەت بەکۆمۆنیستی دارێژرابوو و ئەم نیازە لەگەڵ بنەڕەتی سوڵتانەتی"پاتشایەتی"دا ناکۆکە، بەلام سەرەڕای ئەمە لە رادیۆی تەورێز و بەلاڤۆکی فیرقەی دیموکراتدا هێرشی توند نەدەکرایە سەر پایەی پاتشایەتی.

بەلام لە مەهاباد بۆ هاندانی خەلك لە دژی پاتشا و بنچینەی سوڵتانەتیدا لە هیچ کارێك نەدەسلەمینەوە. تەنانەت بۆ ئەوەی دانیشتوانی ولاتپارێزی مەهاباد بۆ خۆیان رابکێشن پاتشایان بە"دوژمنی گەلی کورد یاخەڵکی کورد" پێناسە دەکرد. بۆ ئەو مەبەستە ناوبەناو لاوێکیان بەجل و بەرگێکی پڕ لە زێڕ وزیو دەرازاندەوە و هەندێ چەکداریان دەخستە دەوری و هەڕەشەیان لێی دەکرد لەسەرەوەشدا تابلۆیەکیان هەڵدەواسی و لێیان دەنووسی: "بمرێ ئەو کەسەی دژی ئازادی کوردە".

لە لایەکی ترەوە هەندێ نووسینی ئەو کەوتنە دەست کە ئاشکرایان دەکرد ناحەزی سەڵتەنەتی"مەشرووتە"یە و بەچاوی کینە و رك لەسوپا دەڕوانێ. بەتایبەتیش لەم بارەیەوە عەقید فەیوزی کە



پلەی دادوەری دادگەی هەبوو نووسینێکی پیشاندا خوێنی هەموو ئەفسەرانی هێنایە جۆش و هەستی هەموانی هاڕووژاند. ئەو نووسینە نامەیەك بوو قازی محەمەد بۆ ئەرکانی هێزگەلی کوردستانی نووسیبوو. قازی محەمەد لە وەڵامی پرسیاری سەرۆکی ئەرکاندا کە چەند مانگ پێش رووداوانی ئەم رووداوانە ئەوی بۆ گوێڕایەڵی بۆ پاتشا و یاسا بانگ کردبوو و لە دژبەریکردنی سوپای وریادار کردبووەوە، وەڵامیکی بەسووکایەتییەوە بەشێوەی ژێرەوە دابووەوە:

"ئێوە ئەفسەرانی هەمان ئەو سوپایەن لەدەمی شەڕ و کاتی گیان لەسەر دەستیدا ڕێگەی هەڵاتنتان گرتەبەر و، ئەو شیعرەی شاعیری مەزن فیردەوسی-تان بەجێهێنا کە دەڵێ:

همه سریسر پشت بدشمن ئنیم

از ان که خود را بکشتن دهیم

واتە: هەمووومان بەیەکەوە پشت لە دوژمن بکەین چێترە لەوەی خۆمان بەکوشتن بدەین" ئاشکرایە ئەم جۆرە کار و نووسینە دوور لە ڕێزە بۆ بەرپرسانی سوپا بەهیچ بارتێك لە بیر نەدەکرا و نەیدەتوانی لە سزا رزگاری بکات.

دادوەر جگە لە پێشاندانی دەستهاوێژی پێویست بەدادگە، ئاماژەی بەو گەشتەی خۆی داکە لە سەردەمی سەرۆك کۆمارەتیی قازی محەمەددا بۆ مەهاباد کردبووی و گوتی:"قازی محەمەد نەك تەنێ سووکایەتیی بەسوپا دەکرد بگرە لە سەردانی ڕۆژی حەوتی گەلاوێژ و یەکی رەزبەر و بیست ویەکی گەلاڕێزاندا کە بۆ مەهاباد کردم هەڕەشەی لێ کردم و گوتی: "بەم زووانە هێرش دەکەمە سەر هێزگەلی میری، سەقز وسنە و کرماشانیش دەگرم." لە سەردانی حەوتی گەلاوێژدا لەبەر چاوی من بەجلکی جەنەراڵییەوە خۆنواندنی بەهێزەکانی خۆی کرد."

قازی محەمەد و سەیفی قازی چوونی باکۆیان نکووڵی کرد بەڵام دەستهاوێژی گرنگ بەدەستەوە هەبوون و خرانە بەرچاوی دادگە، ناچار هەردووك دانیان پێدا هێنا و لە ئەنجامدا دەرکەوت قازی محەمەد خۆی دووجار چووەتە باکۆ. گرینگتر لە هەمووی ئەوە دەرکەوت ئاڵای سێ ڕەنگیی شمشێر وڕۆژ کە جێگەی ڕێز و سەردانواندنی گشتییە، ئەو گۆڕیویەتی، ڕەنگی سووری بردووەتە سەرەوە و کەسکی هێناوەتە خوارەوە، لەجێگەی شمشێر و رۆژدا "ئارم"ی کۆماری کوردستانی کێشاوە.

بریکاری بەرگریکەری قازی محەمەد گوتی:"لە یاسای بنەڕەتیدا شتێك لەبارەی شوێنی ڕەنگەکانەوە نەگوتراوە."

دادوەر وەڵامی دایەوە:"ئەگەرچی شوێنی ڕەنگەکان دیاری نەکراوە بەڵام گۆڕینیشی پێشبینی نەکراوە. وێڕای ئەمە ئەگەر لە گۆڕینی ڕەنگەکانیشدا چاوپۆشی بکرێ ئەوا گۆڕینی(ئارم- دروشم)ی میللی کە شمشێر و ڕۆژە ناشێ نەبینرێ."

لە بارەی کردەوەکانی سەدری قازیشەوە، بەقسەی دادوەر ئاشکرابوو کەوا ڕۆژی شازدەی سەرماوەز ئەو لە مزگەوتی

عەباسی لە مەهاباد ئاخاوتنێکی داوە و خەڵکی بۆ ململانەی هێزگەلی میری هان داوە و گوتوویەتی:" دەوڵەت ناتوانێ لە هەردوو بەرەی ئازربایجان و کوردستاندا شەڕبکات. من نێزیکەی سێ ساڵ لە تاران ماوم و چاك شارەزای وزەی سەرباز و ئەفسەر و ئەفسەرانی پۆلم، دەوڵەت لە سەردەشت و سەقز و تکاودا هێزی نییە، ئێمە بەیارمەتیی (فیدائیانی دیموکرات)ەوە دەتوانین هێزی دەوڵە ت تەفروتوونا بکەین. جاران پەلێك لە خێڵان دەیتوانی ماوەیەکی زۆر لە پێش هێزگەلی دەوڵەتدا بووەستێتەوە، ئێستە ئێوە لەوان کەمترنین. نابێ بترسن، دەبێ شەڕ بکەن و لە بەرامبەری دوژمندا بووەستن."

دەستهاوێژی تر هەبوون پێشانیان دەدا قازی محەمەد دوو رۆژ پێش گەڕانەوەی هێز هەشت هەزار ریاڵی لە دارایی بۆکان وەرگرتبوو. جگە لەم کارانە، گوناحێکی لێ خۆش نەبووی تری قازی محەمەد لەبەرچاوی سوپاییەکان ئەوەبوو، بۆ هاوکاری لە محەمەد رەشیدی گیرابووەوە. لە گەڕانەوەی لیوا هومایوونیش لە بیست و دووی مانگی سەرماوەرز مەرجی ئاگربری بەجێ نەهێنابوو و بارزانییەکانی چەکدار کردبوو و مۆڵگەشی تالان و برۆکردبوو...

لە بارەی سەیفی قازیشەوە زۆر بەڵگە بەدەستی سەرکردایەتیی هێزگەلی کوردستانەوە هەبوون، بۆ نموونە لە مێژووی شەشەمی مانگی خەرماناندا پەنجا قوتابیی بۆ تەواوکردنی خولی کۆلێجی سوپای سۆڤیەتی ناردبووە تەورێز بۆ ئەوەی لەوێوە رەوانەی باکۆ بکرێن.

لەو رۆژانەدا"حاجی بابە شێخ"ی سەرۆك وەزیرانی قازی محەمەد کە پیرە پیاوێکی دڵنەرم و دوورزەین بوو، ئازادبوو رۆژێکیان نووسەر لەگەڵ رائید دوکتۆر خەمسە سەفا کە یەکێك بوو لە نۆشدارانی لێوەشاوە و ئەو دەمە کیژی حاجی بابە شیخی چارەسەر دەکرد، هەروەها ملازم دوکتۆر عەزیمی کە ماوەیەك لە لای بارزانییەکاندا دیلبوو، بەیەکەوە چووین بۆ لای حاجی بابە شێخ ئەو کە ئاگەداری سەرلەبەری چالاکییە سیاسییەکانی قازی محەمەد بوو دەیگوت:

"پاش مانگی گەلاوێژ بیانییەکان هەندێ لە سەرۆکانی کوردیان- لەمانەیش قازی محەمەد، بەرەو لای چۆمی ئاراسبرد، هێند بەپەلە بوون لە ماوەی بیست و یك سەعاتدا ئێمەیان لە سەقزەوە گەیاندە جەلفا و لەوێشەوە بردیانینە باکۆ. لە باکۆ لەگەڵ گەلێك لە جەنەراڵەکانی رووس کە نەماندەناسین دیمانەمان کرد، هەتا ئەوەی یەکێکیان کە خۆی بەناوی"ئاتاکیشۆڤ"ەوە بەئێمە ناساند، دیمانەیەکی دوور و درێژی لەگەڵدا کردین و هەر شە و گورەشەی دەکرد کە دەبێ فەرمانەکانی جێبەجێ بکەین." حاجی بابە شێخ دەیگوت:"ئێمە بەهیچ رووێك ئامادەی قەبووڵ کردنی فەرمانەکانی ئەوان نەبووین بەڕادەیەك قازی محەمەد پێوەبوو خۆی دەرمانخوار بکات. پاش ئەوەی پازدە رۆژ لەوێ ماینەوە ئینجا گەڕاینەوە مەهاباد." حاجی بابە شێخ دەیگوت:"من بەگەلێك شێوە راپۆرتی ئەم رووداوانەم بەکاربەدەستانی دەوڵەت راگەیاند و جاری دووەم خۆم لە چوونی باکۆ بەتەواوی بەدەستەوە نەدا." ئەو دەیگوت:"قازی محەمەد دوو جار و سەیفی قازی سێ جار چوونەتە باکۆ لەم گۆڕانانەی دواییشدا ئەو دەمەی دەوڵەت جاڕیدا کەوا دەیەوێ بۆ جێبەجێ کردنی هەڵبژاردن هێز بنێرێتە ئازربایجان، من بەقازی محەمەدم گوت وا چاکترە ئێمەش بروسکە بکەین بۆ ئەوەی هێزبێت. ئەویش رازی بوو بەلام ئەسەدۆڤ کە"کل فی کل" بوو بە جۆرێك دەستی بەسەرماندا کێشا نەیهێشت هیچ بکەین." حاجی بابە شێخ دەیگوت:" بەپێچەوانەی نواندنی بیانییەکان ئێمە هەرگیز نەمانتوانی لەگەڵ فیرقەی دیموکراتدا هەڵبکەین، لەبەرئەوەی ئەوان دەیانگوت دەبێ ئێوە سەر بەتەورێزبن لە کاتێکدا ئێمە دژ بووین و دەمانگوت پاش ئەم هەموو بەزم و هەرایە ئەگەر بویستری ئێمە گوێ بەفەرمانی تەورێز بین، ئەوا وەك جاران سەر بەتاران دەبین."

هەرچۆنێك بێ بەگوێرەی ئەو دەستهاوێژانەی بەدەستەوە بوون و ئەو قسانەی لەناو دادگەداکران، لە دوادوای دانیشتنێکی نهێنی کە زیاتر لە 18سەعات درێژەی کێشا، لە بەرەودواهاتنی مانگی بەفرانبار بەپێی بۆچوونی دادگەی کتوپڕی سوپایی، قازی محەمەدی موفتیی مەهاباد، سەدری قازی"سەدرولئیسلام" نوێنەری پێشووی ئەنجوومەنی راوێژی میللی و، سەیفی قازی"سەیفولئیسلام"، فەرمانی لەداردانیان بۆ دەرچوو، بۆ جێبەجێ کردن، بەرپرسیارانی سوپایی لە تاران لە بۆچوونی دادگە ئاگەدارکرانەوە، بەلام لەبەرئەوەی لێرەولەوێ قسەوباس لەمەر رەچاوکردنی زرووفی تاوانبارانەوە دەکرا، لە لایەکی ترەوەش بەهۆی ئەوەی هێشتا شەڕ لەگەڵ بارزانییەکاندا دەستی پێ نەکردبوو، دەوڵەت نەیدەویست لەناو ئەو وتووێژە ئاشتیخوازانەیەدا ئەم جۆرە کارە تیژانە لە خۆیدا بنوێنێ بۆیە جێبەجێ کردنی فەرمانەکە بەدوا خرا هەتا ئەو جۆرەکارە تیژانە لە خۆیدا بنوێنێ. بۆیە جێبەجێ کردنی فەرمانەکە بەدواخرا هەتا ئەو کاتەی دادگەیەکی تر بەسەرۆکایەتیی بەڕێز عەقید نەجاتوڵلا زەرغامی بەتایبەتی لە تارانەوە بۆ بڕیاردان چووە مەهاباد، لەبەرئەوەی هیچ تێبینییەکی سیاسی و سەرنجێکی تر نەمابوو بۆیە فەرمانی ئەم دادگە نوێیەش فەرمانی لەداردانی تاوانبارانی وەك دادگەی پێشوو دەرکردەوە، لە شەوی دەیەمی مانگی ئاخەلێوەدا فەرمانەکە جێبەجێ کرا و قازی محەمەد و سەدری قازی و سەیفی قازی بەداری سزاوە هەڵواسران، قازی محەمەد زۆر رەماو و بێدەسەڵات بووبوو، سەدری قازیش رەنگی هەڵبزرکابوو بەلام دەیویست پتەویی خۆی بپارێزێ بەلام سەیفی قازی بەلەشی تێکسمراویەوە وەك بێئاگا سەرنجی ترساوی بەملاو بەولادا دەگێڕا ولە دووەکەی تر زیاتر دڵەڕاوکەی پێوە دیاربوو.

سێ سەعات لە نیوەشەو تێپەڕی کردبوو گوناحباران هێنرانە بەر پێیدار لەسەر بان و باڵەخانەکانی مەهاباددا برێن داندرابوون قازی محەممەد سەرەتا نوێژی کرد و پاڕایەوە گوتی: "سەدری بێ گوناحە، خوێنی خۆمتان پێ حەڵاڵ دەکەم برایەکەم ئازادکەن." لە دادگەشدا ئەو هەر کنەی دەکرد بۆ ئەوەی بێوەری بوونی سەدر پیشان بدات پاشی ئەو، دووکەسەکەی تریش بەدارەوە کران سەدری قازی سەرسەرماویی پیشان دەدا و تکای لێبوردنی دەکرد و واش پێ دەچوو کە بەڕاستی خۆی بە بێگوناح بزانێ.

هەرچۆنبێ، لە ئەنجامی لە ڕێ لادان و پاڵەپەستۆی سیاسەتی دەرەکی، یەکێک لە گرینگترین و دەوڵەمەندترین بنەماڵەکانی کوردستان لەداردران.

نێزیکەی دوو مانگ پاش ئەوە، کاتێ مەزن ڕێزداری پیرۆز تەشریفی بۆ مەهاباد برد، ئافرەتێکی ڕەشپۆش پێچەدار خۆی گەیاندە پاتشاو نامەیەکی پێشکێش کرد مەزن ڕێداری شا فەرمووی: "ئەم ئافرەتە کێیە؟" عەرزیان کرد"ژنی قازی محەممەدە!" هەستێکی جۆراوجۆر بەشای لاودا سەری کرد، کەس تێ نەگەیشت چ هزرێک لەو کاتەدا بەبیری شای ئێراندا رابورد، مەزن ڕێزداری پیرۆز چەند ترووکەیەک چاوی داخست، پاشان فەرمووی: "هەقتان بەسەر ماڵی ئەمانەوە نەبێ و چاوتان لە پاشماوەکانیان بێ."

### سەرچاوە

لە مهابادی خوێناوییەوە بۆ لێوارەکانی ئاراس وەرگێڕانی: شەوکەتی شێخ یەزدین، چاپی یەکەم 2001، لە بلاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس.



# چاوپێکەوتنەکانی قازی محەمەد و کاربەدەستانی ئێران

حسێنی مەدەنی




ماوەی سێ مانگێك قازی محەممەد و هاوڕێکانی لەتاران گیرابوون، دەوڵەت لێیان بەگومان بوو، لای وابوو هەرچی لە باکووری کوردستان قەوماوە، هەمووی لەبن سەری ئەو چەند کەسە دایە، لەو ماوەیەی کە لەوێ بوون ژمارەیەك لە شەخسییاتی پایەبەرز بەنۆرە چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا پێکهێنان، دەیان دۆزین، تا بزانن دروشمی دامەزراندنی کوردستانی سەربەخۆ تاکوێ راستەو لەچ شوێنێکەوە هانی کورد دەدرێ و پشتیوانی لێدەکرێ، بەڵام، "قازی محەممەد" هەموو جارێ بە وەڵامی حەکیمانە تەوژمی شەپۆل ئاسای هێرشە سیاسییەکانی لەسەر خۆی هێور دەکردەوەو، شتێکی لێهەڵنەدەکرا بەکاریان بێ.

یەکەم جار ئاغای ساعید سەرۆك وەزیربوو کە چاوی پێکەوتن "ساعید" بە قازی محەممەدی گوتبوو:

"کوردەکان چونکە نیازی دروست کردنی کوردستانێکی سەربەخۆیان هەیە، بۆیە حازر نین دامودەزگاکانی حکوومەتی بپارێزن کەسیش وەخۆناگرن و هەر لەبەر ئەوەشە ژێنراڵ ئەفشاری هوشمەند وەدەردەنێن".

"قازی محەممەد" لە وەڵامدا ئەو هەواڵەی وەدرۆ خستۆتەوە، لە جوابی قسەکانی "ساعید" دا دەڵێ:

"دەوڵەتی ئێران هیچ بایەخێك بە کوردستان نادا، نایەوێ گیروگرفتی تەندروستی و پەروەردەیی کوردستان چارەسەر بکات، بۆیە خەڵکیش لە دەوڵەت نارازین".

جارێ دووهەم دیداریان لەگەڵ "حەمەرەزاشا" بۆ پێك هێنان چاوپێکەوتنەکە لە رۆژێك دابوو کە، حەمەرەزاشا میدال و خەلاتی لە سینگی ئەفسەران قایم دەکرد. حەمە رەزاشا لە کانی خەلات بەخشینەوەدا رووی لە"قازی محەممەد" و هاوڕێکانی کرد، گوتی:

"ئەو ئەفسەرانە برای ئێوەن لێیان نزیك ببنەوەو پێکەوە خزمەتی وڵات بکەن".

"قازی محەممەد"یش لەجوابی شادا دەڵێ:

"بەپێی باوەڕی ئایینی ئێمەی کورد سوننی مەزهەبە، بەگوێرەی یاسای ئایینی ئێمە، خەڵك دەبێ خزمەتی پادشای خۆی بکا، ئێمە لە رووی یاسای ئایینی‌مانەوە، هەموو کاتێك بەرامبەر بە شاهەنشای خاوەن شکۆ وەفادار ماوینەوە".

وەزیری جەنگ لە چاوپێکەوتنێك دابە"قازی محەممەد"ی گوتبوو:

"بەپێی دەنگ وباس، کوردەکان دەیانەوێ کوردستانێکی سەربەخۆ دامەزرێنن، رۆژنامەیەکی نهێنی لە کوردستان، بیروڕای سەربەخۆیی بۆ کوردەکان بلاودەکاتەوە، بۆچی سەرکردەکانی کورد دژی گەڕانەوەی سوڵتەی ئەرتەشی ئێران بۆ کوردستانن؟".

"قازی محەممەد" بەم جۆرە وەڵام دەداتەوە:

"ئێمە دژی سوڵتەی ئەرتەشی ئێران نین، ئەوە فەرماندەرانی ئەرتەشی ئێرانن هەڕەشە لە کورد دەکەن، ژێنراڵ هوشمەند بەئاشکرا رایگەیاندوە تۆڵەی خۆی لە کوردە مەهابادییەکان بەرووخان و کاول کردنی ئەو شارە دەکاتەوە، ئەگەر نەیتوانی نێوی خۆی دەگۆڕێ، دەوڵەتی ئێران لە جیاتی هەڕەشە کردن و بەکارهێنانی تانك باشترە بە بەشی تەندروستیو فەرهەنگیی کوردستان رابگا".



از راست به چپ : ۱- میرزا خلیل فتاح قاضی ۲- حاج عبدالرحیم جوانمرد قاضی ۳ - میرزا محمود منصور قاضی ۴ - عبدالرحمان ملقب به سالار موکری ۵ - محسن مجاهدی پسر میرزا فتاح قاضی ۶ - میرزا قاسم قادری قاضی ۷ - محمد فیروزی قاضی



نشسته از چپ به راست (علما) : ۱- قاضی منعم ۲- قاضی علی ۳- سیف القضات ۴- صدر العلما ۵- ملا عبدالله مدرسی ( ظاهرا)

"رەزمئارا" ش کاتێك "قازی محەممەد" و "سەدری قازی" بانگێشت دەکا، پێیان دەڵێ:

"ئێوە وەك نیشتمانپەروەری راستەقینە ناجووڵێنەوە و لە بەرژەوەندیی بێگانەکاندا ئیش دەکەن".

"قازی محەممەد" لە جوابدا دەڵێ:

"من موسوڵمانم و دەتوانم بڵێم بە جەددو ئابادیشمانەوە هەر ئێرانی بووین و لە ئێرانیش لە دایك بووین، کەس بۆی نیە شك لە ئێرانی بوونەکەماندا بکا، بەڵام ئەگەر ئێوە بە قسەی هوشمەند، ئێمەی کورد بە خۆفرۆش دەزانن، داوا دەکەین ئیسپاتی کەن هوشمەند بەچی دەتوانێت ئێرانی بوونی خۆی بسەلمێنێت، ئێمە لە ئێرانی بوون و کەسایەتیی ئەو کابرایەدا بەشکین".

شا بۆجاری دووهەم چاوی بە "قازی محەممەد" کەوت، ئەمجار زۆر بەوردی وتوویژی لەگەڵدا کرد لەسەر رووداوەکانی کوردستان و بیروڕای کوردان و جیاکردنەوەی کوردستان لە ئێران و دروست کردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردستان پرسیاری لێکرد، دوای ئامۆژگاری کردنی داوای لێکرد خۆی لە فەرماندەرانی ئەرتەش نزیك بکاتەوەو گوێرایەڵی ئامۆژگارییەکانیان بێت "قازی محەممەد" لەجوابی ئەو قسانەدا بە شای گوت: "ئێمە بەرێزەوە سەیری کاربەدەستانی سپای ئێران دەکەین، بەڵام ئێمە تەنیا لەگەڵ هوشمەند ناکۆکیمان هەیە و لێینارازین، چونکە سیاسەتێکی غەڵەتی بەرامبەر بە کوردان هەیە".

"قازی محەممەد" لەگەڵ رەئیسی ستادی ئەرتەشیش "سەرلەشکر حەسەنی ئەرفەع" بە دووروودرێژی، بەڵام بە لەونێکی دیکە لەسەر مەسەلەی کوردستان دواوە بە "ارفع"ی گوتبوو، پێویستە دەوڵەتی ئێران باروودۆخی تایبەتیی کوردستان وەبەرچاو گرێ و مافی نەتەوایەتیی خەڵکی کوردستان بسەلمێنێ، کوردەکانیش ئامادەن بۆ پێشکەوتنی هەموو ئێران هاوکاریی دەوڵەت بکەن.

"قازی محەممەد" زۆر روون و ئاشکرا لەسەر گیرو گرفتەکانی رابردوو گلەیی کردو گەندەڵی و بێکیفایەتیی دامودەزگای ئیدارەکانی دەوڵەتی لە کوردستاندا بۆ خستەروو و داوای لێکرد بەرێوەبەرایەتیی ئیداراتی دەوڵەتی بە خودی کوردەکان بسپێرن.

کاتێك هەواڵی گرتنی شارەبانیی مەهاباد بەتاران گەیشت، ماوەی دەسبەسەریی "قازی محەممەد" و هاورێکانی دوایی هات دەوڵەت بە "قازی محەممەد"ی سپارد، دەسبەجێ بگەرێتەوە مەهاباد، نەیەڵێ جارێکی دیکە ئەوجۆرە رووداوانە دووپات ببنەوە.

"قازی محەممەد" لەنێو پێشوازییەکی گەرم و کەم وێنەی خەڵکدا گەیشتەوە مەهاباد، وەزعی شڵەژاوی شار خێرا هێور بۆوە ئیداراتی دەوڵەتی کارەکانیان دەست پێکردەوە مەسەلەی گرتنی شارەبانی رەنگێکی دیکەی بەخۆوە گرت پیاو ماقووڵانی شاری مەهاباد لە تێلگرافێکدا کە بۆ مەرکەزیان بەرێکرد، رووداوەکەیان بە شتێکی بچووك لە قەڵەمداو رایانگەیاند رووداوەکە هیچ مەبەستێکی سیاسی تێدانەبووە، بۆ ئەوەی قەزیەکە دیزەبەدەرخونە بکەن، حوسێنی زێرینگەریان لێدەرهاویشت و هەموو دیزەو گۆزەکانیان دەسەری عەزیزخانیدا شکاند، ئەمەش دەقی تێلگرافەکەیە:

لە سەندووس جەنابی سەرۆك وەزیر، وەزارەتی کیشوەر، وێنە جەنابی ئاغای

فەهیمی وەزیری موشاویر، وێنە ئاغای سەدری قازی نوێنەری شارستانی مەهاباد، وێنە رۆژنامەی کوهستان.

ئەو راپۆرتانەی لەسەر رووداوی ئەم دواییيانەی مەهاباد بۆ مەرکەز بەڕێ کراون، هیچ کامیان راست نین رووداوەکە بەم شێوەبووە لە رۆژی26ی رێبەندان دا جەماعەتێك لە خەڵکی مەهابادو هێندێك شوێنی دیکە کە عەزیزخان رێکی خستبوون، خۆپێشاندانێکیان ساز کرد چەند ئاژاوەگێرێك بە مەبەستی لەبەین بردنی پەروەندەی قەندو شەکرو چا کە دەغەڵی‌یان تێدا کرابوو و ناعادلانە دایان بەشێبوونەوەو لە شارەبانی راگیرابوون، خۆپێشاندانەکە دەکێشنە خەیابانی پەهلەوی، پاسەبانێك بۆ بلاوە پێکردنیان تەقە دەکا، عەولا نێوێك دەکوژرێ، خەراپکاران بیانوویان دەکەوێتە دەست، هێرش دەبەنەسەر شارەبانی، شەرو تەقە ساز دەبێ، پەروەندەکان لەبەین دەبەن، دوایی لەلایەن رێزدارانی مەهاباد و چەند کەسێك لە ئاغاوەتی مەنگوڕ ومامەش و ئیدیکە، بلاوە بەجەماعەتەکە دەکەن و شارەکە ئەمین دەکەنەوە.

شاری مەهاباد کە سێ ساڵە بەخەرج و بەرجێکی زۆر ودانانی کێشك، بێ ئەوە لە هیچ شوێنێکڕا یارمەتیی بدرێ، لێبڕاوانە پارێزگاریيان لە خۆیان و مەئمووڕانی دەوڵەت کردووە بەرامبەربە قانوون و دەستووراتی دەوڵەت فەرمانبەری وەفاداری خۆیان سەلماندوە، بەو حاڵەش پێیان وایە رووداوەکە لەبن سەری وان دابووە ئێستا گشت خەڵك لەو رووداوە بەداخن و ئامادەی ئەمرو فەرمانن، پێویستە عەرزتان بکەین، ئەگەر قازی محەممەد لەودەمیدا لە مەهاباد بایە، ئەو رووداوە نەدەقەوما بەدوای گەڕانەوەی ناوبراو شار بەتەواوی ئارام بۆتەوە، نیگەرانیی‌یەك لە گۆڕێدا نەماوە، قەزیەکەمان چۆن دیتووە عەرزمان کردن، بەوتەی رۆژنامەی کەیوان، تۆ بلێی لەبنەوە کەس دەستی لەوکارەدا نەبووبێ، تا ئێستاش بۆمان روون نەبۆتەوە: حسن محمدی، مصطفی داودی، علی حسینی، رەحمت شافعی مدرس(مدرسی) صالح زادە، مفتی، کریم خسروی، ابراهیمیان، احمد الهی، عبدالهی، احمد حسینی، حبیب داودی، محمد حسینی، عبدالله حکیم زادە، داودی، قادر، مصطفی سلطانیان، عزیز صدیقی، غفور محمودیان، محمد امین شریفی (شەرەفی)، عبد الرحیم".

## سەرچاوە

کوردستان و ستراتیژیی دەوڵەتان، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم. ئاپریلی 2001.



# رۆژهەڵاتی کوردستان

حسێنی مەددەنی

دەوڵەت کاری "هەڵبژاردن" و گرتنەوەی ئازەربایجان و کوردستانی شمالی تێك بەستبوو، لەسەرەتای پاییزی1325ی هەتاویدا ئەم سناریۆیە دەستی پێکرد، رۆژی14ی رەزبەری1325ی هەتاوی، (ئۆکتۆبری1946ی زایینی) شا دەستووری هەڵبژاردنی خولی15ی مەجلیسی شوورای میللی دەرکرد، سەرۆك وەزیریش رۆژی17ی سەرماوەزی بۆ هەڵبژاردنەکە دیاری کرد حیزبی دیموکراتی کوردستان و فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان و حیزبی سۆسیالیست و حیزبی جەنگەڵ(اجتماعیون) چوار قۆڵی سازابوون و لەنێو بەرەی ئەحزابی ئازادیخوازدا کۆببوونەوە مەبەستیان دابینکردنی ئازادی و دیموکراسیی سەرانسەری و پێکهێنانی باسکێکی بەهێز لەنێو مەجلیسی شوورای میللی بوو.

کۆمیتەی مەرکەزیی حیزبی دیموکراتی کوردستان بەبۆنەی یەکگرتوویی ئەحزابی ئازادیخواز تێلگرافێکی بەرێکرد، ئەمەش دەقی تێلگرافەکەیە:

### تێلگرافی حیزبی دیموکراتی کوردستان

بەبۆنەی یەکگرتنی شەش لایەنی ئەحزابی ئازادیخواز کە حیزبی دیموکرات بەشانازیی لە ریزی ئەو یەکگرتنەدایە پیرۆزبایی خۆمان پێشکێش دەکەین و بە شانازیی دەزانین کە(حیزبی ئێمە) دەستی دەناو دەستی زۆربەی هاونیشمانان ناوە و یەکیان گرتووە و دەتوانێ شانبەشانیان لەرێی ئازادیی ئێرانی خۆشەویستدا لە خۆبوردووانە تێبکۆشێ بە هۆی ئەوە کە شەش مانگە"ارتجاع" بە بۆمب و تانك و تۆپان دای گرتووین و سەرقاڵی خەباتێکی خوێناوی بووین، پێشتر دەرفەتمان نەبوو لەسەر هاوکاریمان بۆ ئازادیی هاونیشتمانانی ئازادیخواز پێکەوە راوێژ بکەین. داوای لێبوردن دەکەین، هیوادارین لەمەودوا لەقەدەر توانامان دەرحەق بەم رێککەوتنە کە بۆ برەوپێدانی ئازادیی وڵاتە خۆشەویستەکەمانە لێهاتوویی تەواو نیشان بدەین و بۆ بن برکردنی(ارتجاع) دەورێکی گرینگ بگێڕین".

لە لایەن کۆمیتەی مەرکەزی

حیزبی دیموکراتی کوردستان- کەریمی

دەوڵەت دەیزانی هەر هەڵبژاردنێك کە لە بێ دەسەڵاتیی دەوڵەتدا لە ئازربایجان و کوردستان بەڕێوەبچێ، دەیدۆڕێنێ، ئەوە هەر دەوڵەت نەبوو لە ئاکامی هەڵبژاردنەکە دەترسا، زانایانی ئایینیش نیگەران بوون، بەنەزەری ئەوانیش دەوڵەت مادام لە هێزی ئازەربایجان و کوردستان دانەبەزی باو هەوساری دەسەڵاتی بەدەستەوە نەگرتبا، نەزەریان وابوو هەڵبژاردنەکە وەدوابخرێ هێندێکیش دەیانگوت ئازەربایجان و کوردستان لە هەڵبژاردنەکە دەرباوێژرێن باشترە.

حەمە رەزاشا لە کتێبی"پاسخ به تاریخ"دا نووسیویەتی:

"زۆربەی فەرماندەرانی نیزامیی ئێران، بێجگە لە سوپەهبود حاجیعلی ڕەزمئارا رەئیسی ستادی ئەرتەش لە ترسی دەخاڵەتی نیزامیی سۆڤیەت لە ئێران، رازی نەبوون ئەرتەش بۆ گرتنەوەی ئازەربایجان و کوردستان و وەخۆ بکەوێ، ئەوەش لە حاڵێکدا بوو کە تەداروکاتی نیزامیی ئازەربایجان و کوردستان کامڵ نەبووەو ئەوکەسانەی بۆ پەروەردەکردن لەبەشی هێزی زرەهیی و هێزی هەوایی بۆ رووسیا نێردرابوون هێشتا ساڵێکیان مابوو بگەڕێنەوە ئێران"

"قوام السلطنه" لەوە دڵنیا بوو کە سۆڤیەتییەکان قازانجی خۆیان لە هەڵبژاردندا دەبینن، پێیوابوو دەوڵەت هەرکارێکی بۆ وەرێخستنی هەڵبژاردنەکەی بکا، سۆڤیەت جوایە جەنگیی ناکا. سەرۆك وەزیر رۆژی14ی خەزەڵوەر رایگەیاندبوو، هەڵبژاردنی ئازەربایجان لەژێر چاوەدێریدا ڕادەگرێ و لەکاتی هەڵبژاردندا نەزم و ئاسایشی مەڵبەندەکە دەپارێزرێ بۆ ئەو کارەش دەوڵەت بەنیازە هەیئەتی بازرەسی بەهێزی نیزامییەوە رەوانەی ئازەربایجان بکا. دەوڵەت ئەم خەبەرەشی بە سەفیری ئینگلس راگەیاند و گوتی هەر بەربەرەکانی و بەرهەڵستێکی بەرامبەر ئەو قشوونە بکرێت بەتوندی سەرکوتی دەکات"جورج ئالن" سەفیری ئەمریکا وێرای پشتیوانی لەبریاری دەوڵەتی ئێران رۆژ(27ی نوامبر) رەسمەن رای گەیاند:

"سیاسەتی دەوڵەتی ئەمریکا بەرامبەر بە پاراستنی سەربەخۆیی حکومەتی ئێران روون و ئاشکرایە... بریاری دەوڵەتی ئێران لەسەر ناردنی هێزی ئەمنییەتی بۆ سەرانسەری وڵات بەتایبەتی بۆ ئەو شوێنانەی لە ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتی ئێراندا نەماون و هەروەها گەڕاندنەوەی نەزم و ئاسایش کارێکی ئاسایی و بەجێیە."

سەرانی فیرقە رایانگەیاندبوو لەبەرامبەر پێشرەویی هێزی نیزامیی دەوڵەتدا بەرگری دەکەن، ئەرتەشی ئێران هێرشی چارەنووسسازی خۆی لەسەرەتای سەرماوەزی1325دا بۆسەر ئازەربایجان

دەست پێکرد، "قوام السلطنه" بۆخۆدزینەوە لە پرسیار و وەڵامی خاریجییەکان لە ئوستانی گەیلان خۆی مەڵاسدا. ئەرتەش رۆژی 2ی سەرماوەز لە پەلامارێکی کوتوپڕدا بۆسەر فیداییەکانی فیرقە لە زەنجان، دەستی بەسەر هەموو ئیداراتی دەوڵەتی ئەو شارە داگرت، کۆنسولی ئەمریکا لە تەورێز گوتی:

"... بەو زەبرە سەنگەری دیموکراتەکان تێکڕووخا، لێرە بۆ یەکەم جار لە ماڵی خۆیان شکستیان خوارد."

کۆمیتەی ناوەندیی فیرقەی دیموکرات لەبەرامبەر ئەو وەزعە نائاساییەدا رۆژی16ی سەرماوەز ئیعلانی شەڕیدا پیشەوەری هەڕەشەی لە"قوام" کرد":

"گەمە بە ئاگر نەکات چونکە خەڵکەکەمان سوێندیان خواردووە، بە هەموو توانـاوە ئازادییەکانیان بپارێزن... بە سوێندەکەمان وەفادار ماوینەوە، ئەوانەی دەیانەوێ بە نووکی سەرنێزە ئازادیمان لێ بستێنن هەر کەس بێ بەهێزی باسکی خەڵک سەرکوتی دەکەین و بەرەو دوایەی دەگێڕینەوە ئەمەش ئاخرین قسەمانە"ئول ْمك وار دونمك يوخ! مردن بەڵێ گەڕانەوە نا...

زۆر زوو دەرکەوت هەڕەشەو گوڕەشەی پێشەوەری، دەهۆڵ کوتانێکی خۆڕایی بوو، ئازەربایجانییەکان بە قسەی سەرانی فیرقە نەهاتنە مەیدان، فیداییەکان ورەیان بەردا، رۆژی20ی سەرماوەز فیرقەی ئازەربایجان بە بێ بەرگری لێك بڵاوبوو، پێشەوەری و داروودەستەکەی لە تەورێز رایان کرد، بە نزیك بوونەوەی هێزی دەوڵەت لە تەورێز، خەڵکێکی زۆری ئەم شارە رژانە شەقامەکان بۆ پشتیوانی لە دەوڵەت هەڵیان کوتایە سەر بارەگای فیرقەی دیموکرات و وێرانیانکرد و ئاگریان تێبەردا، نیزیك15هەزار کەسیش تەرکە وەتەن بوون.

دەوڵەت رۆژی21ی سەرماوەزی ناونا "رۆژی نەجاتی ئازەربایجان" هەموو ساڵێك بۆ رێز لێنان لەو رۆژە لە سەرانسەری ئازەربایجان رێژەی نیزامی وجێژن و چراخانی بەڕێوەدەبرا، خەڵکی ئازەربایجان و کوردستان مەجبوور دەکران لەو رۆژەدا لەسەر جەستەی نێژراوی کۆمارە ساواکانیان شایی و زەماوەند بگێڕن.

"قوام السلطنه" بە وردبینییەوە حیسابی کوردستانی لە ئازەربایجان جیاکردبۆوە لەسەرەتای مانگی سەرماوەزدا تێلگرافێکی بۆ پێشەوا نارد، ئەمەش دەقی تێلگرافەکەیەتی:

"ئاغای قاضی محمد بە وەبەرچاو گرتنی بریارێکی داومە، هەڵبژاردن دەبێ لەژێر چاوەدێریی هێزی ئەمنییەتیی نێردراو لە مەرکەزەوە بەرێوەبچێ پێویستە هەڵبژاردنی مەڵبەندی کوردنشینی ئازەربایجان بەهاوکاری دڵسۆزانە و بێ ئەم لاوئەولای ئێوە بەڕێوەبیردرێ، بۆیە پێویستە لێمان روون ببێتەوە لە خوی- شاپور- رضائیە و مەهاباد کە مەڵبەندی کوردنشینە بە چ شێوەیەك هاوکاری هێزی ئەمنییەتی دەکەن تاکوو دەستووراتی پێویست رابگەیەنین، ئەو هاوکارییە گەرم و خۆشەویستی یە تایبەتی یەی کە

لەم ماوەیەدا لە شەخسی ئێوەمان دیوە چاوەڕوانم لەو شوێنانەی پێوەندی بە کوردەکانەوە هەیە، بە دڵگەرمی یەکی تەواوەوە هەوڵ بدەی کارەکان بەرەوپێش بچن." پێشەوا دژی گەڕانەوەی ئەرتەش بۆ کوردستان بوو، بەڵام لەبەریەکهەڵوەشانی کوتوپڕی حکوومەتی ئازەربایجان، شوێنێکی خراپی لەسەر بارودۆخی کوردستان دانابوو، کاتێك ئەرتەش گەیشتە تەورێز، هێندێك لە عەشایری رۆژئاوای گۆلی ورمێ وەك گوڵەبەرۆژە بۆلای دەوڵەت هەڵگەڕانەوە وەختێك دەرکەوت سۆڤیەت پشتی دەحکومەتی ئازەربایجان کردووە، پێشەواو هاورێیانی کەوتنە نێو دوور یانێکی سەختی تەسلیم بوون یان بەرگری کردن؟! ئاسۆیەکی روون بۆ کوردەکان نەمابوو، لە عەرزو ئاسمان هاوپەیمانێکیان شك نەدەبرد، تاك و تەریك مابوونەوە، بەو حاڵەش مەعنەوییاتیان بەرزو هەستی خۆڕاگریان بەهێز بوو، رۆژی 15ی سەرماوەرز بۆ بەرگری لە کۆماری کوردستان و پێشگری لە پێشرەویی ئەرتەشی ئێران" شوورای جەنگ" یان پێکهێنا، بەڵام ر ار ایی وبێ تەسمیمیی ئەو شوورایە وای لە خودی ئەندامانی شووراکە کرد دەست لە شەرو بەرگری هەڵگرن و بێ قەیدو شەرت خۆیان بەدەستەوەبدەن.

هەستی خۆراگریی بارزانییەکان کە خاوەن ئەزموونی شەڕبوون و نەترەی هێزی نیزامی ئێرانیان لە ناوچەی سەقز بردبوو، زۆر بەهێزتر بوو"ژێنراڵ بارزانی" بەتوندی دژی تەسلیم بوون و خۆبەدەستەوەدان بوو، دوو جاران چووە لای پێشەوا، زۆر هەوڵی لەگەڵدا پێکەوە وەدەرکەون، بەڵام پێشەوا لەبەر ئەوەی خۆی لەبەرامبەر خەڵکی کوردستاندا بە بەرپرس دەزانی لە وەڵامدا بە بارزانی دەڵێ: (من لەگەڵ خەڵکی مهاباد دەمێنمەوە، چونکە سوێندم بۆ خواردن لەگەڵیان بم و بیانپارێزم، حکومەتی مەرکەزیمان لێ غەزریوە دەگەڕێتەوە، ئەگەر من بگرێ داخی خۆی بەمن دەرێژێ و لەکول خەڵکەکە دەبێتەوە، بۆ ئەوەی خەڵکی شار تووشی زەرەروزیان نەبن ناچارم بمێنمەوە."

پێشەوا دوای ئەو قسانە ئاڵای کوردستان بە ئەمانەت بە"ژێنراڵ بارزانی" دەسپێرێ و داوای لێدەکا بیپارێزێت، لەسەر ئەمری"پێشەوا"، :بارزانی" ئەوەی لە چەك و تەقەمەنی پێویستی بوو لەسەربازخانەی مەهاباد باری کردو بەهێزی بارزانییەوە بەرەو ناوچەی نەغەدە کشاوە.

پیشەوەری لەکاتی راکردنەکەیدا بەتەلەفون پێشەوای دواند. گوتی: "ئەرتەش خەریکە بۆ تەورێز پێشرەوی دەکا، ئێمەش لە تەدارەك داین بۆ لای جولفا بچین و لەوێشڕا خۆ بگەیەنینە سۆڤیەت." بە پێشەوای پێشنیار کرد لەگەڵ بنەماڵەکەی خۆی شەوەکی مەهاباد بەجێبێڵێ و پەناهەندەی سۆڤیەت بێت پێشەوا وەڵامی دابۆوە:

"لەگەڵ خەڵکەکەم دەمێنمەوە تا ئەو جێگایەی تیغم بیبرێ پێش بەخوێنرێژی و ئاژاوەنانەوە دەگرم، هەر بەڵایەکی بیانەوێ

بەسەرخەڵکەکەم بێنن، با بەسەر خۆمی بێنن..." ئەرتەشی شڕۆڵی"شاهنشاهی" ڕۆژی(17ی دیسامبر)، 26ی سەرماوەرز گەیشتە مەهاباد، بەخۆبەدەستەوەدانی پێشەواو هاورێکانی کۆتایی بە کۆماری کوردستان هات.

ڕۆژی30ی سەرماوەرز سەرتیپ هومایونی سەرەڕای ئەو تەئمینە گیانی‌یەی بە پێشەواو هاورێکانی دابوو، سەرجەم28کەسی لە ڕێبەرانی کۆماری کوردستان گرت پێشەواو سەیفی قازی و سەدری قازی سەرقافڵەی گیراوەکان بوون.

## ئیعدامی پێشەواو هاورێکانی

پێشەواو سەیفی قازی و سەدری قازیان لە زیندانی سەربازخانەی مەهاباد ڕاگرت، دەسبەجێ لە دادگایەکی نهێنی و فەرمایشیدا دادگایی کران، ئەو شتانەی وەکو تاوان لەسەریان کەڵەکە کردبوون بریتی بوون لە پۆشینی جلوبەرگی ژێنراڵی، سەرۆکایەتیی کۆماری کوردستان، گۆڕینی شکڵو ڕەنگی ئاڵای ئێران، سەفەر بۆ باکۆو کۆبوونەوە لەگەڵ ژێنراڵەکانی خاریجی، کوشتنی ئەفسەرو سەربازی ئێرانی، بەڵێن‌دانی بەخشینی ئیمتیازی نەوت بە بێگانە بە نیسبەتی 51، 49 و هەروەها بەڵگەو وێنەی ئەو وتانەی کە لەکاتی قسەکردن و میتینگ و کۆبوونەوە گشتییەکاندا گوترابوون و نیشان درابوون، سەرجەم پێشەواو هاورێکانی پێ تاوانبارکرابوون.

لە سەرماوەرزی25دا هەرسێکیان بە ئیعدام مەحکووم کران، بەڵام لەبەر هێندێک هۆی ئەمنییەتی هەواڵەکەیان لەنێو خەڵکدا بڵاونەکردەوە دوای ئەوە کە 80ڕۆژیان لەژێر حوکمی ئیعدامدا ڕاگرتن، هەیئەتی دادگای"چاوخشاندنەوە" لە تاران ڕاگەیشتە مەهاباد لەسەریەک ڕەوتی موحاکەمەی ئەمجارە48سەعاتی خایاند دادستان لە یەک دووجێگادا بەتوندی هێرشیان دەکاتەسەرو بە"کوردی سەگانی سفەت" ناویان دەبا، پێشەواش لێی ڕاست دەبێتەوە، زۆر بەتوندی بەگژیدا دەچێتەوە.

پێشەوا قازی ناتقێکی بەهێزبوو، پێویستی بە وەکیل نەبوو بەشی هەرەزۆری ئەو دادگایە تا ئێستاش لە نهێنیدا ماوەتەوە ئەوەی کەم تا کورتێک لە زمان شارەزایان و نووسەرانی توێژەر و شاهیدانی زیندوو نووسراون بۆ دەرەوەیان درزکردووە، پێشەوا قازی لەدوایین دیفاعی خۆیدا گوتوویەتی:

"... وابیر نەکەنەوە کە شارەزای قانوون و موقەرەرات نیە، باش لێی شارەزایە بەرلە هاتنی ئەرتەش و هێزی مەرکەزی بۆ مەهاباد پێشگوییم کردوە کە هەر ئیعدام دەکرێم ئەدی بۆ هەڵنەهاتم، ئەوە نەبوو کە نەمدەتوانی، شەش دەزگا ماشێنی سواری و جیبم لە ئیختیاردابوو، هەر دەقیقەو ساعەتێک ویستبام دەمتوانی سنوور ببڕم و خۆم دەرباز بکەم باش بزانن کەمن وەکوو پێشەوەری"ژنانیلە" نەبووم هەر کە تینم بۆ هاتبا ڕام کردبا بۆ کوێ هەڵدەهاتم؟ ئێرە وەڵاتی (من) کوردستانە، تا ئێستا8پشتی من لێرە لەو خاکە نێژراون".

سەروان شەریفی وەکیلی پێشەوا قازی گێڕاویەتەوە:

"حەیف بۆ قازی محمد، بۆ ئەو پیاوە مەزن و ژیرو زانایە، دوێنێ لەکاتی مەحکەمەدا بێ کاغەز 4سەعات وتاریدا، بە زانست و مەنتیقی خۆی هەمووانی حەیران کردبوو.. لە هەموو کەس باشتر قانوونەکانی ئێرانی دەزانی، لە هەموو کەسێك باشتر لەوەزعی سیاسیی ئێران و هەندەران شارەزابوو... لە ڕاستەقینەدا ئەوە قازی بوو کە مەحکەمەی موحاکەمە دەکرد..."

لەدوایشدا سەروان شەریفی بە تاوانی درکاندنی نهێنی‌یەکانی ئەو دادگایە، لە ئەرتەشیان وەدەرنا.

نیوەشەوی10ی خاکەلێوەی1326ی هەتاوی چەند سەعات بەرلە بەرێوەبرانی حوکمی دادگا، بەبیانووی ئەوە کە پێشەواو سەدری قازی و حەمە حوسێن خان بۆ تاران بەرێ دەکەن، لە سەربازخانەڕا بە زیلی ئەرتەشی بۆ خانوویەکی نیزیك مەیدانی چوارچرا ڕاگوێزران لەوشوێنەدا دادستانی هەیئەتی دادگای چاوخشاندنەوە جیا جیا حوکمی دادگای بۆ خوێندنەوە، دوای ئەمە پێشەوا لە مامۆستا مەلا سەدیق سدقی کە لەوێ حزوری دەبێ داوا دەکا ئەو شتانەی کە پێی دەڵێ لەسەر کاغەزێك بیان نووسێ و بیکاتە"وەسیەتنامە، سەدیق بەدەسخەتی خۆی و بەزمانی فارسی وەسێتنامە"ی پێشەوای نووسی ئەمەش دەقی وەرگێڕاوی "وەسیەتنامە"ی پێشەوایە:

"ئەو وەسیەتنامەیە ڕۆژی10ی خاکەلێوە"قازی" بە حزووری خۆم "محمد صديق صدقي" گوتویەتی:

. یەك پارچە دووپارچە فەرش یان قاڵیچەی سەید ڕەحیمی سەید حاجی لەگەڵ شتەکانی منن، بیدەنەوە بەخۆی، ئەویش پاڵێکم پێ قەرزدارە، ئەگەر دایەوە باش، ئەگەر نەشی داوە ئیختیار بەخۆیەتی.

. گەنمێکی کە لە تسبیتدا بووە، هی خۆمە ئەگەر دایانەوە وەریگرن.

. ماشێنی فۆردی46یشماڵی خودی خۆمە.

. کاتێك دەستبەسەریان کردم پێنج هەزار و پێنسەدتمەنم لە گیرفان دابوو، لێیان وەرگرتم فەقەرەی ك یەکسەدو پە نجاوسێ تمەن و"سەروان شەریفیش" بەنێوی"حق الوكاله" دە هەزار تمەنی لەخێزانم وەرگرتووە، ئەوانیش وەرگرنەوە.

. موعینی سی هەزار تمەنێك، شتێك زیادو کەمم پێ قەرزدارە، ئەویش شتێکی داوەتەوە، سەعاتێکیشی وەکو دیاری بۆ هێنابووم لە دەفتەری شیرکەت دای نابوو، ئەمنیش لەگەڵ ئەو شیرکەتە تەرەف نەبووم.

. ئەوەندەی بزانم هەشت هەزار تمەنێك یان شتێك کەمتر بە سەید سەلامی قەرزدارم، هەرچەندێکی داوای کرد بیدەنەوە.

. تەلەفونەکەیان بردوە وەدوای بکەون.

. ئەو ماشێنەی لە بابا شێخ(حاجی بابە شێخ) یان ستاندوە ئەویش هی خۆیەتی.

. چوار جیپ کە بۆ خۆم و لە ئیختیار خۆم دابوە ئەوانیش ماڵی شەخسیی خۆمن.

. "سەروان شەریفی لەبەر زەحمەتی... سێ سەدتمەنێکی بدەنێ.

. هەرکات ئەو پازدە هەزار تمەنە وەرگیرایەوە بە سەعیدی هەمایون و میرزا رەحیم کە زەحمەتیان کێشاوە هەر نەفەرەی هەزار تمەن و پێنسەدتمەنیش بدەن بە محەممەد فیروزە خانمێ.

. بەشی خوشکەکەم، بێجگە لە ئاغەڵیان کە بە نێوی خۆم سەبت کراوە، هەرچی ئێرسی بابمە بەشی خۆی پێ دەبڕێ، ئەویش رازی بکەن.

. خێزانم دایکی منداڵەکان سەروەسی بێ، منداڵەکان بەخێوبکاو مەلا عەولاش چاوەدێرییان بکا.

. چاپخانەکە خۆم کڕیومەو ماڵی خۆمە.

. مام عەزیزی قەرەنی ئاغا ئەوی بەسەری هاتووە وا دەزانێ من دەستم تێدابووە، هەرچەند من ئاگام لێ نیە، بەلام کارێك بکەن گەردنم ئازابکا.

. نۆکەرەکان لەو ماوەیەدا خزمەتیان کردووە و زەحمەتیان لەگەڵدا کێشاوم، چاکەیان بدەنەوە و دڵیان رازیکەن.

. لە دوایی دا چەند هەزار تمەنم بۆ بکەنە ئیسقات و تەلیلە.

شەوی1226/1/10

ئیمزا مەلا سەدیقی سدقی و قازی محەمەد

"ئاچیبالت رۆزویلت" موستەشاری نیزامیی دەوڵەتی ئەمریکا لەو کەسانە بوو لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا چۆتە مەهاباد چاوی بە پێشەوا کەوتووە، وتووێژی لەگەڵدا کردووە، باروودۆخی کوردستانی هاتۆتە دەست لە یادداشتەکانیدا نووسیویەتی: "هەر سێ قازی لە دادگایەکی تەواو نهێنیدا لە مەهاباد موحاکەمە کران، رۆژی 23ی ژانویە مەحکووم بە مەرگ کران، تاران بەرێوەبردنی حوکمی ئێعدامی ئەوانی وەدواخست چونکە"قوام" پێی خۆش نەبوو لە گەرمەی وتووێژ لەتەك سۆڤیەت‌ی‌یەکاندا، هەڵلاو بەزم سازببێ. پێش ئەوە تاران بەجێبێڵم، ژێنراڵ رەزمئارا لە فێوریەی1947ی زایینی چوو بۆ مەهاباد دەلیلم هەبوو، لەوە دڵنیابم مەئموورییەتی پێدرابوو، لە ژێر چاوەدێریی ئەودا ئێعدامی برایانی قازی بەرێوەبچێ چوومە لای سەفیری خۆمان"جۆرج ئالن" بزانم چ کارێکی لەدەست دێ.

سەفیرمان لێی پرسیم: بۆ هێندە نیگەرانی چارەنووسی قازییەکانی؟ ئاخر ئەوانە هاوکاریی سۆڤیەتی‌یەکانیان کردووە. گوتم

–ئەوە راستە، بەلام ئەوان بە هەموو توانایانەوە بۆ باشتر کردنی وەعزێ خەڵك تێکۆشاون، لەونێوەدا هەر سۆڤیەتییەکانیش بوون ویستویانە کۆمەکیان پێبکەن، بێتوو ئێعدام بکرێن لە هەموو جێیەك ئێمە بە شەریکی ئەو کارە دادەنێن.

. باشە پێت وایە چم لە دەست دێ؟

پێم وایە دەبێ داوا لە"شا" بکەی دەستوور بە رەزمئارا بدا قازییەکان بۆ موحاکەمەیەکی عادلانەو سەرئاوەڵە بنێرێتە تاران.

سەفیر داوای چاوپێکەوتنی حەمەرەزا شای کرد، شا دەسبەجێ وەریگرت سەفیرمان لەو چاوپێکەوتنەدا، هیوادار بوو گیروگرفتی عەشایر و مەسەلەی کوردەکان بەباشی چارەسەربکرێن ئەوەشی بە شاگوت راستە قازییەکان هاوکاریی سۆڤیەتیان کردووە، بەلام لە بواری پەروەردەو فێرکردندا خزمەتێکی یەکجار زۆریان بەو خەڵکە کردووە لێرەدا شا دەپەڕێتە نێو قسەکانی بە پێکەنینەوە لە سەفیری دەپرسێ: "ئێوە دەترسن تیربارانیان بکەم؟ ئەگەر قسەکەو هەر ئەوەیە دڵنیابن قەت خەیاڵێکی وام بەمێشکدا نایە."

بەرەبەیانیی سێیەکی مارس(10ی خاکەلێوە) بەدەستوری خاوەن شکۆ شاهەنشا، قازییەکان لە داردران! ئا– رۆزڤێلت دەڵێ:

"وا وێدەچێ راست لەودەمەیدا سەفیر وەدەرکەوت و دەرگای هۆڵەکەی پێوە دەدا، شا دەستووری ئێعدامکردنی قازییەکانی دابێ."

# لە یادی جەمهوریەتی كوردستان و پێشەوادا

شێركۆ بێكەس

خانمانی هێژا.. برایانی ئازیز

ئێوارەتان باش‌و مەهاباد باش‌و رۆحی سپیی پێشەوایش باش!

بەر لەشەست ساڵ، لەدڵی بەفرو بەستەڵەكدا سوورە گوڵێك چاوی پشكوت‌و لەئاسۆدا ئەستێرەیەكی نۆبەرە زاو لەزوقمەكانی ئازارەوە زەردەخەنەیەك چون گوڵەلیمۆ سەری دەرهێناو بۆ یەكەمجاریش كورد چاوی بەگزنگی بەیانی جەمهوریەتێ ڕشت‌و ئازادیش لەشێوەی شۆڕەژنێكی گەردن بەنێرگزی پرچ درێژدا، بەم دەست سەمەڵی گوڵە گەنمی خۆشەویستی‌و بەو دەستیان هەتاوی مزگێنی وئاشتی هێنا. بەر لە شەست ساڵ، پیاوێك هەبوو پڕبوو لەكانی‌و دارستان‌و پەلكەڕێحانەو لێوان لێوبوو لەئەوینی هەژاران ومێزەرەكەی وەك سەری شاهۆ سپی‌و دەستەكانی وەك دەستی ڕووبار بەخشندەو دڵی هەناری بۆكان‌و عەقڵی چرای دیواركۆو ناوی قازی بوو.. ساڵێك هێندەی چەندین ساڵ پێش خۆی ڕووناكیی تێدابوو. یەك ساڵ‌و مەهاباد بوو بەپایتەختی دڵی هەموو كوردان. لەوساڵەدا زمانی كوردی هەڵفڕی‌و بوو بەلاولاوو بەباڵای ژیاندا هەڵزنا، ئەزموونیش خوێنی تازەی تێكەڕاو مێژوویەكی تا ئەو وەختە كەنەفت وكەسیرە لەبەردەستی عەجماندا ڕاپەڕی و هەستایەوە سەرپێیان.

لەیادەوەری نەتەوەیەكدا مەهاباد چاوگەو پێشەوا ڕێبەرێك‌و بەڵام ئایا ئەو یەك ساڵەیش قوتابخانەیەك بوو بۆ هەموو ساڵەكان، بۆتاقیكردنەوەی دۆست‌و دوژمن‌و سەركەوتن و ژێركەوتن‌و بۆناسینی خۆمان‌و دەرەوەی خۆمان‌و هەموو جیهان؟ ئاخر بەڕێزینە: ئێمە هەر لەبەر شكۆیەكی ڕابوردوو ئەم یادەناكەینەوە. بەڵكو چی لێوە فێربووین بۆ ئەمرۆو ئایندەو داهاتوومان.. ئەو ئەزموونانە چیبوون بۆئەوەی لەم مێرگەدا گیاكەڵەی هەڵەكان دەركێشین‌و جوانیەكان لە ناشیرینییەكان جیابكەینەوە، چیمانكرد بۆئەوەی سەر لەنوێ خوێندنەوەی تازەی خۆمان، خوێندنەوەی عەقڵی ڕەخنەمان هەبێ بۆ ئەو مێژووە بۆئەو ئەزموونەو نەكەوینەوە ناو بۆسەو داوێ، كەبەداخەوە تێیكەوتینەوە نەك جارێ دەیان جار! كەڕەخنە نەبوو نەڕاستكردنەوە ئەبێت‌و نەئایندە، بەڕێزینە مەسەلە گێڕانەوەی مێژوو نییە، بەو بارەدا دڵی خۆمانی پێخۆشبكەین، بەڵكوو پشكنینی ئەو مێژووەیە بۆئەوەی بەر لەسەروەرییەكانمان، خەوشەكانمان بدۆزینەوەو ڕاست‌و ڕەوان پەنجە بخەینە سەر هەڵەكانمان. من نەمێژوونووس‌و نەسیاسەتمەدارم، بەڵام من ئەو چەند ڕۆژە هەستمكرد جگە لەچەند ئاماژەیەك ئێمە تەنها لەڕواڵەتی ئەو ئەزموونە گەورەیە نەدوێین و شۆڕنەبووینەتەوە بۆناو قوڵایی ڕووداوەكان. پرسیاری بۆو بۆچی‌و لەبەرچیمان نەكردو وەڵامێكی تینوێتی شكێنمان نەدایەوە بەخۆمان. كەسایەتی پێشەوا چۆن بوو؟! ئاستی ڕووناكبیری و خوێندەواری ئەومان ڕوونەكردەوە؟! نەمان زانی پێشەوا لەكاتی ،وتووێژە دبلۆماسییەكاندا چی وتووەو چیكردووەو بەلای باری دەروونی و سایكۆلۆجی ئەودا نەچووین، بەشێكی زۆری قسەكان لەسەر ئەنجام ئەدوان‌و بەڵام هۆو هۆكارەكان ونو بزربوون! لەسەركەوتن و دروستبوونی جەمهوریەتی كوردستاندا هوشیاری خۆمان بەپلەی یەكەم هات یان هۆو هۆكارە دەرەكییەكان؟! ئێمە لەوە نەدواین كەئایا لەو شكستەدا موقاوەمەت ڕاست بوو یان نا؟! ئەتوانرا بكرێ یان نا؟! لەهەردوو هەڵوێستەكەدا چی ڕوویئەدا؟! ئێمە بەتەنها باسمان لەئازایەتی‌و قارەمانێتی خۆمانكرد بەڵام پەنجەمان بۆدواكەوتنی خۆمان. بۆناهەستیاری خۆمان‌و گوناهەكانی خۆمان ڕانەكێشا! ئێمە تادواییش نەمانزانی جگە لەپێشەوا خۆی، كەسایەتی یەكەیەكەی وەزیرەكانی دیكەی جەمهوریەتی كوردستان كێبوون؟! چۆن بوون؟! ئایا هەمووان چون یەك بوون لەبیركردنەوەدا؟! ئێمە نەمانزانی لەڕووداوێكی وادا دۆستەكانی كورد لەجیهاندا كێبوون؟! لەسەر بەرەنگاربوونەوەو بەرەنگارنەبوونەوە لەناو ڕووناكبیرانی ئەودەمەدا هیچ ڕوویندەدا؟! چی وتراو چی نەوترا؟! ئاخر بەڕێزینە لەدوای شەست ساڵ ئێمە هەر هەمان ئەوقسانە ئەكەینەوە كەپێشتر كردبوومان؟! ئەی كەشفی تازەمان؟! ئەی خوێندنەوەیەكی جیاواز بۆ ئەم ڕووداوە گەورەیە، خوێندنەوەیەك نهێنی‌و هۆو هۆكاری شاراوەمان بۆ دیاریبكات‌و پەردەمان لەسەر زۆر تەم‌و مژ بۆلابدات؟! ئێمە حیكایەت ناگێڕینەوە. ئێمە بەڕوونی پێویستە بە 1، 2، 3، 4 و 5 بڵێین ئەم هۆو هۆكارانە بوون سەری خستین‌و هەر بەوشێوەیەش بڵێین 1، 2، 3 و 4 ئەمانەیش بوون و هەڵەكانمان و خەوشەكانمان و هۆی شكستیمان!

بەڕێزینە: ئێمە ئەو وەختە ڕاستگۆترین، ناڕاستیەكانی خۆمان دەربڕین و ئێمە ئەوكاتەیش ئازاترین كە ترس‌و گومانەكانی خۆمان یەكالابكەینەوە. بەڕاستی ئێمە هەر تەواو پاشكۆی ئەو میتۆدی خوێندنەوەین بۆمێژوو كەلە عەقڵی ئەمەویەكان‌و سەلەفیەكانی كۆن‌و هەزار ساڵەوە بۆمان ماوەتەوەو لەسەرووی هەموویشیانەوە عەقڵێ كەبەردەوام ڕەخنەی كوشتووەو بەردەوامیش مەتح‌و سەنای هەڵبژاردووە. هەر لەبەر ئەوەیشە ئێمە وەختێ ئەتوانین خوێندنەوەیەكی نوێمان بۆ مێژووی خۆمان هەبێ، كەسەر لەنوێ و لەنووكەوە بەم مێژووەدا بچینەوە. دەست بكەینەوە بەهەڵكۆڵین وەك ئەوەی هەر هیچ نەكرابێ. تەنانەت لەسەر ئەو جومگانەیش بوەستین كەتائێستە بوون بەیەقینمان، ئەوانیش بخەینەوە بەردەم







لێپرسینەوەی تازە. ئێمە پێویستە سەرلەنوێ بە بیروڕاو بۆچوونی هەموو رۆژهەڵاتناسەکاندا بچینەوە. چونکە من پێموایە بەشێك لەو ناڕاستیانەی ئەوانن کە لەئێمە بوون بەحەقیقەت‌و بەڵام هیچ لێکۆڵینەوەیەکی ڕەگ‌و ڕیشەوارمان بۆنەکردوون دەست بەرداریان بووین، هەر ئەوەندەیش نا بەڵکو بەبێ هیچ گەڕانەوەیەکی جدی بۆ لێکۆڵینەوەیان هەر لەسەر بناغەی ئەو قسانە گریمانەکانی تریشمان هەڵئەچنیەوە!.. ببوورن: من ئەگەر ئەم قسانەی خۆم چڕبکەمەوە ئەڵێم: ئەوە تەنها عەقڵی ڕەخنەگرانەیە کەڕووی راستەقینەی مێژوو دەرئەخات‌و زۆر بەخۆدا هەڵدانیش لەهەر بوارێکدابێ نیشانەی کەم بڕوابوونە بەخۆو هەڵاتنیشە لەبەردەم ئەو حەقیقەتەدا کە ئەمڕۆ بێ یان سبەی یان درەنگتر ئەمانگەنێ‌و هەموو پەردە یەکیشمان لەسەر لائەدەن! ئایا ئەزموونی بێ هەڵەو بێ خەوش هەیە؟! بێگومان نەء، ئەی بۆ بەوردی لەسەریان رانەوەستاین. ئێمە پرسیارمان نەوروژاند. چونکە لەم وروژاندنەوە راستیەکان دەرئەکەون. دەمێکە کورد وتوویەتی دۆست ئەوەیە ئەمگرێنێ و دوژمنیش ئەوەیە پێمپێئەکەنێ. ئێمە پێوستیمان بەوەیە دڵسۆزی خۆمان لەشێوەی نەشتەرگەری ڕەخنەدا لەپێناوی رزگاربووندا و لەپێناوی جەستەی مێژوویەکی ساغدا بەکاربێنین. ئێمە ئەو نەشتەرگەریەمان نەکرد و لەبری ئەوە هەر موسەکنەکانی ترمان دا بەخۆمان. ئێمەی ئەوەی ئەیزانین و هەزاران جار وتومانە ئەوە لایەنە جوانەکانی خۆمانن، بەڵام ئەوەی نایزانین و لەمیهرەجانێکی وا گەورەدا زۆرکەم خۆمان لەقەرەی دا، لایەنە تاریکەکانی خۆمان بوو. من وەك شاعیر چەندین سترانی خۆشەویستی‌و وەفاداریم بۆ ئەو سومبولانەی مێژووم وتوە لەشۆڕشی دەرسیم‌و ئاگریداخەوە بۆ مەهابادو شۆڕشی ئەیلول‌و تازەیش.. بەڵام کاری مێژوونووس‌و توێژەرەوەی سیاسی و کۆمەڵایەتی کارێکی جیاوازە. کاری مەنتیقی عەقڵی و لێکۆڵینەوەو ڕەخنەو هەڵوەشاندنەوە و دروستکردنەوەیش. نەك کاری گێڕانەوەو حیکایەت جوانی. بەڵێ لەو باسانەدا، ناوبەناو تروسکەیەکمان ئەبینی، بەڵام زوو ون ئەبوون بیرئەچوونەوە. با نەلەخۆمان کەمبکەینەوەو نەزیادیشی پێوەنێین. لەبری گێڕانەوە لێکۆڵینەوە. لەبری هەست‌و نەستی رووت عەقڵ و لەبری لەخۆبایی بوون سادەیی و لەبری خۆش باوەڕی هەمیشە گومان و تاووتوێکردن بکەین بەپێوانەکانی خۆمان.

ئەمە دەقی ئەو وتارەیە کە نووسەر لە میهرەجانی "مەهاباد و پێشەوا قازی.. کەلتوور و ڕۆشنبیری، و ئەزموون" کە ڕۆژانی (4-6 ی شوباتی 2005) لە هەولێر بەڕێوەچوو. لە پانێڵێکدا بەناوی "مەهاباد لەمێژوو و یادەوەری دا" ڕۆژی 2005/2/5 لە هەولێر خوێندیەوە، جێگەی ئاماژەیە ئەو پانێڵە بەسەرۆکایەتی خودی نووسەر و ئەندامێتی (گوڵموراد گوڵمورادی) و بەشداریی (محەمەد جەمال، ئەمیر حەسەنپور، ئەنوەر سوڵتانی) ئەنجامدرا.

## بەشێ لە ڕۆمانی

# پێشمەرگە

رەحیمی قازی




ئەوسێ کوردە بە دڵێکی پڕ لە ئاوات و ئارەزووی خۆشی لە (دوڵی بەسرێ)وە سەرکەوتن و سابلاغیان لێ وەدیارکەوت، میرزا قویتاس بۆ ئەو دوولاوە هەم بەلەدچی بووە هەم ردێن سپی، و لەبەرئەوە شێرکۆو پیرۆت هەر چاویان لە دەمی وی بو، کە شتێکی بڵێو ئەوانیش بیکەن، میرزا قویتاس لە بیری هاورێکانی گەییشت و گوتی:

عەرزو بە حوزوری موبارەك بکەم ئەوا گەییشتینە(مەهاباد)، جاوەرن بچینە نیو باغی قازی هێندێك ئیستراحەت بکەین هەتا تاریك دادێ و بەعدەن دەچینە نیّو شاری بۆ ماڵی کاکە سوار، وەنێوەی پێ موعەرەفی دەکەم، کاکە سوار مەردێکی حیسابییە و عوزویکی فەعال و مەشهوری کۆمەڵەیە و بەوەسیلەی وی لەگەڵ کۆمیتەی مەرکەزی موناسیبات بەرقەرار ئەکەین...

لای نێوارێ میرزا قویتاس بەلای(گەراوان)داشێرکۆو پیرۆتی بردە نێوشارێ و، چونە ماڵی کاکە سووار کە لە گەرەکی(خرێ) هەڵکەوتبو. کاکە سووار لە ماڵێ نەبوو و خێزانی میوانەکانی بردە ژوورەوە و رای گەیاند کە، ئێستا میردەکەشی دێتەوە، میوانەکان هێشتا نەپرژابونە سەرئەوەی کە، ئیستەکانیک چا بخونەوە کە کاکە سوار وەژور کەوت و زۆربەگەرمی میرزا قویتاس و هاورێکانی بەخێ ّرهاتن هێنا.

میرزا قویتاس بۆ ئەوەی کە، کاکە سووار حاڵی بکا هاورێکانیشی ئەندامی کۆمەڵەن وەدەتوانێ رەپ و رووقسەیان لەگەڵ بکات گوتی:

برادەر ئەو دوجەوانە کە یێکیان ئیسمی شەریفی شێرکووە ئەوی تر ئیسمی موبارەکی پیرۆتە بونەتە عوزوی کۆمەڵە و دەتوانی بە ئاشکرایی سوحبەتیان لەگەڵ بکەی وە نیوی نهێنی شێرکۆ "ئازەر"و نیوی پیرۆتیش"برا"یە... کاکە سوار بەوەی زۆر دڵخۆشبووە بە زەردەخەنەوە گوتی:

جا میرزا قویتاس، ئەتۆ کەسێکی هاوبیرو هاورێ نەبێ بۆ ماڵی ئێمەی ناهێنی، ئەمن هەربەوەی چاوم پێیان کەوت دەست بەجێ زانیم هاواڵ و هاورێ و هاوبیری ئێمەن و هەستی نیشتمان پەروەری بۆ ئێرەی هێناون، زۆر– زۆر بە خێربێن...

میرزا قویتاس سەری قسانی دامەزراندو گوتی:

ئەو دو جەوانە چارەیان لێ قەتع ببو و هاتبونە خانەی بەندەی حەقیر مەسلەحەت وە تەدبیرم پێبکەن، ئەمنیش تەسمیم گرت داخلی کۆمەڵەیان بکەم و بیانهێنمە ئێرە.

میرزا قویتاس تەواوی بەسەرهاتەکانی پیروت و شێرکۆی بۆ کاکە سووار گێڕاوە و گوتی:

ئەوانە ئیتر ناتوانن لەدێیەکانی خۆیان زیندەگانی بکەن وەحەتمەن ئێستا جەندرمەو ئاغاکان وەك چاویشەدار لەوان دەگەرێن کەبیانگرن و تەنبێیان بکەن، بەناشوکری نەبێ لە ئەترافی سەقز هەنوز جەندەرمەکان دەستیان دەر وا وە لەتەواوی ئوموراتی کوردان دا دەخالەت دەکەن، ئومێدەوارم ئێوە لێرە بتوانن ئەوانە محافەزە بکەن وە بدونی شەك و شوبهە هەردووکیان دەستوراتی ئێوە بەچاکی ئەنجام دەدەن وە ناهێڵن مامە قویتاسیان رووسیایی بێت...

لەسەرەتای ساڵی1942دا کاتێك کە کۆمەڵە لە هەموو لایەکەوە دەستی بەتێکۆشینی نهێنی کردبو پێداویستێکی زۆری بەلاوانی کۆڵنەدەرو تێکوشەرو بەکارهەبو، ئەندامانی دەستەی سەرکردەیی کۆمەڵە تاق– تاق بۆ مەڵبەندەکانی جیاواز– جیاوازی کوردستان وەرێ دەکەوتن کە لکی کۆمەڵە دابمەزرێنن و پتر خەڵك بۆ لای خۆیان رابکێشن لە بەشی زۆری کوردستان هێشتا ژاندارم و ئاژانەکان وە لە چەند جێگایەك بەشە هوردووەکان و هەروەها خاوەن موڵکە زۆردارو نیشتمان فرۆشەکان دەستیان دەرۆیشت، و بە تەواوی هێزی خۆیانەوە لە ڕێگای ساز بونی کۆمەڵەدا کۆسپ و بەرهەڵستیان پێکدەهێنا، هەر لادێییەکی لە حاست زوڵم و زۆری لە تام دەرچوی خاوەن موڵك وستەی لێ ّوە هاتبایە بەبێ قسە نی ّوی کۆمەڵەیان لەسەر دادەناو دەیانگرت، تەنانەت ئاغایەك لە محالی(شارویران) گوێی کرمانجێکی بری بو لەسەر ئەوەی کە، بە لادێییەکانی دیکەی گوتبو وەرن بچین تێکەڵاوی کۆمەڵە بین.

گۆڤاری"نیشتمان" کە، بلاوکەرەوەی بیروباوەری"کۆمەڵەی ژ–ك" بو، تازە دەرچوبو وە بلاوکردنەوەی ئەوەش بە تەواوی مەڵبەندکانی کوردستاندا ئەرکێکی زۆرگران و چەوت و نالەبار بو لەسەرشانی ئەندامانی دەستەی سەرکردەیی. دانیشتووانی. کوردستان، بە تایبەتی لادێییەکان بەباوەشێکی ئاواڵەوە بەرەوپیری نوێنەرانی کۆمەڵە دەهاتن و لە دڵەوە ئەندامەتی وییان قوبوڵ دەکرد و ئەوەندەی بۆیان هەڵکەوتبایە بە نێوی حەقی ئەندامەتی دراویان دەدا بە سوندوقی کۆمەڵە.

دەرکەوتنی هەوەڵین ژمارەی گۆڤاری "نیشتمان" وەك تۆپ لە تەواوی کوردستاندا دەنگی داوە و هەر کەسێکی کەتە سەوادی کی ببایە چ خاوەن موڵك و تاجر و کەسەبە، چ مەلا و فەقێ و میرزا وهیدیکە لە هەموو لایەکەوە هەوڵی ئەدا ژمارەیەکی "نیشتمان" وەدەست بهێنێ و بیخوێنێتەوە، "نیشتمان" دەستاو دەست دەگەرا ئەو هەلبەستانەی کە، لەویدا چاپ دەکران بەتایبەتی دەمەتەقەی بایزوباپیر" کە، بەشێوەیەکی پەتی و خومالی دەردی دەداو ئاغاوەت و سەروك عەشیرەتە نیشتمانفرۆشەکانی وە بەر پلاری رەخنەو لومە دەگرت تەنانەت لەلایەن نەخویندەوارەکانیشەوە لەبەر دەکران وە لەهەموو جێگایەك باس- باسی بایزوباپیر بوو.

کۆمیتەی سەرکردەیی کۆمەڵە لەبەرامبەر داخووازو هەستی دانیشتووانی کوردستاندا نەدەپەرژا سەر ئەوەی کە، گووڕای "نیشتمان" بەهەمو بگەیەنیت لەبەر ئەوە زۆری پێداویست بە لاوان لە خۆ بوردوو تێکوشەرو کۆڵنەدەر هەبو کە بەهۆی وان لەگەڵ تەواوی تەشکلاتەکانی پێوەند ڕابگرێ و گۆڤاری "نیشتمان" بەنێو کوردندا بلاّوبکاتەوە.

کاکە سوار بەدیتنی ئەو لاوە گەلێك کەیف خۆش بو وەلە دڵیدا دەی گوت: "ئەوانە بۆ ئێمە زۆر پێویستن و دەتوانن کارێکی زۆرمان بۆ بکەن..." کاکە سوار روی کردە میرزا قویتاس و گوتی:

سبەی شەوی "ئازەر" و "برا" هەڵدەگرین دەچینە لای "کاك بینایی"، هاوەڵەکانی دیکەش لەوێ دەبن و هەرچی ئەوان بیڵێن وادەکەین، ولام وایە زۆر بە گەرمی بە خێرهاتنیان دەکەن...

جێگای کۆمیتەی سەرکردەیی کۆمەڵە لە چەند وەتاغیکی پیاویکی هەرە دەوڵەمەندی سابلاّغ هەلکەوتبو ئەو پیاوە دەوڵەمەندە لە زەمانی رەزاخاندا زۆری چەرمەسەری دیتبو، و بەتەنیا لە پاش تێکچونی رێ و شوێنی دیکتاتوری توانیبوی هەناسەیەکی بەرەحەت بکێشێت ئەو لە دڵەوە پیاویکی نیشتمان پەروەرو کورد خۆشەویست بووە، بەنهێنی یارمەتییەکی زۆری بە کۆمەڵە دەکرد، بەلاّم کەس شکی بۆ نەدەچوو کە، ئەو نیشتمانپەروەربێ و هەر لەبەر ئەوەش کۆمیتەی سەرکردەیی خانووەکەی وییان بۆ ناوەندی تێکۆشینی خویان هەڵبژاردبو کە لەبەر چاوی دوژمنان دوربێت، ئەو خانووە لە چەند لاوە دەروازەی هەبو وە تەواوی ئەندامەکانیش بە جێگای وییان نەدەزانی، تەنانەت بەشی زۆری ئەندامەکانی کۆمیتەی سەرکردەیی لەگەڵ چەند ئەندامێك پێوەندی هەبو.

بوسبەی شەوی کاکە سووار هاواڵەکانی هەڵگرت و رۆییشتن وەکاتێك گەییشتنە کۆلاّنێك گوتی:

ئێوە لێرە چاوەری بن ئێستا دێمەوە.

هێندەی پێ نەچو کاکەسووار گەراوەو هاواڵەکانی بە دوی خۆیدا برد وەلە دەرگایەك نیزیك بوەوەو چووار تەقەی لێ هێناو دەرگا کە کراوە بەژێر خانێکی تاریکدا روییشتن وە لە پاشانی چەند پلیکانێك وەسەر کەوتن وەچونە ژورێکەوە، ژورەکە چرایەکی فتیلەی لێ دائیساو کەسی لێ نەبو وەلە نێوە راستیدا چەند کورسییەکی لیداندرابو لە قونیچکیکی ژورەکە پەردەیەك بەتاقەوە هەلاّوەسرابو وەبەر لە هەمو شتیك ئەو پەردەیە نەزەری شێرکوو پیروتی بۆ لای خوی راکیشا ئەوان بەوردی تەماشای پەردە کەیان دەکرد کە، لە نەکاو لەپشتەوە یەکێك وە ژور کەوت گوتی:

شەوباش

کاکە سووار و میرزا قویتاس دەست بەجێ هەڵستان و شیرکوو پیروتیش لەجێی خۆیان قیت بونەوە وە لە چەشنی راوەستانی کاکە سووارو میرزا زانییان کە، ئەو پیاوە گەورەیە، وە رەنگە ئەو "کاك بینایی" یەی کە، لە ماڵی کاکە سووار باسی دەکرد ئەوەیی...

هێشتا هەموو بە پیوە راوەستابون کە، کاکە سووار هەڵ دایەو گوتی:

قوربان، ئەو دوو لاوەی عەرزم کردی ئەوانەن هاتونە خزمەتت.

"کاك بینایی" پیاویکی کەلەگەت و چووارشانەو بەخووە بو، تەمەنی لە چل- چل وپێنج دەدا وە ردینێکی رەنگ کارەبایی تەنکی هیشتبوەوە وە دایما زەردەخەنە لە لیوییەوە دیار بو وە ئەوە هیندەی دیکەش سەحەتی سوك کردبو جل وبەرگێکی سادەی مەلایانەی لە بەردا بو وە هەر کەسێکی نا بەلەدو نەناسیاو دیتبایەی دەی کوت ئەوە فەقیی هەژاری مزگەوتی هەباس ئاغایە.

"کاك بینایی" روی کردە لاوەکان و پرسی:

روله نیوتان چیە؟

قوربان شێرکۆوە پیروت.

"کاك بینایی" کە ئەو نیوانەی بیست بە نابەدلییەوە تەماشایەکی کاکە سووار و میرزا قویتاسی کردووە وئەوان لە چاوی ویدا خویندیانەوە کە دەڵێ: "تەروفیر کردون، هەر دەلەی نیوی نهێنی تان لینەناون...".

میرزا قویتاس کە، زانی "کاك بینایی" بەوەی قەلس بو هەڵ دایەو گوتی:

قوربان، ببەخشە، ئیسمی هووەیان "ئازەر" وەهی ئەوەشیان "برا" یە، ئەمن فەراموشم کرد کە حاڵیان بکەم لەمەو بە دووا نیوە تازەکانیان بل ێن.

شێرکو وە بە تایبەتی پیروت ئەو قسانەیان پێ سەیر بو وەهیچ رانەهاتبوون کە، بە نیویکی دیکە یەکتر بانگ کەن.

"کاك بینایی" فکری دڵی ئەو لاوانەی خویندەوەو دەستی بەقسە کردوو گوتی:

روڵەکانم، روی دنیا رەش بێ، روڵەی کوردان بۆ ئەوەی خۆیان لە جەنگ دوژمن بپارێزن جاری دەبێ نیوی ئەسڵی خۆیان فری دەن وەنیوی دیکە لە خویان بنێن، بەوەی دڵتان تەنگ مەکەن وە ئەوەی بزانن هەتاوە کونی تەشکیلاتەکەی خۆمان بە تەواوی وە روونەخەین نیوی ئێوە "ئازەر" و "برا" یە، وەهەر بەو نیوانە یەکتر بانگ بکەن تاوەکونی خوی پیبگرن دەی، کاك "ئازەر"، کاك "برا"! بلەن بوانم سەروکی ستادی سەقز وە مینە ئاغا کەی کانی کیسەلەتان چلون کوشت ئەوکارەی ئێوە لە تەواوی کوردستاندا دەنگی داوەتەوە، زورناچیەکانی تاران پاش کوژرانی خوجەندی دەیان کوت ئەوە کاری کۆمەڵەیە، بەلاّم لە پاش کوژرانی مینە ئاغا وە ون بونی ئێوە ئیتر دەستیان لە کول کۆمەڵە کردوتەوە، وە ئێستا نیو هەر نیوی پیروت و شیرکویە لەو رۆژانەی دووایی دالە حەول و حەوشی سەقز چەند کاروان روت کراوە و چەند ژاندارمیکیشان کوشتووە وە تەواوی ئەوانەشیان بەئەستوی ئێوەدا بریوە برام، ئێستا ئێوە بونەتە قارەمانی رۆژ وە لە هەمو لایەکەوە لیتان دەگەرێن...

شیرکوو پیروت کە ئەوەیان بیست پەشوکان و تەماشایەکی یەکتریان کردو لە دلەوە دەیان کوت: "ئەوەچ زو پیی زانی..." شیرکو خەریك بو وەلاّمی پرسیارەکەی "کاك بینایی" بداتەوە کە میرزا قویتاس هەڵ دایەوە گوتی:

قوربان، "کاك برا" بەهیچ وەجهیك حازر نەدەبو لە گەلمان کەوێ وەهەر نەیەویست بچێ راهزەنی و غارەت و چەپاول بکا، ئەمما بەندە حالیم کرد کە، ئەو کارانە فایدەی نیە... "کاك بینایی" هەلستا سەر پی وەبەدەستی

پەردەکەی کە بەسەر تاقەوە هەڵاوەسرابو وەلابردو چلون ماموستا دەرس بە قوتابیان دەڵێ هەر بەو چەشنە رووی کردە شیر کوو پیروت وە زۆر بە ژماردەو لەسەرە خوو ئەسپایی گوتی:

ئەو نەخشەیەی کە دەبینن بیرەدا هەڵاوەسراوە نەخشەی کوردستانە، یانی نیشتمانی کوردەوارییە کە، ئێستا بە چووار لەت بەش کراوە وە لە ژێر حوکماتی بێگانە دایە، چەرخی بیستەم کە چەرخی رزگاری و سەربەخۆیی وەدەست هێنانی گەلانی جیهانە ئەرکێکی زۆر گەورەی لە بەرامبەر ئەسڵی ئەو رۆکەی نەتەوەی کورد داناوە، ئەورۆ کە نەتەوەی کورد لە هەموو نەتەوەیەکی دنیالێ قەوماوتر و پاش کەوتوترو بەش خوراوترە، بەڵام ویرای ئەوە هەست و بیری رزگاری خووازی و سەربەستی وە دەست هێنان زۆر بە توندی لە نێو نەتەوەکەی ئێمەدا رەگ ئاژوی کردووە، هەر کوردێکی بیدوینی دڵی پڕە لە قین و غەزەب لە بەرامبەرداگیرکەراندا، خو بەکاری و ئازایەتی و نەترسی و لە یاقەت و مشوریش نیعمەتیکی خودا دادەیە کە، لە رەگی کوردانەوە سەرچاوە دەگری وە لە شیری داییکمانەوە هەلدەوەری، جا کۆمەڵەی ئێمە بویە سازبووە کە، هەست و بیری رزگاری خووازی لەگەڵ خاسیەتەکانی تایبەتی کوردان کە، باسم کردن، تێکەڵاو بکات وە بە تاقە ریگایەکدا بەرەو پیشیبەری، بۆ رزگاری کوردو کوردستان لە چەنگ داگیرکەران ئێستاکە ئێوەش هاتون تێکەڵاو بون دەبێ بەر لە هەمو شتێ: لە دڵەوە ببنە پێشمەرگەی ئەو ریگایەو دەبێ هینذێك لە مێژوو هەڵکەوتووایەتی نەتەوەو نیشتمانە کەتان شارەزاین...

شیرکوو پیروت کە بە وردی گوییان لەو قسانە راگرتبو هەر تەقەیان لە سەری دەهات، پیروت وەی دەزانی کە، لەخەوندا ئەو قسانەی پی دەڵێن ئەو قەت ئەوانەی نەبیستبو وە لە زۆر وشەی"کاك بینایی" نەدەگەییشت چونکە کاك بینایی بە کوردییەکی پەتی و خاوێن دەدواو"کاك بینایی" چەند باسێکی دیکەشی بۆ کرد نو لە پاشان گوتی:

با ئەورۆ بەسبێ، کاکە سووار! "ئازەر" و"برا" بە تو دەسپیرم وە بە رۆژ با بخولێنەوەو مانویان بحەسیننەوە، شەوانەش بیان هینەئیرە بۆ سکالا با دە پازدە رۆژێك هەروا رای بویرن وە هینذیك شارەزابن لە سیاسەت و چلونایەتی نیشتمانە کەیان وە لە پاشان تاقییان دەکەینەوە...

ئیتر نیزیك بە پارشیو هەر چووریان وە دەرکەوتن وە بۆ ماڵی گەرانەوە لە رێگا پیروت روی لە شێرکۆ کردو گوتی:

ئەرێ کاك شیرکو لەو قسانە شتیکت لێ حاڵی بو؟ میرزا قویتاس نەی هیشت شیرکو وەڵام بداتەوە گوتی:

کاك"برا" ئەوە نەشود، قەرارمان چ بو، مەگەر نازانێ ئیسمی شەریفی ئەو ئاقایە"ئازەر"ە.

پیروت هینذیك سوور هەڵگراو دەنگی نەکرد.

شیرکوو پیروت چەند رۆژێك هەر بەو چورە رایان بووارد، بە رۆژ لە نێو شاریدا دەخولانەوەو دەچونە بازار و قاوەخانە، شەوانەش لەگەڵ کاکە سووار دەچونە"کۆمەڵە"وە "کاك بینایی" لە مەر کورد و کوردستان قسەی بۆ دەکردن.

رۆژێکی لە قاوە خانەی سەر چومی سوور دانیشتبوون وە تەماشایان کرد هەمو باسی ئەوە دەکەن کە، چەند سەرۆك عەشیرەتێکی نیشتمان فروش لەشکری خۆیان لەدەوری سابلاغ وەخر کردووە وەدەیانەوێ بەشەو پەلامار بهێننە سەرشاروتالانی بکەن، وە قازیش پیاوی وە نیو شاری خستووە کە، هەر کەسێکی پیاوە ئێواری تفەنگ و دەمانچەو خەنجەر هەڵگری وە لەهەر چووار لای شاری کیشك بکێشێ وەبە هیچ چەشنێك نەهێڵن سووارەی عەشیرەتە نیشتمان فرۆشەکان بینە نیو شارییەوە شیرکوو پیروت دەست بەجێ بۆ ماڵی کاکە سووار گەرانەوە وە ئەوەی بیستبویان بۆ خانە خوییان گیراوە پیروت گوتی:

ئەرێ کاکە سووار، ئەو قازییە کییە کە، وا خەڵك بە حورمەتەوە باسی دەکەن و بەدوایدا دەرون؟

"کاك برا" قازی سابلاغییەوەخەڵکی سابلاغ لەو پەشیوینی و گیروگرفتەی ئێستادا ئەویان یەسەروکی خۆیان هەڵبژاردووە وە ئەویش شەووڕۆژ بۆ دابین کردنی هێمنییەتی و ژیانی خۆشی گەلەکەی تێدەکوشی وە شەوانە نانوی بە تەواوی شاریدا دەکەرێ وەکیشکی خەڵکی شاری دەکیشی...

لە پاشان کاکە سووار گوتی:

چابو وەبیرم کەوتەوە، "کاك بینایی" رای ئەسپاردووە ئەورو هینذێك زووتر بچینە لای وە گوتویەتی تفەنگەکانیش هەڵگرین.

ئیوارێ کە تاریك داهات هەرسێکیان تفەنگ و فیشەکەکانیان هەڵگرت و چونە کومەلەوە، کە گەییشتنە ژوورەکە تەماشایان کرد"کاك بینایی" رانك و چۆغەیێکی بۆری لەبەر کردووە، دەمانچەیەکی ناگانی بەروتی لەبەر پشتیندەکەی چەقاندووە وەچاوەرێی ئەوانە هەر کە چاوی بەوان کەوت گوتی: کاکە سووار، ئەتو بچولای پیاوەکانی گەرەکی خۆتان وە ئەمن"ئازەر" و "برا" لەگەڵ خۆم دەبەم.

کاك بینایی هەردووك لاوی هەڵگرت و وەنیو شاری کەوت وە هەر لە کۆلانیك رابو کۆلانێك، لە گەرەکێك را بۆ گەرەکێك دەچو، هێندە گورج و گۆڵ و پتەوو سوك رەوت بو، کە، شیر کوو پیروت بەو لاوینیەی خۆیانەوە نەیدە گەییشتنەوە، توشی هەناسە برکی ببون"کاك بینایی" کە دیتی هاوریکانی ماندو بون لەسەر سەکۆیەك راوەستاو گوتی:

دەی، هینذیك با ماندومان بحەسینینەوە، لە پاشان دەچینە قەراغ شاری لەو دەمەدا کە هەڵتروشکابون پیروت هەلی دایەو گوتی:

وەڵلا کاك بینایی ئەگەر تەواو خەڵکی شاری وەکو تۆ بەقسەی قازی وا بەنیوشاریدا بخولێنەوەو وریابن و کیشك بکیشن، نەك هەر لە شکری عەشیرەتەکان، لەشکری هیچ دەوڵەتێك ناتووانێ پەلامار بۆسەر سابلاغ بهێنێ ئەتۆ کەوای داخولا قازی چلون بێ؟!

"کاك بینایی" بەبیستنی ئەو قسانە زەردەخەنەیەکی هاتێ، و هیچ دەنگی نەکرد لە پاشان پیروت سەر لە نوێ گوتی:

ئەری ماڵی قازی لە چ حاستە و وەچلون پیاوێکە وە داخولا لەگەڵ کۆمەڵەی ئێمە نێوانی چونە؟

کاك بینایی وەڵامی داوە:

ئەگەر لەگەڵ کۆمەڵە نێوانی خراپ بایە ئێمە بەقسەی وی کیشکی شاریمان نەدەکیشا، وەئەوەندە خۆمان ئەزیەت و چەرمەسەری نەدەدا وە دەچویین لە نیو لیفەو دوشەکی نەرمدا لی دەنوستین:

پیروت دیسان پرسی:

ئەری"کاك بینایی" قازی ئەندامی کۆمەڵەیە، یانا؟

"کاك بینایی" وا دیار بو لەوهەمو پرسیارەی پیروت خۆشی نایە وە لەبەر ئەوە گوتی:

رۆڵە، هیچ کاتێك حەول مەدە هەموشتێك دەست بەجێ بزانێ، دەنا ئەگەر وابێ توکی سەرت هەمووی سپی دەبێوە زووپیردەبێ...

لە پاشان"کاک بینایی" دەسرەیەکی پیچراوی لە باغەلی چوغەکەی دەرهێناو گوتی:

"ئازەر"، "برا"! ڕەنگە برسی بوین، هێندێکم نان و پەنیر و پیوازی تەر پیپە وەرن با بیخوین وە لە پاشان هەلدەستین دەچینە قەراغ شاری وە سەریك لە کێشك چیەکانی ئەوی دەدەین.

چەند شەوێك هەتا بەری بەیانی "کاک بینایی" لەگەڵ ئەو دولاوە بە نیوشارو قەراغی ویدا خولانەوە وەهەر شەوەی"کاک بینایی" رانکوچۆغەیەکی دیکەی لەبەر دەکرد وە بە جۆرێك دیمەنی خۆی دەگۆری کە، تەنانەت ئەگەر شیرکوو پیروت لە نەکاو توشی هاتبایەن نەیان دەناسیەوە.

خەڵکی قارەمانی سابلاغ بە وردو درشتەوە وە بە وریایی یەکی تایبەتی یەوە کیشکی شاری خۆیان دەکێشا وە نەهایەت سەرۆك عەشیرەتە نیشتمان فروشەکان کە، ئەوەیان هەست کرد مەجبور بون بەرەو دووا بکیشینەوە، وە لە خویان رانەدی پەلامار بۆ سەر سابلاغ بەرن.

شیرکوو پیروت بە چەشنێك گیرودەی سکالاو هەڵستان و دانیشتنو ری و شوینی"کاک بینایی" ببون کە هەر دەت گوت لە منداڵییەوە لەگەڵی ناسیاون.

"کاک بینایی" نەك هەر وەك مامۆستا، بەڵکو وەك هاواڵێکی هەرە نیزیك و سادە لەگەڵ وان دەدوا، وە لە کاتی هەڵستان و رۆنیشتون و چون وهاتن قەت خۆی لە ژووروی ئەوانەوە دانەدەنا، هەر چەند بە تەمەن15-10ساڵ لەوان گەورەتر بو، بەڵام خۆی وەك دەستە برایەکی هاوراز بەریوە دەبرد وە هەموو چەشنە جەفەنگ و گاڵتەیەکی لەگەڵ دەکردن و گەرەلاوژەی لەگەڵ دەکوتن شیرکوو پیروتیش ئیتر لە حاست وی وەك جاران شەرمیون نەبون وە ڕەپورولە گەڵی دەدوان و جەفەنگیان لەگەڵ لێ دەدا...

رۆژێك شیرکوو پیروت لە قاوەخانە دانیشتبوون کە، بیستیان دەڵین ئەورۆ لە"چوارچرا" خەڵك وەکوو دەبین وە قازی قسەیان بۆ دەکا، ئەوانیش بە ئاواتی دیتنی قازی وەگوی راگرتن لەوتارەکانی وی بە پەلەخویان گەیاندە"چوارچرا" وەلە نیزیك ئەو جێگایەی کە، کورسی یەکی بەرزی لێ‌دانرابو راوەستان، دەستە- دەستە خەڵك لە مەیدان وەکو دەبون لە ماوەی سەعاتێکدا نیزیکەی بیست هەزار کەس لەوێ وە کوبون وە بەجۆرێك دەوری مەیدانەکەیان گرتبو کە، دەرزیت هاویشتبایە وەعەرزی نەدەکەوت لە ئەکاو لەلای رۆژئاوای مەیدانەکەوە خەڵکەکە ڕێگایەکی باری کیان ئاواڵە کردەوە وە مەلایەکی بو لای کورسیەکە هات وە تەواوی خەڵکە کە بەدیتنی وی لە چەپلەیاندا.

شیرکوو پیروت کە، بەوردی تەماشایەکی ئەو مەلایەیان کرد دیتیان ئەوە"کاک بینایی" یە، وە دەست بەجێ لە کوردێکی کەنیزیك بەوان راوەستابو پرسییان:

ئەی گووانی قازی؟ خودەیان گوت ئەوروئەوقسان دەکات؟

کابرا کە، تەماشایەکی ئەو دولاوەی کرد زانی کە، لە دی راهاتوون و نابەلەدن وەگوتی:

قازی ئەوەتا قسان دەکا

شیرکۆو پیروت کە، ئەوەیان بیست تاویك مردن و ژیانەوە وە تەواوی لەشیان عارەقی لێ دەرژا وەباوەریان بە چاوی خۆیان نەدەکرد، هەر چەند کە، "کاک بینایی" نەی دەزانی شیرکوو پیروت لەوین، بەڵام ئەوان لە شەرمان خۆیان لەوێ پێ رانەگیرا وە بەدزە- دزەوە لە مەیدانە کەی وە دورکەوتن هەر دەت گوت زمانیان بەستراوە وە تەنانەت لەگەڵ یەکتریش ماوەیەك قسەیان نەدەکرد "کاک بینایی" رۆژێك پێشتر بەوانی کوتبوو کە، ئێواری هێندێك زووبچینە لای شیرکوو پیروت لە روویان هەل نەدەهات کە بچن بۆلای وە لە شەرمان وەختە بۆ دیق بکەن لای ئێواری کاک سووار هاتەوە ماڵی وە بەدیتنی ماتبون و خەفەت باربونی میوانەکانی لی پرسین:

چیتان لێ قەوماوە، بۆچ وا خەفەت باروکزن؟

شیرکوو پیروت تەواوی هەواڵەکەی ئەو رۆژەیان بۆ گیراوە وە رایان گەیاند کە لە روویان هەڵنایە بچنەلای"کاک بینایی" کاکە سووار دلداری دانەوەوگوتی:

نا، نا هەستن بچن وە هیچ وەسەر خۆتانی مەهێنن "کاک بینایی" هەتا خودا حەز کا سادەو پەتییە وە ئەگەر بیتو نەچن لیتان زویر دەبێ.

شیرکوو پیروت بە نابەدڵی و لەرزە- لەرزەوە ری کەوتن وە کاتێك گەییشتنە ژوورەکە دیتیان"کاک بینایی" هەر بەجل و بەرگەکەی رۆژێ دانیشتووەو کتێبیکی لە بەردەمی خوی داناوەودەیخوێنیتەوە، ئەوان تاوێك عەبەسان و متەقیان لێوە نەهات، لە پاشان بەرەوپێش چون وە ویستیان دەستی"کاک بینایی" ماچ کەن. "کاک بینایی" کە ئەوانی دی لە بەریان هەڵستاو نەی هێشت دەستی ماچ بکەن وە دەست بەجێ تێ گەییشت کە، ئەو لاوانە ئەویان ناسیوەوە لەبەرئەوە بۆ ئەوەی شەرمیونی یان وەلابەری بە پێکەنینەوە گوتی:

دەی قازی یە لینگەرر"، کەتان چاوپێکەوت؟

هەر چەند"کاک بینایی" بەوانی کوتبو دانیشن ئەوان دانەنیشتبون وە دەستەو نەزەر راوەستابون و سەریان داخستبوو لە پاشان پیروت خۆی پێرانەگیراو گوتی:

قوربان، جەنابی قازی! لیمان ببورە تا ئیستا نەمان ناسیوی..

"کاک بینایی" تاوێ نیو چاوانی گرژکردو گوتی:

ئەوە لە کەنگێوە ئەمن بۆ ئێوە بومەتە جەنابی قازی! "کابرا" مەگەر تۆ نیوی منت لە بیر چۆتەوە، ئەمن بۆ تۆ"جەنابی قازی" نیم، "کاک بینایی"م کاکە قەت ئەوەتان لە بیرنەچێ دەناتوشی کێشەدەبێ وە بەچوکترین بەسەر چونێ: هەڵ بە دوژمن دەدەی لە کارەنهێنیەکانمان شارەزابێت، بۆ ئێمە ئەو رۆ وورایی، ئەویش وریایی یەکی پەتی گەییشتویی لە هەموشتێك پێویست ترە.

"کاک بینایی" تاوێك بێ دەنگ بو وەلە پاشان بە دەم پێکەنینەوە گوتی:

پێتان وابو قازی شاخی هەیە وە لە پیاوان ناچێ؟ نا، نا براکانم ئەمنیش هەروەك ئێوەم وە هیچ شتێکم لە ئێوە زیاتر نیە، وە ئەگەر لەمەوبەولاوەش، هەروەك دەستە براو هاوزارو هاواڵی تەماشام نەکەن دڵم لیتان دێشێ...

جەفەنگ و قسە خۆشی و سادەیی"کاک بینایی" شەرمیونی ئەو لاوانەی وە لابردوە، ئەوان دانیشتن وە"کاک بینایی" ش لە مەر مێژووی کوردستان بە درێژی قسەی بۆ کردن...

پاش چەند رۆژێك"کاک بینایی" شیرکوو پیروتی بانگ کردوو گوتی:

سبەینی ماشینیکی لوری بۆ لای(ورمێ) دەچێ ئێوەش سوواری ئەو ماشینە بن وە ئەو بوخچە کتیبە بەرنە مەحالی(تەرگەوەر)، وە بیدەن بە(کاک جەنگوی) هەرکی لە دێ(سیرمە)، با بلاوی بکاتەوە بەلام تفەنگ لەگەڵ خۆتان هەڵ مەگرن...

شیرکوو پیروت لە مێژ بۆ چاوەرێی ئەوەبون کە، لەلایەن کۆمەڵەوە، وە بە تایبەتی لە لایەن"کاک بینایی"یەوە ئەسپاردەیەکی ئەوتویان پێ بدرێ کە،

خۆیان بنوێنن، پیروت هەر چاوەڕێی ئەوەبوکە، ڕۆژێک پێی بلەن بچوفلان سەرۆک عەشیرەتی نیشتمان فرۆش بکوژە، وەیاپەتی کەو بیهێنە بۆ شاریٚ، وەیا بچۆ فلان سەرۆکی ژاندارم رووتکەوە، بەلآم هیچ چاوەڕێی ئەوە نەبو کە، کولێکی کاغەز لە پشتی قایم کەن و پیٚی بلەن بچۆ بلآوی کەوە، لەبەر ئەوە زۆربە نابەدڵییەوە لەلای"کاک بینایی" وە دەرکەوت، وە لە ڕێگا روی لەشیرکو کردو گوتی:

حەی بەریشی خیوی ئەوە تەاومان کرد! جاتو خوا پیاو بەکاغەزو پەڕو بە سەر دوژمندا سەردەکەوی؟ حەیف نیە تفەنگە رەشەی لە دوژمن ئاور نەدەی!...

شیرکو وەلآمی داوەو گوتی:

ئەوان لەمە عاقلترن وە هەرچی بە مەسلەحەتی بزانن دەیی وابکەین، کاغەزبلآوکردنەوەش کاریکە، لە هەموو جێگایەك تفەنگ بەکار نایە...

شیرکوو پیروت هەر چلونێکی پییان کوتبون بە دییان گەیاند، وە بۆ سابلاغ گەڕانەوە.

ئیتر ئەو جوتە لاوە ببونە خۆشەویستی کۆمەڵە وەهەر کارێك پییان دەسپاردن بەسەر کەوتنەوە بەجییان دەگەیاند"کاك بینایی" چەند جار ئەو جوتە لاوەی لەگەڵ خۆی بۆنیوٚ عەشیرەتەکان وە سەفەری دور- دور بردبووە، لە عەینی وەختدا هەمو ڕۆژیٚ سەعاتێك دەرسی پێدەگوتن، وە پاش سالێك ئیتر فێری نووسین و خوێندنەوە ببون.

بەکورتی، قولی ئەو قولی نەمابو بە قەولی کاك مامەند"پیروتە کولکنە"کەی بەتەواوی وەلاتدا، نیو بانگی بەکاری و تێکوشەری و ئازایەتی بلآوببوەوە، پیروت بەتەنیا بە شتیك قەلسبو، ئەویش ئەوەبوکە. دوست و برادەرەکانی هەر بە"برا" نیویان دەبرد، وەنیوە خۆشە کوردیە کەی خۆی نەدەکرا بویژری، ڕۆژیك بیروت لەگەڵ چەند دوست و هاوەڵێکی خۆی کە هەموو ئەندامانی کۆمەڵە بون دانیشتبوو نانی دەخوارد وە هەموو هەر"برا""برا" نیویان دەبرد لە پراگوربەیەك بە میاو میاو کردن وەژورکەوت وە پیروت کە، گوریەکەی دی لە قاقای پێکەنینی داو هەموو پییان سەیربووە لییان پرسی بوچی پیدەکەنی پیروت گوتی:

لە لای ئێمە مەلایەك هەبو کە نیویان نابو"مەلا خیت فس" وە ئەوەش لەبەر ئەوەبو کە، ئەو مەلایەبەو دووقسەیە، یانیبە"خت- فس" زۆر توورە دەبو فەقیکان ڕۆژی جومعە دەچوون راتبەیان دەکرد، ڕۆن و برنج و مریشك یان وەکو دەکرد وە بەئیشتیاوە پلاوو مریشکیان لیدەنا وەکاتێك ویرای مەلاوە کۆدەبوونەوە سەر مەجوعمە پلاوو گوشتەکەی بخون گوربە بوریان لیوە ژوور دەکەوت فەقیکان لە ترسی مەلا نەیان دەویرا بلەن"ختە-فسە" وە مەجبور بون بە نیوی دیکە گوربەکە دەنگ بدەن یەکێك دەی کوت"وەحە!" ئەوی تر"هەچە!"، سییەمی"کس- کس!" بەلآم گوربەبور گویی لەو قسانە رانەدەگرت وە کێهەتکە گوشتی چەوری دیبایە دەی رفاند، چەند جار ئەو کارە دووپاتە بوەوە، وەئیتر یەکێك لە فەقیکان حەجمینی لی برا وە ڕۆژێك کە، نانیان دەخووارد وەگوربە بور وە ژورکەوت گوتی: "وەللاهی مەلا بشم کوژی ختیش و فسیش" جا ئێستا ئێوەش دەم کوژن و دەم برن کەیفی خۆتانە نیوی من پیروتە، "برا، برا"م لی دامەنینەوە...

پیروت لەو ماوەیەدا کە، لە کانی سەوزەوە دەرکەوتبو هیچ کاتێك باب و، دایك و خوشك و براکانی لە بیر نەچوبو وەبە هۆی ریبواری ناسیاو هەر بە چەند مانگ جارێك دراوو پیلآوو قەندو چای بۆ مالی دەنارد، وە کاك مامەند بەو هۆیەوە لە چەنگ زولم و زۆری لە تام دەرچوی قەرەنی ئاغا ژیانێکی نەمرو و نەژی بەریوە دەبرد، وە هەر دوعای بو عومر درێژی کورەکەی دەکرد...

پیروت هەروەها چەند جارێك هەرەشەی بۆ قەرەنی ئاغاش ناردبو وە کوتبوی: "ئەگەر ڕۆژێکم بمینی تولەی خۆم و بابمی لیٚ دەکەمەوە..." پیروت چەند جارێك ویستبوی بۆ ئەنجامی کاریك لە لایەن کۆمەڵەوە بۆ مەڵبەندی سەقزی بنێرن، بەلآم سەروکەکانی کۆمەڵە کە، دەیان زانی لەویٚ مەترسی بۆ پیروت هەیە وە لە هەموو لایەکەوە لیٚی دەگەڕین ئەو داخووازەی وییان قوبول نەکردبو.

قەرەنی ئاغاش لە هەرەشەو نیو بە دەرەوی پیروت زۆر وەترس کەوتبو، وە لەبەر ئەوە بەر مەلا نەی دەویرا لەگەڵ کاك مەمەند دوژمنایەتی بکات، بەلآم لە ژیرەوە وە لە ڕێگای جیاواز- جیاوازەوە بۆ مال ویران کردن و چارەرەش کردنی خیزانی کاك مامەند لە هیچ چەشنە خراپەو ناپیاوەتییەك نەدەپیرنگاوە.

لە هاوینی ساڵی1945دا لەلایەن کۆمەڵەوە پیروت ویرای دو کەس لە سەروکەکانی کۆمەڵە بۆ مەڵبەندی لای (ماکو) و(خو) و(سەلماس) ناردرابون بۆ کاروباری سیاسی وە لەو سەفەرەدا چەند مانگێکیان پێچو، وە لەو ماوەیەدا ئەو نەی توانی یارمەتییەك بۆ باوکی بنێریٚ، نەهاتنی یارمەتی لەلایەن پیروتەوە وە خراپکاری بە ئانقەستی قەرەنی ئاغا لەگەڵ حاسلەکەی کە کاك مامەند بەرەنجی شانی هینابویە بەرهەم چلونایەتی ئەو مالەی لە زستانە سەختەکەی ساڵی1945دا توشی چەوتی و نالەباری و برسیەتییەکی زۆرپیس کردبو....

## سەرچاوە

ڕۆمانی "پێشمەرگە، نوسینی دکتۆر رەحیمی قازی، ل108-129

